ابراهیمی محمدی، محمد سعید
قارەمانانی نەتەوەی کورد / هونراوه و
نوسراوەی محمد سعید ابراهیمی محمدی (ناویر). ـ
مهاباد: مرکز نشر فرهنگی هیوا، ۱۳۸۱ ،
۳٦۱ ص. : مصور، جدول
ISBN 964-91408-9-1
فهرستنویسی براساس اطلاعات فیپا.
۱. شعر کردی ـ قرن ۱۴ . ۲. کردان ـ تاریخ ـ شعر.
۳. کردان ـ سرگذشتنامه. الف. عنوان.
۲۵ الف ۷۴۲ ص / PIR۳۲۵٦ ۲۱ / ۹ فا ۸
کتابخانه ملی ایران ۱٦۵۸۲ -۸۱ م

ناسنامەی کتێب
نێوی کتێب: **قارەمانانی نەتەوەی کورد**
هۆنراوه و نوسراوەی: محمد سعید ابراهیمی محمدی (ئاوێر)
ناشر: حاجی قادر قادری (هیوا)
ویراستار: کتیب حسن نیاکان بەکامپیوتر و پررنگ کردنی مەتن و دەقی کتیب
چاپ: هەوەڵ ۱۳۸۲
تیراژ: ۲۰۰۰
قیمت: ۱۵۰۰ تومان
لیتوگرافی و چاپ: تندیس نقرەای
صحافی: کهنموئی زاده
شابەک: ۱-۹-۹۱۴۸-۹٦۴

# نێوەرۆک

# پێشەکی

| | |
|---|---|
| بە بسم الله و حەمدی تۆ ئیلاهی | دەنوسم من مەبەستم تۆ پەناهی |
| لە تۆ داوا دەکەم پێنوسی دەستم | بە راس مێژو بنوسێ بیر و هەستم |

لە سەرەتای وتاردا دەمەوێ سپاس کەم لە ئەدەب دۆستانی ولاتەکەمان کە ژین و تەمەنی خۆیان لە روی رۆشن‌بیری لە پێناوی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی قەومەکەیان بەخت کردوە و دەیکەن ئەوەیش بەشێکی گەورەیە و سەرمایەیێکی گرینگە بۆ روون بونەوەی چۆن ژیانی باو و باپیرمان. ئاشکرایە هەر نەتەوەیێک ئاگای لە فەرهەنگ و ئاساری نەتەوەکەی نەبێ و ئاگاداری لێ نەکاکەشتی بوونی لە نێو گێژ و خولی دەریای کۆما وگەلی دنیادا غەرق دەبێ. وێ دەچێ جار و بار غەواس و تێبین و کۆنینەناس لە نێو کۆنە کتێباندا یا ئەشکەوتدا یا لە دەرونی دەریا و یا وشکاییدا ئاسارێکی پەیداکا و وەبەر چاوی خا، دەبێ بلێم بەلگە و سەنەدی فەرهەنگی ئێمە زۆر لە پێش لە دایک بونی مەسیحدا لە دەس دایە. وێدەچێ بە هێرشی سەربازی نەتەوەیەک بشکێ بەلام تا زمان و ئەدەبیاتی بمێنێ لە بەین چوونی دژوارە لێرەدا نرخی راستەقینەی ئەوانەی کتێبی تاریخ و ئەدەبیات دەخوێننەوە وەبەر چاو دێ و ئەوانە خۆیان بزانن یا نەزانن مەرزداری لە ئاو و خاکەکەیان دەکەن. بەلام من پێم وایە خۆم لەم رێگەدا ئەو جۆرەی پێویستە و ئارەزوومە بۆم نەکراوە کارێکی گرینگ ئەنجام دەم و هەر ئەوەندەی لە دەستم هاتوە نوسیومە. لێرەدابە پێویستم زانی بیوگرافیەکی خۆم زۆر بە کورتی بەم جۆرە بنوسم.

ئەمن محمّد سەعیدی ئیبراهیمی محمدی (ئاوێر) لە سالی ١٣١١ هەتاوی لە بنەمالەیێکی

روحانی لە مەهاباد هاتومەتە دنیاوە و سەرەتای خوێندنم لای خودالێخوشبوو مەلا برایمی بابم بوو دوای بەینێ بە دێهات و شارەکانی کوردستاندا سورامەوە و بۆ وەدەست هێنانی عیلم و زانست چومە دێی قەڵەندەری نیزیک سەقز لای مامۆستای زۆر زانا و هێژا مەلا عبدالقادری سعیدی و حەمامیان و ئەمبار و چەند جێگای دیکە و لە شاری سنە لە لای مامۆستا پایە بەرزەکانی ئاسمانی مەعارفی ئیسلامی، مامۆستا ئوسولی و مفتی و موجتەهیدی خوێندومە لە لایان دەبیرخانەی شورای عالی فەرهەنگ گەواهی ئیفتا و تەدریسی علومی ئیسلامیان دامێ و لە ساڵی ١٣٣٠ ئیجازەم وەرگرت و بەینێکیش چومە سابلاغێ و لە حوجرەی مزگەوتی بازار لە لای ئەستێرەی گەشی مەعارف و علومی ئیسلامی مامۆستا مەلا حسینی مەجدی بەینێکی باش بە خوێندنی عیلم و تەفسیر سەرگەرم بوم و ئیجازەم لە خزمەتی وەرگرت و لە دێی گیسیانی مەرگەوەر لای خودالێخوشبوو حاجی ئەسعەد بە پێش‌نوێژ و دەرس و ئیجازەی فەقێ مەشغول بووم و دوای چوار ساڵان لە تاران لە وەزارەتی فەرهەنگ و ئیرشادەوە گەواهی‌نامەی مدرسی علومی مەنقولم وەرگرت و هەر لەو ساڵەدا بوومە مامۆستای فێرگەو قوتابخانەی ناوەندی مهاباد و مەلای مزگەوتی ژمارەیەکی حاجی صالحی شاتری و دوای چەند ساڵێک چوومە تاران و لە ساڵی ١٣٤٧ هەتاوی لە دانشکدەی ئیلاهیات و مەعارفی ئیسلامی تاران لیسانس لە رشتەی زمان وئەدەبیاتی عەرەبم وەدەس هێنا و لە مانگی گوڵانی ١٣٧١ هەر لەو دانیشکەدەی الهیات و مەعاریفە ئیسلامیە فەوقی لیسانسم وەرگرت و زیاتر لە چل ساڵ لە حوجرە و مەدرەسە و زانکۆی هونەری و بەینێکیش لە زانستگای ئازادی مهاباد و پەیامی نووری بوکان دەرسم کوتوەتەوە، و لە ئاخردا لە خانەقای شەمزینانی مەهاباد پێش‌نوێژ بووم و خەریکی موتالای کتێب.

**ئاسەوار و شوێنەواری نوسراو چاپ کراو و چاپ نەکراوم ئەمانەن:**

١ـ کتێبی آشنایی با تحوّلات مذاهب اسلام بە فارسی تاریخی چاپ ١٣٦٢ چاپ شمشاد لە تاران.

٢ـ کتێبی گەشتێ لە عیلمی بەلاغە مەعانی ـ بەیان ـ بەدیع ـ عەروز و قافیە لە ساڵی ١٣٦٤ لە چاپخانەی مەهارەتی تاران چاپ کراوە.

٣ـ کتێبی مەجموعە کامل تست کنکور اختصاصی گروه ٢ علوم ئینسانی ئەم کتێبە بە قەلەمی سێ نەفەر نوسراوە عنایەت الله شکیباپور و محمّد سعید ابراهیمی و غ.ح. مشایخی و لە ساڵی ٥١ مەتبوعاتی شەرقی تاران چاپی کرد.

٤ـ اصول الفقه الاسلامی.

٥ـ وەرگێرانی کتێبی تعریفاتی جورجانی لە عەرەبیەوە بە فارسی کـە لە دانشکـدەی ئـیلاهیاتی تاران بایەگانییە.

٦ـ شەرح و وەرگێرانی کتێبی وەزع و ئیستعارە لە عەرەبیەوە بۆ فارسی، کتێب فروشی رەهرەو لە سالی ١٣٧٨ چاپی کرد لە مەهاباد.

٧ـ شەرح و وەرگێرانی وەزعی قازی عضد لە عـەربیەوە بـە فـارسی، چـاپ کـراوە، لە لایـان کتێبفرۆشی رەهرەوە..

٨ـ رسالەیێک لە بارەی علیمی نەحوداکە لە دانشگای ئازاد بە دەرس کوتومەتەوە.

٩ـ پەرتوکێک لە عیلمی سەرف بۆ تەدریس لە دانشگا بە دەرس کوتومەتەوە.

١٠ـ تەجزیە و تەرکیب و وەرگێڕانی بەکوردی ١٠ سورە لە قورئانی کەریم بە شێوەی تازە بۆ دانشگای ئازادی مەهاباد و چاپ کرا.

١١ـ کتێبی دیوانی شێعر بە نێوی «قارەمانانی نەتەوەی کورد» کە لە دەس چاپ دایە.

١٢ـ چەند مەقالە و وتار کە لە کۆنگرەی ئیلام، تـاران، سنە، سـەقز، ورمـێ، بـۆکـان، مـەریوان خوێندومنەوە کە برێک لە گۆڤاری فەرهەنگی سروە شمارە ١٠٦ و ١٠٥ و ٥٢ و گـۆڤاری ئاوێنە شمارە ٢٠ و ١٩ و هەفتەنامەی ئابیدەر ٧٧/١/٢٩ و ٧٦/٣/٧ چاپ و مقالە و وتاری لەکتێبی مەجموعە مەقالات و ئەشعاری کۆنگرە بزرگداشتی مولوی کورد لە لایان

گۆڤاری صلاح‌الدین ئەیوبی لە سالی ١٣٥٧ و وتـارێ لەکـتێبی کـوردستان و تـەوسعەی فەرهەنگ لە پایزی سالی ٧٣ دانشگای کوردستان لە چاپ دراون.

# ئاوات

بە وەی شادم لە زستانا نەبێ کۆتێک لە بەر خۆکەم
نەبێ نانێکی وشکی بۆم نە ئاوێ لێوی پێتەڕکەم
بەو شەرتەی کە بڕیارم لەگەڵ پیاوێکی دانابێ
لەگەڵ پیاوی نەبەز بێتو لەگەڵ ئینسانی زانا بێ
مرۆڤێک بێ هەدەفدار و لەگژ مڵهوڕ لەگش لابێ
لەگژ زوڵم و ئەسیری دا وەکوو کێوێکی پوڵا بێ
لە ماڵ و زیندەگی بێبەش لە نێو دوڵ و زەوی و زارا
غەزای باشی گەڵای دار و لە زستانا لە نێو غارا
بە دوی ئازادی ئینسانا لەگژ زوڵم و شەروری بێ
خەباتی نێو تەل و شاخی لە بۆکاری زەروری بێ
هەبێ روحی لە سەر دەستی لە هەر جێیێ لە هەرئان
لە بۆ ئەو نیشتمانەی بێ کە جێگەی ژینە بۆمان
خەباتی نێو تەل و شاخی لە بەر وەی بێ کە زیندان
بڕوخێنێ و بگەرمێنێ لە بۆ ماف و لە بۆ مان
لە بەر وەی بێ نەجاتیداگەلی ئێلی زەبونی
لە دەس ئاوارەیی زۆر و نەزانین و نەبوونی
لە بەر وەی بێقفل نەدرێ زمانی عاقڵ و ژیر
بە ئازادی بژی بیلێ، بنوسێ گش بە تەدبیر
لەگەڵ ئەودا لە نێو غارا بە حەق شانازییە بۆ خۆم
لەوی سێلاوکە دەورمدا بە راس ئاوی حەیاتە بۆم
نە کاخی مەڕمەڕ و چینی نە باغێکی ئیرەم بۆ من
نیە ئەو نەفعەیان (ئاوێر) نەکەی رێگەی بە حەق تۆ ون

# ١ـ نژادی کورد

لە کاتێکیدا ویستم شێعرەکانم بە چاپ بگەیێنم بروسکەیێک لە دڵی دام کە سەرەتا و بەرایێکی لە بارەی نەتەوەو زمانی خۆم کولّ و کۆتا بۆ بنووسم دیتم لە رووی مێژو و کتێبی هەرە گرینگی دنیاوە نەتەوەی من: **پێش دادیان، کەیانیان، ئەشکانیان، ساسانیان، سامانیان، شەددادیانی گەنجە** و چەند زنجیرە لە پادشایانی نێوداری دیکەن.

پەری مێژووم وەرەق لێدا لە نژادی خۆم **کەیومەرس، هوشەنگ، تەهمورس، جەمشید، فەرەیدوون، کاوە، نەوزەر، زاب، کەیقوباد، کەیکاوس، روستەم، سیاوش، کەیخوسرەو، گشتاسب، حەزرەتی ئیبراهیم، زەردەشت، دیاکۆ، هەوخشەتەرە، ئەردەشیری بابەکان و صلاح‌الدین ئەیوبی، کەریم‌خانی زەند، مەلا مستەفای بارزانی، ئەبوموسلمی خوراسانی، هەڵۆخانی ئەردەلان، سمکۆ، هەلۆی ئارارات ئێحسان نووری** و زۆری دیکەیشم دی جا لێرە بۆم روون بوەوە کە بە ئەندازەی پەری کاێیک لە دەریایێک لە دەس پێ‌نووسەکەم هاتووە.

بۆ نووسینی مێژووی کۆنی گەلی کورد لە پێش هەموو شتێکدا مێژووی ئەم دەوڵەتانەی نێوخۆ **کوسی، کوتی، نایری، سوباری، موشەکی، لولو، خالدی، مانانایی، میتانی، ماد** کە پێشینیانی قەومی کورد؛ ئەم حکومەتانەیان پێک هێناوە. دەبێ باسێکی کورت لە بارەیاندا لە بەر چاو بگرین و لە لایێکی دیکەوە پێویستە ئیشارەیێک بە دوژمنانی دەرەوەی ئێرانزەمین بکرێ ئەو دوژمنانە کە زۆر جار، شاڵاویان هێناوەتە سەر ئەم وڵاتە. جا ئەو دوژمنانە باجیان لێ سەندووین و جاروبارێش تالانیان کردوین و وڵاتیان لێ زەوت کردوین و برێ جاریش قەومی ئێران چەند بەرابەر تۆڵەی خۆیان سەندۆتەوە. ئەو دوژمنانانە کێ بوون؟ و لە کام لاوە بۆ پەلامار دان و کوشت و کوشتار و تالان هاتون؟ ئایا لە **رۆژهەڵاتەوە** هاتون یا **رۆژئاوا** یا لە **باشوورەوە** یا لە **باکوورەوە** جا بۆ ئەم مەبەستانە لە رێبازێکی زانیاری راست و دروستەوە لە نێو لاپەڕەی مێژووی ئێران و دراوسێکانمان لە هەر چوار لاوە روون دەبێتەوە کە لە **کەنداوی فارسەوە**، یا **هیندوستان و پاکستانی** ئەمرۆوە هەڵیان نەکوتاوەتە سەر ئێران و دوژمنایەتی‌مان لە گەڵ ئەو هاوسێ یانە نەبوە و لە رووی کتێبی زانایانی پایە بەرزی بی‌غەرەزەوە بە پێی بەڵگە و سەنەدی کۆن وەکوو بەردە نوسراوەکان و ئەو شتانە کە کۆنینەناس لە ژێر خاک و زەوی دەریان خستوون رون دەبێتەوە کە دوژمنانی سەرسەختی بە ناوبانگی ئێران لە دنیای کۆندا لە دوولاوە بوون **یەکێک** لە باکوورەوە توورانیان (سەکایی): **پەشەنگ** و دوو کوڕی ئەو **گرسیوز** و **ئەفراسیاب** و **ئەرجاسب** کە **ئەفراسیاب** لە گەڵ **کەیقوباد، کەیکاوس، مەنوچهر، کەیخوسرەو**

پادشایانی پێشدادی و کەیانیان لە شەڕ و ئاژاوە دابوو زۆربەی شێعرەبالاکانی شانامەی **فردەوسی** لەو بابەتەوەیە و **ئەرجاسب** نەتەوەی ئەفراسیاب شالاوی بردە سەر **گشتاسب** چونکە دینی زەردەشتی قەبووڵ کردبوو **وەزیری** برای **گشتاسب و زەردەشت** لەو شەڕەدا کوژران و ئەوە لە کەکتێبی مێژوویی‌داکە یەکێک لەوان «ایران در عهد باستان» نوسراوەی(دکتر محمّد جواد مشکور)ە مامۆستای زانستگای ئێران، لە لاپەڕەی ٩۴ دا نوسیویە **کەیخوسرەو، ئەفراسیاب و گرسیوزی** برای لە کەناری زرێچەی **چی چست** (دەریاچەی ورمێ) کوشت لەم نوسراوانە و چەند بەلگەی دیکەش روون دەبێتەوە کە ناوچەی کوشت و کوشتار و بەربەرەکانی **کوردستان و ئازەربایجان بووە** نە جێی‌تر و هەر لە باکوورەوە بووکە سەکاییەکان هەڵمەتیان هێنا بۆ خاکی ماد. لە زەمانی **هوخشترە** دەور و بەری **زرێچەی ورمێ** یان خستە ژێر دەسەلات و **سەقزی** ئەمرۆیان بە نێو **اسکیت** و لەدوایدا **ساکز** نێونا وکردیانە پاتەختی خۆیان.

**دوهەمی:** لە لای رۆژئاواوە دوژمن هێرشیان دەهێنا بۆ ولاتی کوردستان، لە رۆژئاوای ئێران ئەو دوژمنانە بریەتی بوون لە پادشایانی **ئەکەد** یا ئاکاد و **بابل و نەینەوا** وەکوو **نارم‌سین، سارگنی هەوەڵ و دوهەم و شلمنسر** هەوەڵ و سێهەم و چوارەم و پێنجەم و **تیگلات پیلسری** هەوەڵ و دوهەم و سێهەم و چوارەم و **ئاشوربانی پاڵ و ادادنیراری** و چەند کەسی دیکە، کە رۆژئاوای ئێران، **ئیلام و هەمەدان** و زنجیرە کێوەکانی **زاگرۆس و ئازربایجان** تا دەگاتە رووباری **ئەرەس** کەوتبووە بەر شالاو و هێرشیان و کوردەکانیش بۆ بەرگری بەرامبەریان راوەستان و جاری وایش بوو هەڵمەتیان دەبردە سەریان و شار و ولاتیان لێ دەگرتن بەلام ئاشوور لە شەڕدا زیاتر مەبەستی گرتنی پێ‌تەختی حکوومەتەکانی کورد بوو لە ولاتی کوردستاندا بۆ بە دەس هێنانی تالانی زۆر و لە بەین بردنی فەرمان ڕەوایان. بۆ وێنە لە ساڵی **٦۴٥** (پ. ز) **ئاشووربانی پاڵ** هەڵی‌کوتایە سەر ئێلام و **شووشی** گرت و هەرچی ماڵ و دەوڵەت بوو ناردی بۆ **نەینەوا** و دەستی کرد بە کوشتاری خەڵکی و ئێسکی پادشایانی لە قەبر دەرێنا و ئەوانیشی لەگەڵ خۆی برد و فەرمان ڕەوایانی ئیلامیش یەکێک لەوان (اونتاش گال) لە شەڕێک‌دا بابلی گرت و تالانی کرد و هەرچی قیمەتی بوو بردیان بۆ شووش و پالەوانان و قارەمانانی وەکوو **گرشاسب، نەریمان، سام، زال، روستەم، کاوە، فەریدون، قارن، گودەرز، گشواد، گیو، بیژن، رهام، طوس، گستهم، فەریبرز،** نە بەردانی کورد بوون وەک پلنگی نێو ماە و زەردان دەست بە خەنجەر و تیر و کەوان خۆیان لە پاڵ دوژمن (توران و ئاشوور) دەخستن و دەیان خستن و سەر و مێشکی یان وەک تۆوی هەرزن بلاو دەکردن و پێ‌تەخت و فەرمان‌ڕەوایان و ئاو و خاکی خۆیان دەپاراستن.

پەروایز:

## نوح و نەتەوەی

عەهدی عەتیق نووسیویە: کورانی حەزرەتی نوح سام، حام، یافیس لەگەڵ هەشتاکەس لەکەشتی دابەزین لەوان نەتەوەی دنیا پێک‌هاتوە.

کورانی سام بریتی بوون لە: ئیسلام ـ ئاشور ـ ئارام

و کورانی ئاشور شاری نەینوایان دروس کرد

کورانی حام برتی بوون لە: مسرایم ـ لوط ـ کنعان ـ کووش و غرود لە نەسلی کورش بوە بە پادشای بابل

کورانی یافیس مادای دوای بابی سەروکی تایفەی و ئەستوی خوی گرت و لە دوای ئەو (دیاکو) بووە گەورەی هوزی خوی.

کوچ و کوچباری ئاریایی بە هوی ئەوە کە نژادی یافیس لە ئاسیای مەرکەزی دا زور بوون وەک دەریا جوشی خوارد لەو رووەوە کوچەری دەستی پی‌کرا لە هەوەڵەوە زمانی ئەو خەڵکە یەکێ بوو و زیاتر لە هەزار و شەیان نەبوو. کوچ کردنی ئاریایی بو سەرزەمینی تازە بو ژیانی باشتر زیاتر لە یەک هەزار ساڵ دریژی بوو لە دەور و بەری هەزارەی سێهەمی (پ.ز.) ئاریایی لە ئاسیایی ناوەندییەوە بو سەر زەمینی پان و بەرین کە ئەمرو ئێرانی پی دەلێن سەرە و خوار بوون و روێنی ئەوان لە ولاتی خویان بوجیی‌تر تا هەزارەی دوهەمی کیشا و لەگەڵ خەڵکی ناوچە لە برێک جێگە بە هێرش و شەڕ و لەچەند ناوچەیێک بە ئارامی نیشتە جی دەبوون و ئەو هوز و قەومانە کە هاتنە ئەم سەرزەمینە بە ماد و پارس و پارت نێوبران و کوتینە ناسی روژ ئاوا بروایان وایە کە ولاتی راستەقینەی قەومی ئاریایی ئاسیای ناوەندی کێوەکانی ئورال و ئالقائی بووە و هوزی ئاریایی مادلە ریگەی قەفقازەوە هاتونە تەئێران و لە باکوری روژئاوای ئێرانی ئەمرو تایفەی ماد (میدی) جی‌گیر بوون و ئەو ناوچە نێوی (میدیانا)نرا.

دەولەتی تازە پێک هاتووی مادلەگەڵ سێ دەولەتی قەوی زەمانی خوی رووبە روو بوو دەولەتی ئاشوور و دەولەتی ئورارتوو یا ئارارات (ئەرمەنستان) و سکایی کە سەقز پی تەختیان بوو. کەمترین دەولەتێک لە دنیادا وا پێک هاتوە و توانیویە خوڕاگرێ لە بەین نەچێ بەلام دەولەتی ماننا لەو ناوچەدا لەگەڵ دەولەتی مادخزمایەتیان بوو.

---

کرد و پیوستگی نژاد نویسندە رشید یاسمی

تاریخی ارومیە بە قەڵەمی ئەحمەدی کاویان‌پور.

تاریخی ماد ـ دیاکونوف لاپەرەی ١٩٤١ ـ ٢٢٦ ـ ٣٤٠

تاریخی اجتماعی ئیران ١٩٥

تاریخی ایران باستان لاپەرەی ٧٥

# کوردستان:

ئەو هەرێمە کە کوردستانی پێدەکوترێ هەزاران ساڵ پێش هاتنە دنیای عیسا هەر ئاوەدان بوەو لە چەند ساڵی دوایدا شوێنەوارناسان و زانایان لەکێوەکانی زاگرۆس و ئارارات و ناوچەی ماد ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن کوردستان چین چین خاک و زەویان هەڵکەندوە و ئاساری فەرهەنگ و شارستانیەتی هەزاران ساڵ لە مەوپێشی رەگەزی گەلی کوردیان دیوەتەوە وەکوو شوێنەواری برێک میراتی کۆنینەناسی و لەوح و بەڵگەی تاریخی لە بارەی مادەوە کە زۆر جێی رێزن و زانایانی زۆر پایەبەرز بە تەواوی کەڵکیان لێ وەرگرتوە و ئێمە تەنیا لەرێی ئەوشتانە کە ماونەتەوە دەتوانین لە بارەی دنیای کوردستانی کۆنەوە، ئاگاداری پەیداکەین بەڵام بازسازی ئەو دنیای زۆر کۆنە بەو جۆرە کە مەبەستە بە تەواوی بێزیاد و کەم شتێکی دور لە باوەرە چون دەبینین لە زەمانی خۆماندا سەدها وشە، جۆرا و جۆر دەخوێنریتەوە، و نێوی زۆر جێگە دەگۆردرێ بو وێنە وەکوو ئەوە دەزانین زۆر لە وانەی کە دەبنە، فەرمان رەوا ئەوەی بە قازانجی خۆیان بزانن نێویان دەگۆرن وەکوو نێوی شەقام، شار، دێ، بیمارستان، زانستگە، زانکۆ، قوتابخانە، شاخ، کێو، بەندەر، ئەرتەش، ئالا و چەند شتی دیکەیش و لەم سەدەیشدا زۆر وشەی وەکوو خضر، ئیبراهیم و محمّد و محمّدامین بونەتە خلە، بلە، حەمە و مینە، بەم جۆرە گۆڕاون جاچ بگا بە چەند هەزار ساڵ لە مەوپێش چ ئاڵ و گۆڕێک بە سەر وتە و وتاردا هاتوە؟

جا هەر بۆیە دەکوترێ ئەوەی ئەمڕو دەنوسرێ بۆ روون بونەوەی مەبەستێکی چەند هەزار ساڵ لەمەوپێش، دەبێ لە روی بەڵگە و ئاساری باستانی و بیر و باوەڕی زانای پایەبەرز و کتێبی بایەخ دارەوە بێ، ئەوەیش کاریکی سەخت و سەنگینە چونکە بە قەولی «رشید یاسمی» ئەوانەی لە بارەی تاریخ و نژاد کورد شتێکیان نوسیوە یا دەینوسن سێ دەستەنە: یەکێک رۆژ هەڵات ناس، کە لە روی عیلم و تەجرەبەوە ئەوەی بە پێویستی زانیوە نوسیویە. دوهەم: سەیاحانی عادی و جیهان گەڕن کە هاتونەتە کوردستانو سەر سەرەکی چاوێکیان گێڕاوەوە کتێبێکی گەورەیان لەو بارەیدا نوسیوە. سێهەم: کەسانێکن نە رۆژهەڵاتناس و نە زۆرگەڕ بەڵکو مەبەستێکی دیکەیان هەیە، ئەویش بریەتیە لە خەیانەت بە تاریخ و نژاد و میللەت، دەیانهەوێ زیانێک بە ئیمپراتوری (ماد) بگەیێنن، و خەڵف و نەمامی نەتەوی گەلی کورد بە زەهری زمان و قەڵەمیان ئاو بدەن و لە باخ و باخچەی خۆی ببیرن و بە نژادێکی دیکەی پەیوەند کەن چ خەیانەتێک لەوە گەورەترە.

# وشەی کورد

محەمەدی عەبباسی لە سەرەتای شەرەفنامەدا نوسیویە: لە زمانی سانسکریتدا وتەی کوراتای دەبینرێ بەلاّم نازاندرێ کە لە گەڵ وشەی کورد کە نێوی میللەتێکە نزیک بە چوار هەزار ساڵ لەو مەو پێش لە زنجیرە کێوەکانی زاگرۆس و دەور و بەریدا ژیاون و دەژین و چ پێوەندێکی هەیە.لە نوسراوەی یونانی باستان وشەی (کاردخۆی) بە باشی نێو براوە و (گزنفون) دانیشتوانی دەور و بەری زاگرۆسی بەم ناوە نێو بردوە.(شولگی) جیهانگەڕی بەنێوبانگی دنیای کۆن لە (٢٢٧٢-٢٢٢٦پ.ز) هەڵمەتی بردە سەر کوردستانی زاگرۆس و گرتی و تالاّنی کرد بەلاّم گیمیل سین جێنشینی ئەو، ئەمیرێکی بە نێو وارادنر کردە فەرمان ڕەوای سەر زەمینی کاردا و لە کەتیبەی ئەم ئەمیرەدا کە پێوەندی بە چوار هەزار ساڵ لەمەو پێشە، نێوی کورد دەبینرێ.(توروداژن) لە گۆڤاری ئاشوورناسی فەرانسە بەرگی پێنجەم ئەوەی نەقڵ کردوە و زانایان پشتیبانیان لێ کردوە و مرۆڤی ئاگادار پێیان وایە گەلی کورد،کە یونانیان ئەوان بە بەشێک لە تایفەی ماد و پارس دەناسن کوردی ئەمڕۆن، و بوونی گەلی کورد لە فارس لە زەمانی ساسانیان بەپێی کارنامەی ئەردەشیری بابەکان لایانگری لەم مەبەستە دەکا و وشەی کورد هەر ئەو (کروک) و (کردوئن) و (کردوخوی) یا (کاردخوی) یەکە (گزنفون) و (استرابوون) تووشیان بوون.لە زەمانی ئەردەشیری بابەکان وشەی (کورد) بە خەتی پەهلەوی بە (کورت) نوسراوە.

بە پێویستی دەزانم ئەوەی بڵێم کە زۆر کەس هەن ئەگەر بە غەیری زمانەکەی خۆی قسە بکا و وشەی بێگانە بە کاربێنێ ئەوانەی گوێیان لێیە زوو دەزانن کە زمانی خۆی نیە و وایش هەیە بە زاراوەکەیدا بزانن خەڵکی کوێیە چونکە شکڵی ئەو وتارە دەگۆڕی جا لەورووەوە میللەتانی دنیا هەر یەک بە جۆری وشەی کوردیان بە زمان داهاتوە کە بە کورتی ئیشارەیێکی پێدەکەین.

عەرەب: کوردی، کاردۆی، کاردا، جوودی، جووردی، کارتا و یە، کەرخی، کورخی.

ئاشوور: گوتی، کارداک، کوتی، کورتی، کاردۆ، زکارتی، کارداکا، کاردان، کارکتان.

ئێرانی: کورتیوی، کوردراها، سیرتی.

رۆمی: کاردوسوی، کاردوخوی، کاردوک، کردوخی، کاردویکان، کردۆکی.

ئەرمەنی: کوردوئن، کورچغ، کورتیخ.

سومرێکان: گوتی.

# پێشینیانی کورد

دوکتور «کونتیناو» دەڵێ: لە هەزارەی چوارەمی پێش زایین دەستەیێک مرۆڤ لە لای باشووری سیبریەوە کۆچیان کردوە و هاتونەتە کێوەکانی زاگرۆس و بە ئاسیایی نێو براون، و لە هەزارەی سێهەمدا دەستەی دوهەمی هەر لەو سەرزەمینەوە کۆچیان کردوە و ئەوانیش هەر چوونە زاگرۆس کە پێیان دەڵێن ئاری یا هیندو ئوروپایی. هەر دو دەستە دوای مشت و مڕ و کێشە، یەکیان گرتوە و بەینە نەهرەینیان خستوەتە ژێردەستی خۆیان کە ئەوانە بەگوتی و کوسی نێو دەبرێن. دەستەی دیکە لە ئاریایی لە تورکستانی شورەوی ئەمڕۆوە کۆ بوونەوە و بۆ باشووری ئێران هاتوون و لەوێ بونە دوو بەش برێکیان بەرە و کێوەکانی هیمالیاوە ڕۆیون و خەڵکی هیندوستانیان پێک هێناوە و لەساڵی (٢٥٠٠ پ.ز.) کۆمارێ لە ئێران مانەوە و ئەوانیش بوون بە دوو دەستە ئەوانەی لە دەشتدا مان بە فارس نێو بران و ئەوانەی چوو بونە چیاکانی زاگرۆس کورد بوون و بوونە تایفەتایفە. وەک لە پێشدا ئاماژەمان پێ کرد وەک : لولو، گوتی، کوسی، مانای، کاردوش، خالدی، کاردۆ و ماد. دوکتور (سپایزر) دەڵی: مادەکان و گوتی شەش هەزار ساڵ پێش زایین لە کێوەکانی زاگرۆس دابوون و مێژونوس و پێشەوای مەشهوری کەلدانی «بروس» کە لە سەدەی سێهەم پ.زدا ژیاوە زەردەشت بە هەوەڵین حەڵقەی زنجیرەی نژادی ماد دەزانێ کە لە زەمانی گشتاسب پادشای کەیانی هاتوەتە دنیاوە و هەر لەو زەمانەدا کوردی گوتی شالاویان بردە سەر کەلدە و لەوێ پادشاییان کردوە. «دیاکونوف» لە تاریخی ماد دا نوسیویە وشەی گوتی لە هەزارەی سێهەم و دوهەمی(پ.ز) بە گەلێک کوتراوە کە لە ڕۆژهەلات و باکووری ڕۆژئاوای لولوبیان و ئازەربایجان و کوردستانی ئەمرۆ ژیاون بەلام لە هەزارەی هەوەڵی (پ.ز) بە تەواوی خەڵکی «ئورارتو» و «ماننا» و «ماد»یان کوتوە گوتی.

«دێهخودا» دەڵێ: «هردوت» کوتویە: ماد شەش هۆز بوون بە نێوی بوس، پارتاکن، ستروخات، ئاریسانت، بوود، مۆغ. هێندێک تاریخی کۆن دەڵێن بووسەکان لە «عێراق» و پارتاکن لە «رەی» و کەناری دەریای خەزەر و ستروخات لە «مەرو» و «خوارەزم» و ئاریسانت لە «ئازەربایجان» تا چۆمی ئەرەس، و «بوود» چوونە هێندوستان و مۆغ لە کوردستانی ئەمڕۆدا جێگر بوون. ئەم تایفە و هۆزانە هەریەک ژین و سەربەستی جیاگانەیان بووە. بەلام دیوکس ئەوانەی کردەیەک و دەوڵەتی مادی پێک هێنا.

ئاسەوارناسان روونیان کردوەتەوە کە هۆز و گەلی کورد لە پێش کەلدە و ئاشوور و پێشدادیان بوون چونکە چەند هۆز لە تایفەی نەسلی کورد کە بریتین لە «لولو» و «گوتی» و «کاسی» بەر لە ئەوانە لە زاگرۆسدا بوون و لەو کاتەدا نێوێک لەوانە نەبوو.

کەیومەرس لە دەوروبەری ساڵی (٣٣٤١ پ.ز.) دەوڵەتی پێشدادی ساز کرد و دەماوەندی

کردە پێ‌تەختی خۆی و لە نزیک سالی ٢٦٠٠ (پ.ز) زەحـحاکـی عـەرەب لە بـابلەوە بـۆ مەملەکەتی پێشدادی و پارس و ماد لەشکری هێنا و جەمشید پادشای پێشدادی لە (استخر)دا شکست پێ‌دا و دەولەتی لەبەین بـرد، بـەلام لە دوایـیدا لە سـالی (٢١٩٢پ.ز.) فـەرەیدونی پێشدادی بە یارمەتی کاوەی ماد و مادەکانی ئیسفەهان شورشیان کرد و زوحاکیان ئەسیر کرد و کوشتیان و خەلکیان لە زولم و زۆر نەجات دا.

لە سەدەی (١٩) و (١٨)داکابرایێک بە نێوی (میتانی) دەولەتێکی ساز کرد کە ئەوانیش بە کورد ناسراون و لە سالی (١٧٦٠پ.ز.)داکوردی کاسی لە گەل دو عەشایری خزمی خـۆیان (گوتی و لولو) شالاویان بردە سەر (کلده) وگرتیان و دەولەتی (کاردونیا)ی کوردیان پێک هێنا کە شەش سەدە دەوامی بوو و لە سەدەی ١٦(پ.ز) قەومی (ماتیانی یا مایتانی یا میتانی) بە سەر تەواوی کوردستاندا تا (کەرکوک) و نزیک ئـاشوور و (ئـەربیل) فـەرمانرەوا بـوون بـەلام کوردستانی رۆژهەلات لەو کاتەدا باجی بە ئاشوور دەدا.

لە سالی ١١٠٠(پ.ز) تیگلات پیلسری هەوەل پادشای ئاشوور هـەلمەتی بـردوەتە سـەر (پارس و ماد) و کردونییە باج گوزاری خۆی و لە سـەدەی ٩ (پ.ز)داکـوردی زاگـرۆس لە پادشای ئاشوور (ئاسورئازیربال) هەلگەرانەوە و سەربزێوییان کرد و چوون پالیان بە بابلە وەدا و جێ‌نشینی ئەو (سلمانازار) لە ئاخر سەدەی (٩پ.ز.) هاتوە بۆ شەری کوردستان و لە گەل پارس و ماد روبەروبوە و ئەوانی بە (پارسوا) و (ئامادا) نێو بردوە.نارام‌سین پادشای ئەکەد لە سـالی (٣٦٠٠ (پ.ز) هەلی‌کوتاوەتە سەر «کوردەکانی» گوتی لە دەور و بـەری شـارەزوور بـەلام پادشای ئاشوور شکا و بابل کەوتە دەس (کوردەکان) و ٢٢۴ سال لەوێ فەرمان رەواییان کرد و لە دوای ئەو سارگونی دوهەم (کوردەکانی)گوتی شکست پێ‌دا و بابل کەوتەوە دەست ئاشوور و تا سێ سەدە کوردەکان باجیان بە بابل دەدا. تاریخ نوسیویە «شەلم نەسری سێهەم» لەپارسواکان کە لە لای خۆرئاوای زرێچەی ورمێ نیشتەجێ بوون باجی وەرگرتوە. زۆربەی مـێژوونوسان پێیان وایە ئەم «پارسوا»نەکە لە نێو خاکی «میدیا»دا بوون و بە تـەنگ هـاتوون نـاچار بـوون گویستویانەتەوە بۆ ناوچەی «فارسی ئێستا»، بەلام تاریخی «دیاکونوف» وەرگێراوی «کـەریم کشاورز» نوسیویە: هێرشی «تیگلات پیلسر» بۆ خاکی مـاد بـۆتە هـۆی وەدەس هـێنانی دوو ئەیالەتی تازە یانی «پارسوئا» و «بیت همبان» و ئەم دوو ناوچە هەر لە دەس ئاشووردا بـوو تـا تێکچوو، و لە لاپەرەی (١٨٨)دا دەلێ لە پێشداکوتومە وا مەشهورە کەگۆیا «پارسوئا» زادگای «پارسیان» بوە بەلام کاتێکی ئەو ناوچە کەوتە دەس ئاشوور ئەوان لەوێوە بۆ پارس کۆچیان کرد بەلام ئەم بیر و رایە جێی باوەر نیە چونکە لێکولینەوە لە شوێن و ئاساری (پارسوئا) نیشان دەداکە خەلکی ئەو ناوچە هەرگیز ئاریایی نەبوون. لە لایێکی دیکەوە نوسراوەکانی ئاشوور نیشان دەدا کە کۆرشی مەزن لە دەهەی سێهەمی قەرنی حەوتەم (پ.ز.)دا بوە و (پارسوئا) لەو تاریخەدا لە

ژێر دەسەڵاتی ئاشوور دابوە و ئەو دەوڵەتەش لەوە بە هێزتر بوە کەناچار بێ ئەو شوێنە بە جێ بهێڵێ و بڕواکەوابێ ئەو میللەتە نیسبەتیان بە فارس نیە.

هەر ئەو کتێبە لە لاپەرەی ٦٨ نوسیویە: شتێکی بەرچاوتر ئەوەیە کە نێوی فارسی «پارس» وشەیێکی «ماد»ییە و «پرسو» یا بە ئاشووری «پارسوآ» بە ناوچەیێکی دیکەیان کوتووە کە ئاخری رۆژئاوای خاکی ماد بوو، و ئاساری ئاشووری روونی دەکاتەوە کە ئەوە، هەروا رێکەوت و هەڵکەوت نیە بەڵکوو ئەم وشانە (پارس و (پرسو) کە بە مانا دەندەو پەراسوون بە مەجاز بە مانای کەنارن ئەوەیە کە (پارس) و (پارسوا) و (پارت) کە لە کەناری خاکی ماد دا بوون؛ لە باشووری (پارس) لە رۆژئاوای (پارسوا) و لە رۆژ هەڵاتی (پارت) جێ گیر بوون و هەر سێ وشە بە مانای کەنارن و ئەوانە لە کەنار و سنووری دەوڵەتی ماد دا بوون.

# کورتەباسێک لە بارەی کورد و کوردستان لە پێش مادەکاندا

مێژوی کۆنی کورد و کوردستان لە رووی ئاسار و بەڵگەوەکە بە لێکۆڵینەوە و حەول و تەقەلای زیاتر لە دو سەد ساڵی زانایانی رۆژئاوا و رۆژهەلاتناس وەدەس هاتووە ئەوەمان نیشان دەداکە مرۆڤ سەدها هەزار ساڵ لە سەر ئەم ئاو و خاکە ژیاوە بەلام بە وردی و بە تەواوی پایەی شارستانیەتی وکومەلایەتی ئەوان دەرنابڕن و زیاتر باسی شەر و شور و کوشتن و تالانیان دەکا، و هێندێک لە مێژوونوسان لە بارەی زاڵ بوون یا شکستی بڕێک لەو قەومانە نوسیویانە و لە چۆنیەتی ژیانیاندا لە تاریخدا ناکۆکی هەیە بەلام ئەمەی بۆ ئێمە روون کردوەتەوەکە لە پێش مادەکاندا لە ناوچەی زاگرۆسدا چەند قەوم ژیاون و ئەویش بە وردی و بە تەواوی فتوکوپی بەرابەری ئەسڵ نیە بەلام بە هیندێک لەو قەومانەکە کوردن و پێوەندیان لە گەڵ مێژووی کوردستان هەیە ئاماژە دەکەین.

١- لولو، ئەم قەومە لە زنجیرەکێوەکانی زاگرۆسدا بوون لە باشووری ناوچەی گوتی و لە باکووری کاشیان و هەرێمی ئەوان سولەیمانی و شارەزوور و دەوروبەری ئەوان لە سەدەی ٢٨ (پ.ز)دا بوە و تیرەیێک بوون لەگوتیەکان و پێکەوە دەژیان و ولاتی حەلوانیان خستە ژیر دەسەلاتی خۆیان و پروفسۆر (سپایزر) دەڵێ ئەمانە باپیرەگەورەی لوڕەکانن وکەتیبەی سەرپردی زەهاب لە ئاسەواری ئەوانە. رۆژهەلاتناس «هوزنیخ» دەڵێ: زمانیان شاخەیێک لە زمانی ئیلامییە.

٢-گوتی، لە هۆزەکانی زاگرۆس و لەکوردستانی ئەمڕۆ و دەور و بەری کێوی جودی نیشتەجێ بوون و ئەوکێوە نێوی لە قەومی گوتی گیراوەتەوە و نێوی زاگرۆس لە زمانی یووناندا لە نێوی تایفەیێکی ماد (ستگرتە) وەرگیراوە و لە زمانی ئاشووریدا نێوی (زیگرتو) بوە و گوتی لە ٢٦٤٩ (پ.ز) ولاتی سومر و ئاکادیان زەوت و زیاتر لە (١٢٥) ساڵ لەوێ فەرمانرەوایان کردوە بەلام پادشای «ئوور» لە ساڵی (٢٥٢٤پ.ز.) هەڵمەتی بردە سەریان و شکاندنی، ناچار گەڕانەوە بۆکێوەکانی زاگرۆس.

٣- (کاسی، کوسی، کوشو، کاششو)، ولاتی ئەسڵی ئەوان لە هەزارەی پێش زاییندا لوڕستان و بەختیاری و ئیلام بوو و لە ساڵی (١٧٦٠پ.ز.) حاکمی کاسی «گندش» هێرشی کردە سەر بابل وگرتی و ئەو هۆزە (٥٨٠) ساڵ لەوێ فەرمانرەواییان کرد و بە زمانی قەفقازی گفت وگۆیان دەکرد.

٤- عیلامی، کتێبی تاریخی ئیلام پێویستە تەماشاکرێ.

٥- سوباری، ناوی ولاتێکی گەورەیە لە باکووری رۆژئاوای خوزستانەوە تاکێوی ئامانوس

درێژی و بەربڵاوی بووە و لە دواییدا ئەم وشەیە بووەتە نێو بۆ زۆربەی عەشایری کوردستان.
جگە لە قەومەکانی ئەسڵی زاگرۆس هێندێک لە هۆزی سوباری لە سوریە و ئانادوڵ دابوون و برێک رۆژهەلاتناس کوتویانە میتانی شاخەیێک لە سوبارین، و (سرسیدنی اسمیت) کوتویە تیرەیێک لە سوباری لە رۆژئاوای دەجلە بە (هوری) نێو دەبرێن و بە هۆی شەرکردن لەگەڵ پادشایانی ئاشوور ئاساریان براوە و لە ١١١٠ - ١١٠٠(پ.ز) تیگلات پیلسری هەوەڵ، یەکێک لە شارە گەورەکانی ئەوانی بە نێوی (شریش) گەمارۆدا بەلام سوباری مەردانە لە بەرابەری راوەستان و شارەکەیان پاراست.

٦- نایری، قەومێکی زۆر و گەورە و بە هێز بوون کە تەواوی ناوچەکانی کوردستان بە ناوی ئەوان ناسراوە و ولاتی سوبارییان گرتوەتە دەست و لە ٩١٠ (پ.ز) دەوڵەتی ئاشوور لە ناوچەی کێوی جودی و دەجلە لەگەڵ نایریەکان بەکێشە هات و ئەو ناوچەی زەوت کرد. «میجرسیون» رۆژهەلاتناسی بە نێوبانگ نوسیویە ئەوانە چەند حکومەتی چکۆلە بوون بەلام یەکگرتوو بوون.

ولاتی نایری تەنیا ناوچەی زابی گەورە نەبوە بەڵکو لە ولاتی دیاربەکر و خەرپوت و دەرسیم و کێوەکانی بدلیسیشدا نیشتەجێ بوون. لە دواییدا نایری لە نێو ئەوکێوە بڵیندانەدا زمان و نژادی خۆیان پاراستوە.

٧- میتانی، هێندێک مێژوونووس پێیان وایە میتانی تیرەیێک لە قەومی کاسایین لە نژادی ئاریایی بەلام زۆربەی زانایان بڕوایان وایە میتانی شاخەیێک لە هۆزی (سوبارو = سوبارتو)ن لە دەوروبەری چۆمی فورات لە مابەینی موسڵ و ترابلسدا ژیاون و لە سەدەی ١٦ (پ.ز)دا حکومەتیان سازکرد کە یەکێک بوو لە چوار حکومەتی گەورەی ولات: (مصر، هیتیت، کاردونیاش و میتانی) و پێتەختیان شاری «واشوگانی» بووە و میسریەکان بە میتانیان دەکوت (ناهاری) و لە تەوراتیش بە نێوی (ئارام، ناهارم) نێو براون و لە ناوچەی کەرکوک چەند هەزار بەڵگە و سەنەد لەبارەی سوباری و میتانیدا ەدەس هاتوون.

٨- کوردی خالدی لە سەدەی نۆهەمی (پ.ز)، لە ناوچەی وان دەوڵەتێک بە نێوی «هالد»یا (خالدی) هاتە سەرکار کە ئاشوورریان بە وان دەڵێن (اورارتو) و (اوراشطو) و لە عیبریدا (ارارات) و یونانیان نێویان دەبەن بە (الارودی) و (خالدی) و (خاڵدایوی). دەوڵەتی (اورارتو) تا سەدەی شەشی پێش میلاد ماوە و لە دوای ئەوە (ئەرمەنی) پەیدا بوون و خالدی لە نێو کێو و شاخدا بلاوبونەوە، و لە دەوروبەری دەریاچەی وان ئاسەوار و شوێنیان ماوەتەوە و لە (تەرابوزان) جێیێک بە نێو خالدیا بوە و شاری خەلات دیاردەی نێوی ئەوانە و لە لای قەفقازیش نێویان هەیە و بەردی کیلەشینیش لە سنوری رۆژئاوای ئێران ئاسەواری

ئەوانە، هێندێک لە زانایانی دوربین وەکوو (راسکە)کوتوویانە «خالدی، کوردی کورتی، و گردیای هەموی یەکێکە».

لە چل و پێنج کیلومتری باشووری «ورمێ» جادەیێک کە دەچێ بۆ شنۆ قوڵکەیێک لە بەردێک هەڵکەندراوە و بەردە نوسراوەیێکی (ئورارتویی) دۆزراوەتەوە و بەو جێگەیە کە لە دوڵی قاسملوو دایە و نزیک بەکێلەشینە، ئەمڕۆ پێی دەڵێن کانی ئەژدیها و هەر لەو نزیکە نێوی «هالدیی» کە بە مانا (ئالهە)یە لە سەر بەردێک دەخوێندرێتەوە و چونکە کوردی ئەو ناوچە بە خودای «هالدی» باوەڕیان بووە خەڵکە کە بە (خالدی) نسبەت دراون و لەکێلەشینیش لە چەند رستە نێوی خالدی هاتوە: لە لای خودای «خالدی» لەبەرامبەری دەروازەی خالدی بە خودای خالدی ـ خودای خالدی رەحمی نیە.

## دەوڵەتی ماد

«هردوت» نوسیویە: دەوڵەتی ئاشوور لە ئاسیادا پێنسەد ساڵ حکومەتی کردوە و هەوەڵین قەومێک کە لە بەرامبەری ئاشووردا راست بۆوە و قارەمانانە چوە مەیدانێ و شەڕیان کرد و خۆیان و زۆر نەتەوەی دیکەشیان لە ماڵوێرانی و ئەسیری ئازاد کرد، ماد بوون کە لە ٧٠١ یا ٧٠٨(پ.ز) بناخەی حکومەتیان دانا و هەوەڵین پادشای ئەوان «دیاکۆ» بوو ٧٠٨ـ٦٥٥ (پ.ز) و هەمەدانی کردە پێتەخت. دوای مردنی «فەروەرتیش» لە جێی بابی «دیاکۆ» ٦٥٥ـ٦٣٣ (پ.ز) دانیشت و وەکوو بابی باجی بە پادشای ئاشوور «ئاشووربانی پاڵ» دەدا و پارسی کردە فەرمانبەری خۆی و دوای بەینێک هەڵمەتی بردە سەر ئاشوور بەڵام کوژرا و کوڕی لێ هاتووی «هوخشتەرە» (٥٨٥ـ٦٣٣) لە سەرتەخت دانیشت و هێرشی کردە سەر خاکی «ئاشووربانی پاڵ» و شاری «نەینەوا»ی دەورەدا، بەڵام خەبەریان پێدا سکاکان لە قەفقازەوە بە کوشتار و تاڵانەوە دێن بۆ خاکی ماد ئەویش ناچار گەڕاوە بۆ شەڕی ئەوان و لە باکووری دەریاچەی ورمێ شەڕێکی سەخت دەس پێکرا بەڵام «هوخشترە» شکا و سکاکان تا دەریای مدیترانە رۆین و بیست و هەشت ساڵ لە وڵاتی ماد دا بوون تا هوخشترە «شای ماد» پێشەوای ئەوانی لەگەڵ زۆربەی سەرپەلەکانیانی بانگێشتن کرد و هەموی مەست کردن و تەواویانی کوشت و لەشکری ئەوانی لە ئێران وەدەرنا. «گیرشمن» نووسیویە: لەکاتێکدا سکاکان لە ئێراندا بوون «سقز» پێتەختی ئەوان بوو و ئەوان نێویان نابو ساکز و کاتێک پادشای ماد لە شەری سکاکان نەجاتی بوو شاڵاوی بردەوە بۆ ئاشوور و دەورەی نەینەوای دا و چونکە پادشای ئاشوور «ساراکوس» زانی دەرەقەتی نایە خۆی و بنەماڵەی خستە ئاورەوە و سووتان و ئەو شارە

گەورەی جیهانی قەدیم لەگەڵ خاک یەکسان کرا (٦١٢پ.ز). هوخشتەرە ئەرمەنستان و لای سەرەوەی دەجلە، و ئاسیای سەغیری تا چۆمی هالیس خستە ژێر چۆکی خۆی و عیلام، پارس، هیرکانی، طبرستان گوێ لە مستی ماد بوون، پروفسۆر «سایس» دەڵێ مادەکان عەشایری کورد بوون لە رۆژهەلاّتی ئاشوور دامەزران و ولاّتی ئەوان تا باشووری دەریای خەزەر پەرە سەندبوو و لەو کاتەدا ماد گەورەترین دەوڵەتی ئاسیای رۆژئاوا بوو. هرودت دەڵێ مادەکان لە زەمانی قەدیمدا نێویان ئاریان بوە و لە دواییدا «هەوەخشەتەرە» نێوی خۆیانی گۆڕی و کردیە ماد و ئاشوور پێیان دەکوتن ئامادا.

ایخ تورویکو (ئازیدهاک) لە دوای مردنی (هوەخشەتەرە) لە جێی بابی بوو بە پادشا بەلاّم چونکە مروڤێکی خۆشگوزەران بوو خەڵک لێی رازی نەبوون و لەکاتێکی (کوروشی گەورە) هێرشی کردە سەر مادەکان ئەویان بەردا و پاڵیان بەکورشەوە دا و لە ئاکامدا دەوڵەتی ماد لە ٥٥٠ (پ.ز)دا لە بەین چوو دەوڵەتی هەخامەنشی هاتە سەرکار.

دوکتور (سپایزر) تا شەش هەزار ساڵ (پ.ز) تاریخی ماد دەباتە دواوە و لە ساڵی ٣٦٠٠ (پ.ز) «نارامسین» کوڕی سارگونی هەوەڵ پادشای (اکد) حکومەتەکەی بە دەستی گوتی کوردی ئارارات لە بەین چوو و بابل و سومر و ئەکەدکەوتە دەست کوردەکانی گوتی و لە ئاخردا کوتوبەکتێب و ئاسەواری تاریخی میللەتێکی لە کورد قەدیمی‌تر لەم سەرزەویەدا نابیندرێ و جێی قسەوباس نیەکەکورد ئاریایی نژادن لە رەگەزی (هێندو ئوروپایی)ن.

کتێبی «ایران در عهد باستان» دکتر مشکور نوسیویە: کەیقوباد هەوەڵین پادشای کیانیان تا کەیخوسرەو سەرۆک و رێبەری قەومی رۆژئاوای ئێران بوو و دەڵێ: (هرتسفلد ئەڵمانی) کوتویە ئەو قسەیە راستە و هەوەڵین پادشایانی کەیانی هەمان پادشایانی ماد بوون و ئیحسان نوری لە لاپەرەی ٦٤ کتێبی ریشەیی نژادکورد دا نوسیویە: کەیقوباد بە قەولی تەواوی زانا و لێکۆڵەران «دیاکۆ» یەکە سەر پەلی هۆزی (ماننایی) بوە و کیومەرس هەوەڵ پادشای گوتی بووە.

## شۆڕشی خەڵکی ماد

لە دوای ئەوەی کوروش لە شەڕی سکاکاندا کوژرا کوڕەکەی کمبوجیە بوو بە شا و ئەویش لە شالاوێک دا کە بردیە سەر میسر لەگەڕانەوەدا لە سوریە لە ساڵی (٥٢٣ پ. ز.) کوژرا. لەوکاتە دا مرۆڤێک لە هۆزی ماد بە نێوی گۆماتای موغ شۆڕشی کرد و پارێزگەی (استان) ماد و پارس و چەند پارێزگەی دیکە لایەنگریان لێ کرد بەلاّم لە ئاخردا بە دەستی پیاوە گەورەکانی فارس کوژرا (٥٢٢ پ.ز.) «هیرودت» دەنوسێ: ئەوانەی کە گوماتایان کوشت

دەست بە شیر تووشی هەر مۆغێ بهاتایەن وەبەر خەنجەریان دەدا. خەڵکی پارس هەمووساڵێ جەژنێکی دەگێرن بە نێوی جەژنی «مغ کشان».

## شۆرشی فەروەرتیش:

شۆرشی گوماتا بوە هۆی ئەوە لە دواییش دا لە چەند جێگەی وڵاتی ماد لە حکـومەت راپەڕن و وەک شەپۆلی دەریا لە هەر لاوە جمین و کەوتنە دوای سەرۆکی خۆیان فەروەرتیش کە دەیکوت ئەمن لە بنەماڵەی هووەخشەتەرەم و خەڵکی ماد و پارت (خراسان) و ئەرمەنستان پشتیوانیان لێ کرد و لەو کاتەدا داریـوش کـە لە شـەڕ لە گـەڵ بـابل دابـوو گـەڕاوە و لە گـەڵ فەروەرتیش رووبەروو بوون بەڵام چونکە شەڕەکە نابەرامبەر بوو هـەر چـەند بـە جـەرگی و نەبەزی لە خۆی نیشان دا لە بەرامبەری هەڵمەت و هێرشی لەشکری داریوش خۆی پێ رانەگیرا و لە ئاخریداگیرا و بردیانە لای داریوش. داریوش لە بێستون دا نووسیویە: فەروەرتیشیان هێنا لای من لوت و گوێ و زمانی ئەوم بڕی و چاویم دەرێنا و بە زنجیر بەستیانەوە و لە هەمەدان کردم بە سەرنێزەوە... و چەند شۆرشی دیکەش.

## ئازەربایجان لە زەمانی کۆندا

ئازەربایجان لە زەمانی هەخامەنشیدا، مـادی چکـۆلەیان پـێ دەکـوت و لە کـاتێکدا ئەسکەندەر شالاوی بۆ ئێران هێنا ئاتروپات بە سەر ئازەربایجاندا حاکـم بـوو و دوای تـێک شکانی داریوش لە لایەن ئەسکەندەرەوە لە ٢٣٢(پ. ز) دووبارە بۆوە حاکمی ئەو وڵاتـە و دوای ئاتروپات، بنەماڵە و هۆزی ئەو لەوێ مانەوە. دەوڵەتی مادی چکۆلە هەر چەند بەشێک لە حکومەتی سلوکی بوو بەڵام دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو، و پەنا و بنکەیێک بوو بۆ دین و ئایینی زەردەشت و پشتیوانی ئێرانیان لە بەرامبەری یونانیان. لە دوای لەبەین چوونی حکومەتی سلوکی بەدەستی ئەشکانیان حکومەتی ماد هەروا سەر بـە خـۆماوە و لەو زەمـانەدا سـنووری مـاد لە باکورەوە ئەرمەنستان و «ئەرێن» و لە رۆژئاواوە بە ئادیابن و کردون و لە باشورەوە بە مـادی گەورە و لە رۆژ هەڵاتەوە بە بەحری خەزەرەوە کادویسان گەیشت و پێتەختی «پرسپە»ی نێو بوو لەو شوێنە کە لەم زەمانەدا تەختی سولەیمانی پێ دەڵێن و حاکمی مادی چکۆلە ئاترۆپات بوو لە زەمانی ئەسکەندەر لە ٣٢٨(پ.ز) و لە دەورەی سلوکی دا(ئارتەبازان) و (مهرداد) ٦٧(پ.ز) و چەند مرۆڤی دیکە تا زەمانی فەرهادی چوارەم پادشای ئەشکانی ئەو وڵاتەی گرت و لەو کاتە بەو لاوە ئەو وڵاتە بوە ملوک الطوایفی و بەمجورە سەربە خۆیی خۆیان راگرت.

# دابەش بوونی دەوڵەتی ماد

تاریخی ماد نوسراوەی «دیاکونوف» وەرگێراوی «کەریمی کەشاوەرز» لە لاپەرەی ٦٩دا نوسیویە: دەولەتی ماد لە ئاخری قەرنی چوارەمی پێش میلاد بوە دوو بەش: یەک مادی «ئاتروپاتن» و ئەوی دیکە «مادی گەورە». لە دەورانی بەردەداری‌دا ئەو دو بەشە هەرگیز یەکیان نەگرتەوە و لە ناو هەریەک لەو مادانەدا قەوم و هۆزی تازەی سەربەخۆ پەیدا بوون.

# مەڵبەندی ماد

ماد دوانن: هەوەڵی مادی گەورە کە سنوری لە باکوورەوە چۆمی ئەرەس و قەفقاز و لیوای لازستان لە رۆژهەلاتەوە تا دەربەندی دەریای خەزەر (دەروازەی بەحری خەزەر) و ئەو دەربەندە (ماد)ی لە (پارت) جیا دەکردەوە و لە رۆژ ئاواوە کێوەکانی زاگرۆس تا دەگاتە ئایەنە و سیواس و پاڵ دەدا بە ئانادۆڵەوە و چۆمی فوراتەوە و لە باشوورەوە: خوزستانی ئێران و عێراقی عەرەب و چۆڵی شام (لیوای دیرەزور) . دوهەمی مادی چکولە: مادی ئەسلی بریتی بوە لە ئازەربایجان، کە بە بەرزەخی ماد نێو براوە. (ئازەربادگان) نێوی ئاتەشکەدەیێک بوە لە کێوی (نیخ‌داغی) کە لە پێش‌دا بە(گەبران داغی) مەشهور بوو، زانایانی لێکۆڵەر دەڵێن ئازەریانی ئاگر و بادەگان یانی خازن، نگەبان و وێگرا یانی ئاگاداری ئاور و پێ‌تەختەکەی گەنجەک بوە لە تەختی سولەیمانی ئێستادا.

لە زۆر جێگەی دیکە لە دنیای کۆن و ئەمرۆش‌دا کورد ژیاون و دەژین لە باشووری **قەفقاز، لە ئانادوڵ، لە باکووری سوریە،** لە رۆژهەلاتی **حەڵەب لە بلوچستان، لە ئەفغانستان، لە خوراسان،** دەوروبەری **قەزوین و اروپا و ئەمریکا** و...هتدە. ئەمرۆ ژمارەیان بە نیزیکەی **چل ملیۆن** دەگا.

# تەمەدونی ماد

دەوڵەتی ماد بنچینەی مەملەکەت‌داری و هونەری سان‌دانی سوپا و ئوردو و لەشکریان بە باشی رێک و پێک دەکرد و دەچوونە مەیدانی شەڕ و دەرەتانیان لە دوژمنی خۆیان دەبڕی و پرش و بلاویان دەکردن و ئیمپەراتوریان سازکرد کە بە شان و شکۆوە بژین، و داب‌و رەسم و

لیباسی پایە بەرزی ماد لە سەر تەتەڵەی چیرۆک نوسان هەڵکەندراوە بەڵام لە شارستانیەتی ماد ئاسەوارێکی زۆرباش لە دەس دانیە و کتێبێک کە بە باشی خەت و زمانی ئەوان نیشان‌دا نەبیندراوە، تەنیا لە کەتیبەی ئاشوور و لە بەردە نوسراوە کانی هەخامەنشی‌دا شارستانیەتی ئەوان تا رادەیێک روون دەبێتەوە و بێجگە لە وانە چەند وینەیێک لە ئاسەواری ئەوان هەیە کە پێشکەوتویی و شارستانیەتیشیان دیاری دەکا ئەوانە بریەتین لە کوتەڵی شێری کە لە بەرد سازکراوە لە نزیک هەمەدان و وێنەی مرۆڤی لە بەرد بە لیباسی مادییەوە لە سوچێک لە نزیک سەرپولی زەهاب کە ئەمرۆ پێی‌دەڵێن «دوکانی داوود» و وەتاغی فەرهاد لە لورستان و شکڵی مرۆڤی لە بەرد کە لە حاڵی عیبادەت دایە لە دێی «نواسحاق وند» نزیک کرماشان و قەسری هەمەدان کە لە داری سەرو دروس کراوە و روکاری بە تەختەی زێڕ و زێو رازاوەتەوە پێ‌تەختی ئەوان بوە. بە پێی مێژۆوە دەوڵەتی ماد لەو بابەتەوە گرینگایەتی هەیە کە بۆ هەوەڵین جار دەوڵەتێکی گەورەی لە نژادی ئاریایی پێک هێنا و دوایی بە حکومەتی پێشکەوتووی نژادی سامی هێنا.لە رۆژنامەی (ناهید) شمارە ٨١ جدید ئەو شتە کۆنانە و ئەنتیکانەی کە لە زێویەی کوردستانی ئێران لە ٤٠ کیلومتری سەقز وەدەس هاتون و چەند شتی‌تر لەوانەی لە چاپ داوە و ئێمەیش بۆ نیشان دانی تەمەددون و شارستانیەتی دەوڵەتی ماد دەیخەینە بەر چاوی ئێوە:

١ـ لاپەڕەیێک کە نەخشی بەرجەستەی دو شێری باڵدار لە تەلاکە پێوەندی هەیە بە سەدەی ٨ـ٧ (پ.ز) کە بە موزەی مترو پولیتن فرۆشراوە.

٢ـ نەخشی بەرجەستەی ددانی فیل کە مروڤێک سواری ئەسپێکە لە کاتی لە بەربەرە کانی لە گەڵ شێرێک.

٣ـ لاپەڕەی تەلاکە سێ ریز نەخشی بەرجەستەی حەیواناتی باڵداری هەیە بە کەللە سەری جۆراجۆری ئینسان، پەرەندە، شێر و چەند شتی دیکەوە و بە پێی نوسراوەی رشید کەیخوسرەوی لە لاپەرەی ٢٢٣دا زیاتر لە سێ‌سەد تیکە لەوی بینراوەتەوە کە باستان‌شناسان لە ریزە کاری ئەواندا مات و حەیران بوون. و پروفسور «گدار» لە کتێبی خەزێنەی تەلای زیویە کوردستان کە لە ١٣٠ لاپەڕەدا لە ساڵی ١٩٥٠ میلادی‌دا لە (هارلم) بە چاپی گەیاندوە نوسیویە: چەند ساڵ لە مەو پێش گەنجینەی «تەلا، عاج و زێو لە زیویە ٤٠ کیلومتری رۆژهەڵاتی سەقزی کوردستان دەس‌کەوتوە کە پەیوەندی لە گەڵ قەومی مادە».

پرۆفسور «گیرشمن» نوسیویە: تابوتی زیویە، کاری هونەرمەندانی مادە و عەکسی سەربازانی ماد، لە سەر ئەو تابوتە نەخش کراوە و ئەو تابوتە لە بۆ پادشای ماد هوەخشتەرەیە کە لە گەڵ نوسراوەی هردوت یەک دە گرێتەوە. تاریخی ماد نوسراوەی «دیاکونوف» ترجمە «کریم کشاورز» لە لاپەرەی ٣٧١ شمارە ٥ دا نوسیویە: وشەی هونەری ماد وەبەر چاو دێ و تا ئاخری

لاپەرەی ٣٨٠ چەند عەکسی کەم وێنەی چاپ کردوە کە زۆری لەو ئاسەوارانە لە زیویەی لای سەقز دۆزراوەتەوە. ژمارە ٧٣ دەوری زێوینی (نقرە) زیویە (مانانا) سەدەی ٨ (پ.ز) و ژمارە ٧٤ سینەرێزی تەلاٚ لە زیویە هونەری (مانانایی) مادی سەدەی ٧ (پ.ز) ژمارە ٧٥ زینەتی، لە تەلاٚ لە زێویە سەدەی ٨ (پ.ز) ژمارە ٧٧ بازنەی تەلاٚکاریماننا، مادی خەزێنەی زیویە سەدەی ٨ (پ.ز). لە باری مەزهەبەوە چەند کەس لە زانایان دەڵێن زەردەشت لە کەناری دەریاچەی (چیچست) هاتوەتە دنیاوە بەم پێیە دەبێ مادەکانیش بە دو هێزی «آهورمزدا» و «ئەهریمەن» باوەریان بوو بێ.

# پێک‌هاتنی دوبارەی دەوڵەتی ماد بە هاتنی ئەسکەندەر

نیزیک بە ئاخری سەدەی چوارەمی پێش زایین شەرێک لە مابەینی داریوشی سێهەم و ئەسکەندەری مەقدونی دەس پێکرا و حکومەتی هەخامەنشی لە بەین چوو. ئاتروپات لە زەمانی داریوشی سێهەم ئاخرین پادشای هەخامەنشی فەرمانڕەوای (شهرب)ی مادی پچوک بوو بەلاٚم کابرایێک کە زۆری بەدبەختی بە دەس کوروشەوە دیبوو بە نێوی «ئوکسودات» و خەڵکی (رەی) بوو ئەسکەندەر کردی بە فەرمان رەوای ماد و چونکە نەیتوانی باش کارەکان بەرێوە بەرێ ئەسکەندەر ئەوی لابرد و ئاتروپاتی کردەوە حاکمی ماد ٣٢٨ (پ.ز) چونکە لە کاتی شەرەکەدا یارمەتی داریوشی نەکردبوو. هاوکارێکی دیکە کە ئاتروپات لەگەڵ ئەسکەندر کردی ئەوە بوو کە کابرایێک بە نێوی (باریاکس) کە خۆی بە پادشای فارس و ماد نێو دەبرد دای بە دەس ئەسکەندەرەوە و لە دوای مردنی کوت و پڕی، فەرماندەکانی ئەسکەندەر لە ساڵی ٣٢١ (پ.ز) لە «تری پارادیس» کۆ بوونە، تا ناوچەکانی وڵات بەش‌بەش کەن بەلاٚم ئاتروپات لەو بەش کردنەدا باسی نەبوو لەوەی را رون دەبێتەوە کە مادی پچوک لەوکاتەدا سەربەخۆ و سەربەست بوە و لە باشووری رۆژئاوای گۆلی ورمێوە هەتا چۆمی ئاراس و دەربەندی خەزەر و قەزوین و زەنگان و موکریان و برێک لە خاکی بابان و سۆران تا بەرزایێکانی چیاکانی هەکاریش حکومەتی مادی بچوک دامەزراو بوو کە لە پێشیشدا مادی پچوکیان پێ‌دەکوت و ئەو حکومەتە تا زەمانی ئەشکی شەشەم مابوو بەلاٚم مێهرداد لە بەینی برد. ئەسکەندەر، مادی گەورەی بە سێ کەس لە سەردارانی لەشکری‌دا بە نێو کلئاندر و منید و سیتالک.

# پەراوێزەکانی بەشی هەوەڵ:

ئیبراهیم دێهخودا نوسیویە: ئیبراهیم ناوێک پێغەمبەرێکە لە نەتەوە و رەگەزی سامی کور نوح و نێوی بابی تارخ یا تراح یا ئازەرە و خەڵکی کەلدە بوە لە رۆژهەڵاتی بابل لە دێی ئور لە دەور و بەری ساڵی (٢٠٠٠ پ. ز) هاتوەتە دنیاوە و دیسان نوسیویە:(زەردەشتی گەورە، زروان گەورە و زرهون) ئەم سێ نێوە لە نێوەکانی حەزرەتی ئیبراهیمە و وشەیێکی پەهلەوییە و لە فەرهەنگدا زەردەشت بە مانای نوری موجەردە. زەردەشتی دوهەم بە قەولی فردوسی بە نۆ پشت بە زەردەشتی گەورە دەگاکە کوتویە:

نهم پشت زردشت پیشین بدوی    براهیم پیغمبر راست گوی

و حافظ دەڵێ:

به باغ تازه کن آیین دین زردشتی    کنون که لاله بر افروخت آتش نمرود

و لە پەراوێزی (حاشیەی) محی‌الدینی عەرەبی‌دا لە سەر تەفسیری خازن نوسراوە: ئیبراهیم خەڵکی کۆیەی عێراقە و لە نیزیک رانیە ئاوری بۆکراوەتەوە و محمد ابو زهره لە کتێبی خاتم النبیین نوسیویە (ئیبراهیم لە شام لە ناوچەیێکی ئاودرِ لە دێیەک بە نێوی بەرزە لە داوێن کێوێک بە نێوی قایسوان لە دایک بوە) و دەگونجێ بەرزە هەر ئەم بارزانە نێودارەی ئەمرۆ بوو بێ. تەهمورسی کوردی ئیلامی نوسیویە مسعودی لە مروج الذهب دا دەڵێ: ئێرانیانی قەدیم بە هۆی رێزگرتن لە ماڵی کەعبە و باپیریان حەزرەتی ئیبراهیم دەچون بۆ زیارەتی کەعبە و بە دەوری دادەگەران و ئاخرین کەسێک لەوان کە چووە زیارەتی کەعبە ساسانی کوری بابەک باپیری ئەردەشیر بابەکان دامەزرێنەری زنجیرەی پادشایان ساسانی بوو و لە تاریخی تەبەری‌دا لە زمانی ابن عەباسەوە دەگێرنەوە کە کوتویە ئیبراهیم کاتێک لە ئاور و کۆسپە هەڵات زمانی سریانی (کوردی) بوو لە نیزیک حەران (کوردستان) لە فرات پەریەوە خودا زمانی ئەوی گۆرِی و کردی بە عیبرانی و ئەوەیش هۆی کورد بونی ئیبراهیمە چوون کوس و حران بەشی لە کوردستانن و محمد بهاءالدین مەلا ساحیب نوسیویە لە حاشیەی (کشف الغمه)دا: نوسراوە ئەوەی خستیە نێو ئاورە کەوە پیاوێک بو هاونژاد و زمانی خۆی لە کوردەکان و لە تەفسیری ابن کەسیردا نوسیویە:

«و جعلوا ابراهیم علیه السلام فی کفة المنجنیق باشارة رجل من اعراب فارس، من الاکراد قال شعیب الجبائی اسمه هیزن»

لە تەفسیری «بیضاوی»دا لە سورەی ئەنبیا دەڵێ ئەوەی ئاگرەکەی بۆ کردەوە بەلای هێندێک کەسەوە نمرود بوە و ابن عەباس و زمخشری نوسیویانە یەکەم کەسێک لە پێغەمبەران بە عەرەبی قسەی کردوە ئیسماعیلی کوری ئیبراهیم بوە ئەویش لە هۆزی (نبی جرهم) کە لە

نیزیک ئاوی زمزم بون فێری عەرەبی بوە و اخبار الطوال نوسیویە نمرود کە ئێرانیان فەرەیدونی پێ دەڵێن لە ئاخری پادشایەتی خۆیدا زوڵم و زۆری دەس پێکرد و بۆ ئەوە حکومەتی لە بەین نەچێ حەوت کەسی لە تایفەی خۆی هەڵبژارد و کارە گرینگەکانی بە ئەواندا کە ئازەر بابی ئیبراهیم یەکێ لەوان بوە.

دێهخودا و احسان نوری دەڵێن: عەقیدەی زەردەشتیان ئەوەیەکە مەهاباد زەردەشتی هەوەڵە و هوشەنگ کە ئاوری دۆزیەوە زەردەشتی دوهەم و زەردەشتی سێهەم نێوی ئیبراهیم بوە لە زەمانی حکومەتی کوسیەکان و ئەوەکە نمرود خۆی بە خودا زانیوە و ئەبەدی، بۆ هەرمانی جەمشید رون دەبێتەوەکە نمرودەکان لە پادشایانی کاسی یانی لە زنجیرەی جەمشید بوون لە پادشایانی پێشدادی کورد بون و لەو ئایەتە موبارەکەکە «ماکان ابراهیم یهودیاً و لا نصرانیاً» دەردەکەوێ کە ئیبراهیم لە نژادی سامی نیە.

اخبار الطوالی تەرجمەی دوکتور مەحمودی مەهدەوی چاپی تاران ساڵی ۱۳۶۶ نوسیویە: کاتێك خودا شەداد و قەومی عادی نابودکرد پایەی حکومەتی زەحاك سست بوو و نژاد و نەتەوەی ارفخشد کوری سام کوری نوح بە دژی ئەو هەستان و لەوکاتەدا نەخۆشی وەبا زۆری لە سپا و لەشکری زەحاکی لە بەین برد و زەحاك بۆ مەحکەم و قایم کردنی حکومەتی خۆی چوو بۆ لای برای خۆی غانم کوری علوان و ئەولاد. روڵەکانی ارفخشد لە چوونی ئەو بۆ لای براکەی دەرفەتیان هێنا و مروڤێکیان نارد بۆ لای نمرودی کوڕی کەنعان کوڕی جەمشید شا و ئەویش هات بۆ لایان و خەڵکیش کردیان بە پادشا و ئەویش لە بابل تەواوی خزم و قەومی زەحاکی لە بەین برد. کاتێکی زەحاك ئەوەی زانی هاتە شەڕی نمرود بەڵام زەحاك بریندار و ئەسیر بوو و نمرود ئەوی خستە غاری دەماوەند و درگای غارەکەی بەست. نمرودکەسێکە کە ئێرانیان پێی دەڵێن فەرەیدون و لە دوای چەند دێر دەڵێ: نمرودی کوڕی کەنعان ئەو فرعەونەیە کە هاو عەسری حەزرەتی ئیبراهیم بوە و لە ئەولادی جەمشید شا و کوڕی مامی ئازەری کوڕی تارح بابی ئیبراهیمە لەم نوسراوەدا روون دەبێتەوە کە حەزرەتی ئیبراهیم و فەریدون (نمرود) خزم یەك بوون و کورد.

دێهخودا دەڵێ: نمرود نازناوی پادشایانی سریانی بوە و فرعەونیان نازناوی پادشایانی قبطی بوە و قیصر و قیاصرە نازناوی رومیان بوە و مەرکەز و جێگای زاراوەی سریانی باکووری عێراق (بین‌النهرین) شاری ادسایە و لە کتێبی ئیسلامی‌دا (الرها) نوسراوە و ئەمرۆ «اورفا»ی پێ دەڵێن.

هەوەڵێن پادشای ئاشور کە بۆ وڵاتی ماد لەشکری هێنا تیکلات پیسلری هەوەڵ بوو کە لە دەور و بەری ساڵی (۱۱۰۰ پ.ز) زەمانی ژیانی زەردەشت بوو نێوی لە ماد و ناوچەیان نا چونکە هێشتا نازناوی مادیان نەبوو وا دەردەکەوێ کە لە نزیك بە ئاخری (۹۰۰ پ.ز.)

خەڵکی ئەو وڵاتەی رۆژئاوای ئێران بە ماد نێو براون و وشەی ماد بۆ هەوەڵین جار لەکەتیبەی شلم نصری دوهەم هاتوە و نێوی زاگروس لە نێوی هۆزێکی مادی سەگەرنە وەرگیراوە.«ایران نامک لاپەرەی ٢١١ و ٢٩٣»

حسین حوزنی نوسیویە: زەردەشت لە خاکی موکریان لە شاری سەردەشت هاتوەتە دنیاوە و پیرنیا دەڵێ ئەوێستا بە زمانی ماد بوەکە زمانی کوردی ئەمرۆیە.

و مامۆستا قانیع کوتویە:

کتێبی زەردەشت کە ئەوێستایە — وەک باقی کتێب خەڵاتی خوایە
بە زمان هەورامی هاتە سەر بەشەر — یانیهای زەردەشت بوو بە پێغەمبەر

لە یەک رەوایەتی پەهلەوی‌دا نوسراوەکە: «... زەردەشت لە سی ساڵەیدا چاوی بە ئاهورامەزداکەوت و هەوەڵین جار لە ئێران ویج، لە ئازەربایجان بو». لەم باسانەوە رون دەبێتەوەکە سێ کەس لە پێغەمبەران کورد بوون حەزرەتی نوح و ئیبراهیم و زەردەشت.

٣) لە دەور و بەری نێوەراستی دەورانی حکومەتی ساسانی وشەی توران بە تەواوی گۆڕاو بوو بە «تورکان» ئێران نامەک لە لاپەرەی (٢٥٥) نوسیویە لە دوای لە بەین چوونی حکومەتی کوشانیان لە رۆژ هەڵات بە دەستی شاپوری هەوەڵ، تورکان بۆ لای باکوری خۆرهەڵات رێیان بۆکراوە لە سەرچاوەکانی چینی‌دا هاتوە توکیو شاخەیێک لە هون بون و لە ناوچەی ئاڵتای دەژیان ئەوانە لە ساڵی ٤٣٣ میلادی‌دا بە هۆی زەختی ئیمپەراتوری زنجیرەی «تویا»ی چین هاتن بۆ لای ژوانەکان و لە وانیان ئیتاعەت کرد و دەڵێن زەمانێکی لەکەنارکێوێکی کە وەک کڵاوخود بوو نێشتەجێ بون لەوکاتەدا نێویان نرا تورک چونکە ئەوان لە زمانی خۆیاندا ـ بە کڵاو خودیان دەکوت تورکو / دورکو و لە دواییدا ئەو نێوە بۆ تەواوی قەومی تورک زمان بەکار هێنرا و چونکە تورکان هەر لەو جێ و رێیەی توران (سکایان)ەوە دەهاتن بۆ ئێران بۆ شەڕ لەگەڵ ئەنەوشیران و هەم بە هۆی وێکچوونی وشەی تور و تور ـ ک ئەو دو قەومە بە یەکێک ناسران و ئەو هەڵەگەورەیە لە نێو کتێب و چیرۆکی ئێرانی‌دا رێی کردەوەکە فردەوسی دەڵێ:

یکی پهلوان بود شیروی نام — دلیر و سر افراز و جوینده کام
بیامد ز ترکان چو یک یک لخت کوه — شدند از نهیبش دلیران ستوه

حەکیم عمر خیام لە نەورۆزنامەی خۆیدا نوسیویە فەرەیدونی کورد ئەو رۆژەی کە زوحاکی ئەسیر کرد ئێرانی لە شەری ئەو رزگاریان بوو ئەو رۆژەیان کرد بە جەژن.

«موریە» سەد و پەنجا ساڵ لە مەو پێش نوسیویە لە رۆژی ٣١ اوت دانیشتوانی دەماوەند بۆ بیرەوەری رزگاری ئێران لە زوڵمی زوحاک جەژنیان گرتوە و ئەو جەژنەیان «جەژنی کوردی» نێو ناوە ئەم مەبەستە نیشان دەداکە میللەتی ئیران لە زەمانی جەمشید و زوحاکەوە کورد

بوون و دەماوەندیەکان زانیویانە باو و باپیریان کورد بون، و ئەو جەژنەیان لە وانەوە وەدەس کەوتوە پێیان کوتوە «جەژنی کورد». (سەرلەشکر مظفر زنگنە لە دودمان ئاریایی لە لاپەرەی ٥٦ و ٤٨ احسان نوری.)

٤) گیمیل سین لە زنجیرە پادشایانی ئور (سەدەی ٢٢ پ.ز) ناوچەی عێراقی ئەمرۆ و ئێران و تورکیەی دادەست فەرمان رەوایێک بە نێوی وردنەر و لیکولینەوەی رۆژهەلات ناسان بەو نەتیجەگەیوە کە ناوی کردو لە هەزارەی سێهەمی (پ.ز.) نێوی ئەو ناوچانە بوە و لە دواییدا یونانیان بەو ولاتەیان کوتوە (کردوئن) و ئەم وشە نە سومری و نە ئاشورییە بەلکو وشەیێکی ئاریاییە و لە مێژووی ئەرمەنیداکردو خۆی نێو براوە کە ئاخری وشە کە نیشانەی جەمعە و وێ دەچێ لە زەمانی مادەکاندا نێوی ناوچەکە بوو بێتە نێو بۆ خەلکی ولاتەکە. گزنفون پێی کوتون کردوک. کوردستان لە ئاخری حکومەتی سەلجوقی لە سالی (٥٩٠م)دا بە ولاتی مابەینی ئازەربایجان و خوزستان دەکوترا. (عەلی ئەسغەری شەمیم لاپەرەی ٢٩ و ئیران نامک لاپەرەی ٢٤٢).

٥) ئاشوریان: قەومێکن لە نژادی سامی نیشتەجێی بابل و ئاسور رب‌النوعی یان بوە و کتێبی ئێران نامەک لاپەرەی ٢١ نوسیویە هەوەلین پادشای ئەوان تیکلات پیلسر هەوەل بوە و لەوکاتەدا نێوێک لە ماد نەبوە دەولەتێکی چکۆلەیان لە سەدەی (١٨و١٥پ.ز) ساز کرد و پێ تەختی ئەوان لە ئاخریدا نەینوا بوە و وردە وردە بۆتە حکومەتێکی گەورە لە لایێکەوە تا مصر و لە لایێکی دیکەوە تا خاکی ئێران و ئەرمەنستان بەربلاو بوە و ماد و پارس بونە دەس نیشاندەی ئەو و ئیلامی کاول کرد و لە دوای چەند سەدە، ماد تێکی شکاندن و لە (٦١٦پ.ز) دەولەتی ئاشور لە بەین چوو.

حکومەتی سومری: نیزیک بە چوار هەزار سال پێش زایین لە کێوەکانی باکورەوە هۆزی ئەوان هاتونەتە بەینە نەهرەین و لەوێ نیشتەجێ بوون و زۆربەی مێژوونوسان براویان وایە هەوەلین قەومێک بون کە چونە سەرزەمینی بابل و لەوێ نیشتەجێ بون.

اکد: لە باکووری رۆژهەلاتی سومرەوە سارگین دەولەتی (اکد)ی پێک هێنا و سومریشی گرت و ئیلامی تالان کرد بەلام لەوکاتەداگوتی کە لە رۆژهەلاتی زابی گچکە حکومەتیان پێک هێنابوو باشور و باکوری بابل و سومر و اکدیان خستە ژێر دەسەلاتی خۆیان و لە (٢٥٠٠پ.ز) سومر زیندوو بوەوە و قودرەتیان گرتە دەس و لە سالی ٢٢٨ بە دەستی ئیلام لە بەین چوو.

سومر خەتی میخی یان بۆ هەوەلین جار بەدی هێنا و دابەش کردنی ساعەت بە ٦٠ دەقیقە و دەقیقە بە ٦٠ سانییە و سال بە ١٢ مانگ و ٣٦٥ رۆژکاریی ئەوانە

دەولەتی بابل: حەمورابی زنجیرەی پادشایانی ئاموری ١٥ نەفەر بون کە شەشەمینی

ئەوان حەمورابی بو کە (٢١٢٣تا٢٠٨٠پ.ز) پادشایی کرد و قانونی پێک هێنا کە کۆنترین قانونێکە کە ئەمڕۆ لە دەس دایە و چەندین سەدە لە پێش شەریعەتی موسادابوە.
حکومەتی ئاشور: ئاشوری قەومێکی سامی بون کە لە بابل دابوون دوای بەینێک چوون بۆ دەوروبەری دەجلە و کێوەکانی و حکومەتێکی چکۆلەیان سازکرد نێوی (ربالنوع)یان لێ نا یانی ئاشور و هەوەڵ جار شاری ئاشوریان کردە پێتەخت و دوایی شاری کالا. کە لە تەوارتدا (کالح)ە جێی نمرود بووە پێتەخت و لە ئاکامدا نەینەوا نزیک موصلی ئەمڕۆ بوە ناوەند و جێی پادشایانی ئاشور.
دەوڵەتی کۆنی ئاشور: (٩٠٠ـ١٥٠٠پ.ز) بە دەستوری ئاشوربانی پاڵ تەواوی باسی شەر و شۆر و مەبەستەکانی زەمان لە ساڵنامەدا نوسرا و لەو زەمانەدا قەومی ئارامی لە عەرەبستانەوە هاتنە دەور و بەری بابل و ئاشوریان گرت (١٣٠٠ـ١٥٠٠پ.ز) و بونە هۆی لە بەین چوونی حکومەتی ئاشور.
حکومەتی ئاشوری نیوەراست: لە (٩٠٠تا٧٤٥پ.ز) دەوامی بو و گەورەترین پادشایان ئاشور نەسیر پاڵ (٨٦٠تا٨٨٤) و زۆر زاڵم و بێ‌ڕوحم بوە کە ئەسیری ژن ومنداڵیشی لە ئاوردا دەسوتاند و ئەو دەوڵەتە بە قودرەتە بە پێکهاتنی حکومەتی ئارارات تووشی شکست و لێک بلاّو بون هاتن.
دەوڵەتی ئاشوری تازە لە (٧٤٥تا٦٠٧پ.ز) هاتە سەرکار و پێشەوای شۆڕش تیگلات پیلسر چوارەم بوو، بوە حاکم و ئارامی وکەلدانی لە بابل تیکشکاند و شەر لەگەڵ ئیلام دەس پێ کرا و حکومەتی ئیلام لە بەین چوو. (ایران باستان دکتر جواد مشکور).
٦) دهخدا و ابن ئەسیر نوسیویانە کورد لە فارس و خوزستان بۆ پێشگیری لە هەڵمەتی عەرەب لە زەمانی ئومەویان و زەمانی حەجاجدا بە سەر تەواوی ولاّتی فارسدا دەسەلاّتیان پەیدا کرد بوو و کوردانی فارس و خوزستان و لورستان پێشی لەشکری ئومەوی و عەبباسییان گرت و عەرەبیان وەزاڵە هێنابوو.
و استخری نوسیویە زیاتر لە سەد تایفەی کورد لە ناوچەی فارسدا هەن و زۆرتر لە پێنسەد ماڵی موبینیان هەیە و بۆ ئەوەی بزانین خەڵکی خراسان و مازندران، خوزستان و بلوچستان زۆری کوردن کتیبی ابنُ ئەسیر و مەسالکُ الممالکُ و دهخدا و معجم البلدان نوسراوەی یاقوتی حەمەوی وکتێبی حدود العالم وتاریخ ایران سرجان ملکم و هتد پێویستە تەماشا کەین.
بەرابەری لیکۆلینەوەی سر سیدانی اسمیت لە سەدەی (١٨و١٩پ.ز) هۆزی هیتیت سوریەی گرتە دەست و بابلی تالاّن کرد و هەوەڵین قەوم لە هێند و ئاریا بە نێوی «اومان یا ماندا» لە دوای یەکگرتن لەگەڵ هۆزی ماد و سیت، لەکەناری رۆژهەلاّتی دەریای رەش نیشتەجێ بوون. تایفەیێک لەوان بە نێوی میتانی حکومەتیان ساز کرد و تەواوی کوردستانی ئەو رۆژەیان

تا کەرکوک و ئەربیل گرت و لە سەر بابل، فەرمان رەوابوون و هەر لەو زەمانەدا تیرەیێک بە نێوی گالّبات بە سەر ئاشوردا فەرمان رەواییان دەکرد و لە سەدەی (١٤پ.ز) قەومێکی تازە لە کەناری رۆژئاوای دەجلەوە تا شاخەکانی ئارارات (جودی) حکومەتیان پێک هێنا و ئەو هۆزە رومیەکان پێیان دەکوتن خالدیان یا خالدیوی.

و لە سەدەی (١١پ.ز) کوردستان کەوتە دەست موشەکیان کە رۆمی پێیان دەڵێن موشوری و تا دەریاچەی وان حکومەتیان بوو. و لە سەدەی (١٣پ.ز) قەومێکی تازە بە نێوی پاپهی نێویان دەرکرد و هێندێک کەس پێیان کوتون کورد و برێکیش پێیان کوتون گوتی و ئاسار و سەنەد و بەڵگەی سەدەی (٩و٨و٧پ.ز) ئاشور، مەڵبەند و ناوچە سیاسی کوردستانی بە تەواوی دیاری کردوە و لەو کاتەدا کۆچەری دیکە لە قەومی هێندو ئاریا لە رۆژهەڵات و دەور و بەری دەریای خەزەرەوە بۆ لای باکوور، و رۆژ ئاوا هاتون بە نێوی ماد کە شلما ناسر پێنجەم (٨٢٣ـ٨١٠پ.ز) نێویان دێنێ.

احسان نوری نوسیویە هرودوت دەڵێ لە دەوربەری ئارارات قەومی ئالاّ رود نیشتەجێ بوو و (هالدی)یان دەپەرست و ٦٠٠ ساڵ پ.ز ئەرمەنی هاتن و خاکی ئالارودیان گرتە دەست و دینی ئەوانیان قەبوڵ کرد و ئەو ناوچەیان داگیر کرد نێویان نا (هایستان) مسعودی چەند تایفە و قەومی کورد نێو دەبات و ئەوان بە نژادی کوردی کوری ئەسفەندیاری کوڕی منوچهر پیشدادی دەژمیرێ بەڵام احسان نوری پاشا دەڵێ پادشاهانی ئێران لە نژادی کوردن بەم جۆرە:

کەیومەرسیان، لەگوتیکان،
جەمشید، لەکوسی، کاستێکان
فەرەیدون و نەوە و نەتیجەی لە ئارات وماننا و مادەکان
مادەکان لەکوسیکان
هخامنشیکان، لەکوسیکان
پهلویان، لە پارت، پرثوکان
ساسانیان لە شەبانکارە

هەمو ئەم تایفە و قەومانە لە نێو جەماوەری گەلی کوردی ئەمڕۆدا دەبینرێ ماد و پارس دو تایفە لە یەک نژادن و لە زەمانی ئەردەشیر دوهەم هەخامەنشی ماد و پارس لە زمانی یەکتر حاڵی دەبون.

ئەرمەنستان: ناوچەیێکە لە ئاسیای رۆژئاوا و لە باکوورەوە پەڕی دەبێتە گورجستان و لە رۆژ ئاواوە دەگاتە دەرەی فوراتی رۆژئاوا و ئێستا لە دەس سێ دەوڵەتی روس و تورکیە و ئێران دایە. ئەرمەنی زۆرتر گوێ بە فەرمانی ئاشور بوون، تا دەوڵەتی ماد نەینەوای ژێر و روکرد و ئاشور بۆ هەمیشە (٦٠٦پ.ز) ناو و نیشانی حکومەتی نەما و ئەرمەنستان بە ئاسانی کەوتە دەست

مادە کان.

دیاکۆ: کوڕی پێشەوایماننایی کە لەگەڵ ئوردوی ئارارات شالاویان بردە سەر باشور بە دەست پادشای ئاشور ئەسیر کرا و بو سوریە دو رو خراو لە دواییدا بە یارمەتی مادە کانی باکوری سوریە هەلات هاتەوە ولاتی خۆی و حکومەتی مادی پێکهێنا و لە سالی (٧٠٥پ.ز) لە سەرتەختی دەولەتی ماد دانیشت. (احسان نوری)

ئیران نامک لە لاپەڕەی (٢٣٦تا ٢٤٠) نوسیویە لە سەرەتای پادشایی داریوش‌دا، خەلکی پرثوە بە هۆی پەیوەندی قەومی ـ مادی و دینی ـ زەردەشتی بە دژی داریوش و باوکی کە فەرمان‌رەوای ئەو ولاتە بوو شۆڕشیان کرد و سەرکوت کران. بەلام لە کاتێکدا ئەرشک فەرمان‌رەوای سلوکی کوشت ئەو خەلکە لە دەوری کۆبونەوە و پایەی حکومەتی تازەی ئەشکانی لەو ولاتە داغریژرا.

ارشک: وا دەر دەکەوی کە لە (٢٤٧پ.ز) لە شاری نیسایە لە مابەینی پرثوە و رگانە تاجی لە سەرنابێ و وشەی پەهلوان لە وشەی پرثوە پەهلوە وەرگیراوە.

سێرجون مالکم لە کتێبی تاریخی پارس جلد دوهەم لاپەڕەی ٦٥تا ٦١ نوسیویە ئەو عەشایرەی لە ولاتی فارس، کرمان، عێراق و کوردستان نیشتەجێن بەلگەی قەدیمی بونیان زمانی ئەوانە کە زاراوەی پەهلەوییە و بە هۆی بلاوبونەوەیان زاراوە کانیان زۆری فەرق کردوە.

لە زەمانی حکومەتی ماد بەم لاوە بە جۆرێکی رەسمی دەورانی تاریخی پیێ‌دەلێن و سالنامەی ئاشوری کەتیبە کانی هیتی و ئورارتی و ئەسناد بابلی و هەخامنشی و یونان و ئاساری بینراوە تا رادەیێک فەرهەنگی ئێمە رون دەکەنەوە هۆزە کانی هێند و ئوروپایی، بەو ئینسانانە دەکوترێ کە لە زەمانی زۆر کۆندا هەمویان بە یەک زمان قسە و گوفت وگۆیان کردوە و لە سەر زەمینێکی بەربلاو فەرهەنگ و داب و نەریتێکیان بوە و بەوانە بۆیە دەلین (هیند و ئوروپایی) چونکە چەندین جار کۆچ و کۆچ‌باریان لە چەندین سەدەدا بوە.ولە تیکلاو بونیان لەگەل خەلکی خۆجێیی ناوچە تازە کان نەتەوەی زۆر پەیدا بوون کە لە رۆژهەلاتدا هیندوستانیان گرتە دەس و لە رۆژئاواوە بە ئوروپادا بلاو بونەوە و نیشتەجێ بون و دوای دوزینەوەی ئەمریکا گەیشتنە ئەوێش بەلام هەر ئەو نازناوەیان هەیە و دەبێ ئەوە بزانین نیسبەتی ئەعەم و ئەخەسی موتلەقەیان بە ئاریایی دەکرێ بلێین هیندو ئوروپایی بەلام بە هەموو هێندو ئوروپایی ناکرێ بلێین هەمو ئاریایین. (ئیران نامک).

زمانی ئاریایی رون نیە کە چ جۆرە زمانێک بوە چونکە ئاسەوارێک کە بە زمانی ئاریایی نوسرابێ لە دەستدا نیە و کتێبی پیرۆزی هیندی دەلێ خوێندن و نوسین لە سالی (١٤٠٠پ.ز) دەس پێکراوە و لە پێش ئەوەدا نەبوە ئەو کتێبانەی کە لە دوای دەورەی ساسانی نوسراون نیشان دەدەن کە زمانی پەهلەوی ریشە و سەرچاوەی زمانی کوردییە، ملتبرون نوسیویە زمانی کۆنی

ئارایی زەند و پەهلەوییەکە زەند شەرحی ئەوێستایە و وادەر دەکەوێ کە رێزمان و رێنووسی ئەو دو زمانە لە یەک دەچن و شەریکن تێیدا.

لە زمانی سەکایی چەن وشەیێک لە مەجوعمەیێکی زێوین کە لە خەزێنەی زیویەی لای سەقز دیتراوەتەوە وەبەر چاو دەکەوێ و تا ئەمرۆش نە خوێندراوەتە بەڵام دیاکونوف پێی وایە لەگەڵ زمانی ماد خزمایەتی بوە و فردەوسی لە هیچ کوێی شانامەدا لەکاتی گفت وگۆی ئێرانیان لەگەڵ تورانیان (سکایی) ئاماژە بە پێویستی وەرگێر (مترجم) نەکردوە بەڵام لەکاتی قسەکردن لە گەڵ نەتەوەیتر وەکوو چینیان بۆوێنە باسی وەرگێر دەکاکە دەڵێ:

یکی نامداری ز لشکر بجست     که گفتار ایران بداند درست

لەوەیرا رون دەبێتەوەکە سکایی و ماد بە تەواوی لە زمانی یەکتر حاڵی بون و زمانیان یەک بوە. (ئیران نامەک لاپەڕەی ١٣٣).

وشەی ئاریا بۆ خەڵکی ناوچەی ئاریایەکانی باشوری فارس بەکار دەبرا تا زەمانی هوخشتەرەی ماد (٦٠٠پ.ز) کە نێو نرا پارسە و ئاریاییکانی باکور وشەی مادیان بۆ خۆیان لە بەر چاو گرت. (ئیران نامەک لاپەڕەی ٢٢٠).

ئیران نامەک لاپەڕەی ١٦٥ دەڵێ لە پێش پەیدا بوونی زەردەشت دا تەواوی خەڵکی ئێران دێوپەرست بون و زەردەشت بە جارێک بیر و باوەڕی ئەوانی ژێر و ڕۆکرد و ئاهورامەزدای بەوان ناساند.

پروفسور مینورسکی لە بیستەمین کونگرەی نیونەتەوەیی رۆژهەڵات ناسان کە لە ساڵی (١٩٣٨م) لە بروکسل پێتەختی بلژیکدا پێک هات لە بارەی نژادی کوردەوە کوتویە بە پێی بەڵگە دەبێ قەبول کرێ کە تەنیاکوردان لە مادی گجکەن کە ئاتروپاتن یا ئازەربایجانی ئەمرۆیە و بە وڵاتاندا بڵاو بونەوە (مقدمەی شەرفنامەی عباسی).

لە پێش شکڵ گرتنی چەند هۆزێک لە ماد زمانی قەبیلەیی لە حکومەتی ئەواندا رەواجی بوە و زمانی ماد یەکێک لە زمانانە بوە. هەموو دەزانین هیچ کام لە قەوم و هۆزانەی خاوەرمیانە یا ناوچەی دیکە بە زمانێک کە پێشینیەکانی خۆیان چەند هەزار ساڵ لە مەوپێش قسەیان پێ کردوە گفت وگو ناکەن، چونکە هەر زمانێک لە حاڵی گۆڕان دایە و روو بە رەوانی و ساکاری دەروا بۆ وێنە زمانی باستانی میسر جێی خۆی بە قبطی و دوایی بە یونانی و بە عەرەبی داوە و سەرەرای ئەوەش خەڵکی ئەو وڵاتە لە بەین نەچوون و لە وڵاتی خۆشیان دەر نەکراون و هەر واماون و لە عێراق زمانی (سومری) و (هوریانی) جێی خۆی بە ئاشوری، بابلی و اکدی و ئارامی و عەرەبی داوە و گۆڕانیش بە سەر زمانەکانی وڵاتی مادیشدا هاتوە بەڵام گۆڕینی زمان هیچ کاتێک بە مانای گۆڕان و لە بەین چوونی خەڵکی نیشتەجێی ئەو وڵاتانە نەبوە و نیە هەر بەم پێیە روون دەبێتەوە میللەتێک کە زەمانێک بە زمانی دیکە قسەیان کردوە تەواو جێنشینی

رابردوانی باستانی و قەدیمی نژادی خویانن و میراتگری میرات و فەرهەنگی قەومی پیشوویانن. (تاریخ ماد).

٩) ئەشکی هەوڵ: (استرابون) دەڵێ مروڤێکی سەکایی بوو لە تیرەی پارتی لە دەوڵەتی سلوکی (جێنشینانی ئەسکەندەر) راپەڕی و ناوی خۆی نا شا و لە (٢٥٠پ.ز) دەوڵەتی ئەشکانی پێکهێنا، وشەی پارت وێ دەچێ لە پرثوەی بێ کە لە بەردە نوسراوەکانی داریوش‌دا هەیە کە لە دوایی‌دا گۆڕابوو بە پەهلو زمانی پەهلوی و پەهلو یا پەهلە، پارت، پرثوە، پهلوانی، زمانی دەورەی ئەشکانیان و ساسانیان بوە. ئەعلامی تورکی نوسیویە پەهلەوی زمانێکی کۆنی ئێرانییە و لە راستیدا وڵاتی میدیا (خاکی ماد) بەو زمانە گفت و گۆیان بوە و برێک مێژوونوس پێیان وایە (ئەشک) خەڵکی رۆژئاوا بوە [کوردستان] و هێندێک کەسیش دەڵێن لە ئەولادی کاوسی کوری کەیقوبادی کەیانییە و چەند کەس لایان وایە لە نژادی بەهمەنی کوری ئەسفەندیارە. پارت لە ریشەی (پارتەکانە) و هرودوت دەڵێ یەکێک لە شەش تایفەی مادە و ٢٨ کەس لەوان نزیکە (٥٠٠سال) پادشایەتییان کردوە تا سالی ٢٢٠ میلادی کە اردوان دوایین پادشای ئەشکانی لە مەیدانی شەردا لەگەڵ ئەردشیر بابەکان‌دا کوژرا و حکومەتیان سەرنخون بوو و دەوڵەتی ساسانی هاتە سەرکار و ٤٠٠ ساڵ حکومەتیان کرد تا دوایین پادشای ئەوان «یزدگرد سوم» کە لە سالی (٦٥٣م / ٣٥ ه.ق) بە هاتنی لەشکری عەرەب لە بەین چوو.

زەرادەشت: ناصر خسرو دەڵێ:

گردن از بار طمع لاغر و باریک شود این نوشتست زرادشت سخندان در زند

زەردەشت نێوی مروڤێکە لە تایفەی مەنوچهر شاگردی ئەفلاتونی حەکیم کە شاگردی فیساغورس بوە و لە زەمانی گشتاسب ئیدعای پێغەمبەری کرد و زەند تەفسیری ئەوێستا و ئەوێستا کتێبی زەردەشتە و فردەوسی پێی وایە کە زەردەشت لە نژادی حەزرەتی ئیبراهیمە و نێوی (ئەبراهام)ە و زەدەشت نازناویەتی هەر وەکوو حەزرەتی ئیبراهیم ناوی «ئەپراهام» و زەردەشت نازناوی بوە کە دەڵێ:

نهم پور زردشت پیشین بود و براهیم پیغمبر راستگو

و مانای تەرکیبی ئەو (زەردەشت) یانی کەسێک کە زێڕ لای ئەو جێی رێز نیە لە فەرهەنگدا زەردەشت بە مانای نوری موجەرەدە.

و دهخدا دەڵێ زەردەشتێکی دیکە بوە خەڵکی ئەردەبێل دوای زەردەشت ئیسفەنتومان کە ئاورپەرستی لەوەوە بەدی هاتوە و بە دار و دەستەی خۆی کوتوە کە موی بناگوێ خۆیان بهێڵنەوە تا بناسرێنەوە و لەو روەوە پێیان کوتراوە موی گوش و معرەبی ئەو وشە بوتە مەجوس.

# زەردەشت و ئەوێستا

لە سەرزەوینی ئێرانی باستان لەکەناری زرێچەی ورمێ زەردەشت لە زەمانی گشتاسب پادشای کەیانی لە هەوەڵی هەزارەی چوارەم هاتوەتە دنیاوە بابی (پورشست) بە دوازدە پشت دەگاتەوە مەنوچێهر کوڕی ئیرەج کوڕی فەرەیدونی کورد لە پادشایانی پێشدادی و دایکی «دغدو» هەر لەو تایفەیە. زەردەشت یەکێ لە روحانێکانی ودایی کە ریشییان پێدەکوتن و کتێبی ئاسمانی ئەو ئەوستایە کە کتێبی زەند شەرحی‌یەتی و پازەندیش شەرحی زەندە.

# ئەحکامی دینی زردەشت

سەد باب بوو، کە شاعیر دەڵێ

زرادشت بنگر چه دین پرور است
کـه در شـهر علمش رد از صد درست

ئەوێستا تاریفی «اهورمزدا» دەکا و «ئەهریمەن» بە رەوانی پیس دەناسی، و باسی ئەخلاقی، دینی، داستانی، نەتەوەیی و زەردەشتی و چەند مەبەستی دیکەیش دەکا و لە ساڵی سیهەم(٣٠)ی پادشایی گشتاسب، زەردەشت ئەم کتێبەی کە هشتاد و سێ هەزار وشە بوو لە سەر دوازدە هەزار پیستی گایدا بە خەتی زیرین نووسرابوو دای بەگشتاسب و شا دینی ئەوی قەبول کرد.

ئەرکان و پایەی دینی زەردەشت ئەم سێ مەبەستەیە: بیری چاک، کردەوەی چاک، وتاری چاك و باسی بەهەشت و جەهەننەم لەو دینەدا ئاشکرایە و دەڵێ سەرکەوتویی بۆکەسێکە کە راست بێ.

# موعجیزەی زەردەشت

یەکێ لەو کارانە: ئاور بەرزین بوە «ئازر بەرزین» ئەوە نێوە بۆ ئاتەشکەدەی شەشەم لە حەوت ئاتەشکەدەی ئێران، کە کاتێك کەیخسرو سواری ئەسب بوو شریخەیێکی بیست، زوو خۆی فڕێدا خوارێ ئەو ئاورەکەوتە سەرزین، و زین ئاوری گرت و نەیان هێشت بکوژێتەوە و کردیانە ئاتەشکەدە کە دایمە بە بێ دەستەچیلە و دار داییسا وکارێکی دیکەی ئەوە بوو ئاوری لە سەر دەستی دادەنا ئێشی پێ نەدەگەیشت و نەدەسوتا فردوسی دەڵێ :

یکی آذری ساخت برزین به نام　　　که با فرهی بود و با رای و کام

مسعودی سەعد دەڵێ:

در دل و در دیدهٔ من سال و ماه　　　آذر برزین بود و روز گنگ

# کۆچ کردنی زەردەشت (هجرت)

لەکاتێکی زەردەشت بوو بە پێغەمبەر روحانی و مروڤە ئایینیەکانی ودایی لە دژی هەستان ناچار بوو، بۆ کوردستانی هەورامان و سنە کوچ بکا و لە سەر کێوی (ئاویدەر) دوبارە ئیلهامی پێ کرا و لەوێشەوە کۆچی کرد چوە کێوەکانی هوگر لەکەناری جەیحون‌شەهر کە لە رۆژ هەلاتی کوردستان و باکووری رۆژهەلاتی کرماشانە و ئەوکێوە ئەمڕۆ پێی دەڵێن کێوی هُجر و لەوێ سێهەمین ئیلهامی پێکراوە و ئەو مەلبەندە ئێستاکە پێی دەڵێن دین‌ئاوەر، و جەیحون شەهر، و بە جەیحون‌ئاباد تا ئەمڕۆ نێوی ماوەتەوە و پادشای ئەو شارە گشتاسب بوەکە پیێ‌تەختەکەی دژێک بوە بە نێوی «کنگ شە» کە ئەمرۆکە «کنگرشە»ی پێ‌دەڵێن و لە چەند کیلومتری ديناوەرە و چەند ئاتەشکەدەی دروست کرد و چونکە گشتاسب دینی زەردەشتی بڕەو پێ‌دا، ئەرجاسب پادشای توران هاتە شەڕی و بە دەستی ئەسفەندیاری کوڕی گشتاسب بریندار بوو و مرد و زەردەشت خوێ و زۆربەی لایەنگرانی کوژران و ئاتەشکەدەیش ویران کران و ئەوانەی توانیان دەرباز بن هەلاتن بۆ رۆژهەلاتی ئێران و لە دەورو بەری خوراسانی ئەمڕۆ جێ گیر بوون (و بە قەومی پارت نێو بران) پارت وێ دەچێ لە پرسوە بێ کە لە بەردە نوسراوەکانی داریوش‌دا هەیە و لە دواییدا گۆڕا بوو بە پەهلو و ئەوانە لایەنگری زەردەشت بوون.

بەلام نێوی ئەو جێیانە و ئەو شتانەکە لە نیشتمانی هەوەڵ جێی شانازی بوو بۆیان، بۆ یادگار و دلخوشی، کردیانە نێو بۆ زۆر جێگەی ولاتە تازەکەیان و لە دوای چەند سەدە ناو و نیشانی ولاتەکونەکەیان لە بیر نەما و لەگەڵی بیگانە بوون (وەکوو ئەمڕۆی موکریان نێوی ئەسلی زۆر لە دێهات و شار و کێو و چۆمی لە بیر خەڵک چونەتەوە و نێوی تورکی لە لایان مەغولەکان، عوسمانیەکان و سەفەویەکان و ترکەرەشە بە سەریان داسەپاوە ماونەتەوە.

لە دوای ماوەیێکی زۆر دینی زەردەشت لە رۆژهەلاتی ئێران پەرەی سەند قەومە پارتیەکان کە زەردەشتی بوون زنجیرەی پادشایی ئەشکانییان دامەزراند و ئەوێستایان رێک‌وپێک کرد. بەلام مێژونوسەکان چۆن ئاگایان لە نێو و داب و نەریت و شاخ و داخی نیشتمانی هەوەڵی ئەو قەومە کە سەدان ساڵ پێش بۆ ئەو سەرزەوینە کۆچیان کردوە نەبوە هەرچی لەبارەی ئەو هۆز و قەومە، زانیویانە بە نێوی سەر زەوینی دوایی نوسیویانە و بوەتە هۆی

ئەو ئەفسانەکە زەردەشت لە رۆژئاواوە چوە بۆ رۆژهەلاّت و لە «بەلخ» وکەناری چۆمی جەیحون پێغەمبەری کردوە سەرەرای ئەوە ئەو نێو و ئەو ئاسەوارە لە رۆژ ئاوای ئێران دابوە و مرۆڤی ئەم نیشتمانە دەماو دەم (سینە بە سینە) هەزاران ساڵ نێوی ئەوکێو و شاخ و دەشت و روبار و جێگاگرینگ و بەرێزانەیان لە دەس نەداوەو لە بیریان نەکردون تاگەیوەتە دەس ئێمە وەکوو هەزاران وشەی دیکە.

## دەقی کتێبی: گەرانەوە لە ئێران (گزنفون) جفری هاوس هولد

کتێبی گەڕانەوەی (گزنفۆن)ی لە ئێران نوسیوەتەوە و دوکتور مەنوچێهری ئەمیری وەریگێراوەتە سەر فارسی و ئەمە پاڵاوتەیەتی بە کوردی: کاتێکی سپای ئێمە یۆنانێکان بە سەرکردایەتی خئری سوفوس لە کێوەکان هاتینە خوارێ دوبارە خۆمان لە دەجلە چاو پێ کەوت لەم روەوە تەنیا رێی لە پێش‌مان بو ڕێگەی باکور بو کە دەبو لە ناوچەی کوردەواریەوە تێپەر بین و چەند یەخسیرمان لە گەڵ بوو کوتیان **ئەم کوردانە زۆر شەرانین لە شەردا ئازا و بویرن هەر چنگ و پەلێکیان عزرائیلێ کە و لە گیان کێشاندا زۆر بە پەلەن شا سەد و بیست هەزار سەربازی نارده شەریان هەمو کوژران**[1] جا لە بەر ئەوە وامان بە باش زانی لە پێش ئەوەیدا کوردەکان بزانن و بەرگریمان لێ بکەن دەبێ زوو بە شەو بروێن خۆ بگەینینە ئەرمەنستان بەلام ژمارەیێکی کەم لە کوردەکان شەونخون هێرشیان کردە سەرمان جا، بۆمان رون بووە ئەگەر زوو بیانزانیبایە زورتریان کۆدەبونەوە و نیوێکی لەشکری ئێمەیان تارومار دەکرد و کە شەوداهات لە دوڵ و شیوێکدا ماینەوە و چادرمان هەڵدابوو بەلام هەر لەوێ زووتر بینرابوین چونکە لە دەورەی ئێمە ولە سەر کێوەکان کوردەکان چاویان بریبوە ئێمە و ئاوریان کردبوەوە و ئەوکاتە کەمێ بە گژ یەکدا چوین بەلام رۆژێکی دیکە باییکی توندی هات بەلام چونکە ئێمە خواردەمەنیمان کەم پێ مابوو لە هیچ کوێ نەماینەوە و کوردەکان لە هەرلاوە تیریان تێ‌هەڵدەکردین و ئێمەیش ورده ورده رێی خۆمان دەکردەوە دەرۆیشتین.

ئەمن زوزو کەسیکم دەنارد بۆ لای خئری‌سوفوس کە لە پێش لەشکرەوە دەرۆیی و پەیامم دەدایێ کە سەرەوخوار بڕوا و ئەویش یەک دو جار رای گەیاندکە لە شالاو بۆ سەر کوردەکان دەبێ دەس هەڵگرین و زو سەرکەوین بەلام لەوگیرۆدارەدا دوان لە سەربازە چاکەکانم کوژران یەکێکیان ئەسپارتی بوو کە تیری دوژمن لە سپەر و نیم تەنەی چەرمینی رەد ببوو و ئەوی دیکە کابرایێک بو ئارکادیایی کە تیر کلاوە ئاسنەکەی شکاندبوو و لە سەری چەقی بوو.

**لە تەواوی ژیانمدا شتی عەجایب تر لە کەمانداری کوردم نەدی**

---

١ - روون نیە ئەو پادشایە کە لە گەڵ کوردەکان شەری کردوە نێوی چ بوە و وادیارەو گومان دەکرێ کە داریوشی دوهەم بوو (ایران باستان چاپی هەوەڵ ١٠٦٩).

شەرکەرێکی کورد خەریکی تیر هاویشتنە

کەمانیان نزیک بە مترو نیوێ درێژ بوو و وادیار بوو کە تیرە کانیان مترێک دریژی بێ و لە بەر قورسی هەڵگرتنیان بۆ ئێمە سەخت و دژوار بوو لە شەڕێک‌دا کە لە گەڵ ئەوانم کردبوو دو مرۆڤم لێیان ئەسیر کردبوو و بە خێری‌سوفوس پێشنیار کرد لە بارەی رێگاوە پرسیاریان لێ بکا تا بۆمان روون بێتەوە کە دەبێ لە کوێوە برۆین یەخسیری هەوەڵ هەر چەند زۆرمان ترساندبوو کوتی بێجگە لەم رێگایە رێگەی دیکە نیە جا لە بەر ئەوە لە بەر چاو هاوریکەی بە شیر جنیمان و هاورێکەی کە ئەوی دی زوو کوتی رێگەیێکی دیکە لەم نزیکانەیە زۆر بە ئاسانی کاروان لێی تێپەر دەبن بەڵام هاورێی چارەڕەشی من چونکەماڵی کچ و زاواکەی لەو شوێنە بوو راستی نەکوت تا تەرمەکی لێرە فرێدرا. لێم پرسی چ گیر و گرفتێک لە و رێیەدا هەیە لە باسەکانی بۆم روون بۆوە کە تەپۆڵکەیێک لەوێ هەیە لە پێش هەمو شتیکدا دەبێ ئەوێ بگرین دەنا هیچ هومێدی رزگار بوونی سوپا نیە جا لە بەر ئەوە هەمو سەرپەلەکان‌مان کۆ کردنەوە و ئەوەی پێویست بوو کوتمان و ویستمان چەند کەس داوخواز بن بۆ ئەوەی کە هەڵمەت بەرنە سەر سەنگەری کوردەکان چەند کەس کە لە پێشدا لە شەڕدا دلێری و بە جەرگییان لە خۆیان نیشان دابوو دوای کەمێک نان خواردن لە گەڵ دو هەزار کەس حازر و ئامادەی هێرش بردن بوون،

شەو داهات بارانیکی بە تەوژم دایکرد منیش لە دوای لەشکرەوە رۆییم تا دوژمن لەو جێگە بڵیندانە وەدەرنێین بەڵام ئەوە فێڵێ بوو بۆ ئەوە کە سەرگەرمیان کەین تا نەزانن ئەوە دو هەزار سەربازی نەبەز لە ناکاو هەڵدەکوتنە سەریان بە چەکی سوک و قورس و گران و لەو کاتەدا کوردەکان بە تلاندنەوەی تەختە بەردی گەورە خەریک بوون کە قورسایی بڕێک لەوان بە چەند خەلوار دەگەیی.

ئەو بەردانە کە دەهاتنە خوارێ وە بەردی دەور و بەری خۆیان دەکەوتن ،کەسێک بیدیبایێ وای دەزانی دوژمن بە قۆچەقانی بەردبارانمان دەکەن و لەو کاتەدا زۆر نیگەرانی کاری کوردان بووین تا شەو داهات گەڕاینەوە نێو ئۆردوگاکەمان بە درێژایی شەو دوژمن خەریکی تلاوتل پێ کردنی بەرد بون و هەمومان جوان دەنگ و هارەی ئەو بەردانەمان دەبیست کە دەکەوتنە خوارێ لەت و پەت دەبون. لە لایێکی دیکەوە ئەو سوپایەی کە ناردبوومان دژێکیان لەکوردەکان گرتبوو. یونانیەکان پێیان وابوو کاری کوردان تەواو بووە بەڵام کە رۆژ بۆوە زانییان

کە کوردەکان دەس بەردارنین دەیانهەوێ لەشکری یۆنان تێک بشکێنن بەڵام خۆشبەختی ئێمە لەوەدا بوو کەتەم و مژ هەموو ناوچەکەی داگرتبوو و سوپای ئێمە توانیان وردە وردە خۆیان لە کوردەکان نزیک کەنەوە لەناکاو هەڵکوتنە سەریان. لەو کاتەدا شەپوریان لێدا تا ئێمە کە لێیان دوور بووین لە کاری ئەوان ئاگاداربین جا رژان بە سەر سەنگەری دوژمندا و بلیندایی شاخەکەیان پێ بە جێ هێشتن. سەربازی ئێمە لە خۆشیان کە ئەوەیان زانی یەک جێ نێزەیان تەکان دا و یەکتریان هان دەدا کە دەس دەنە چەک وەک پڵینگی زەرد و بەردان بە چنگی پولایین بدەن لە کوردان ئەمن لە دوای لەشکرەوە لەگەڵ باروبنە لەو جێگەوە کە رێگەیان کردبوەوە وەرێ کەوتم لەم کاتەدا کوردەکان لە بیری ئەوەدا بوون کە لە دەرفەتێکدا هێرش بێنن بۆمان بە پێویستم زانی سەرتەپەکەکەی لە پێشماندا بوو زوو بیگرین. تا خۆمان لە شەڕ و گیروداری کوردان نەجات دەین. لە کاتێکدا ئاخرین تەپەمان گرت کەمێکی مابوو رێگەی نەجات و رزگاری مان لێ بەستری دوژمن لە هەر لاییکەوە دەرفەتی بوایە گەمارۆیان دەداین و لە دوند و ترۆپکی شاخەکان بەردیان بۆ لای ئێمە تلارەوە دەکرد و کردیانە گوڕە و هەراو و هوریا و سەربازێک کە پاریزەر و **قەڵغان هەڵگرم بوو هەڵات و کەمێکی مابوو تاشە بەردێک بە سەرمدا بکەوێ و چەکدارێکی ئارکادیایی کە نێوی ئێورولوخوس بوو وە فریام کەوت و منی بە قەڵغانەکەی خۆی پاراست** و کوردەکان پێشدەستیان دەکرد و رێی دەرچوون و تێپەربونمانیان یەک لە دوای یەک دەگرت و ئێمە چارە و دەرەتانمان نەبوو تەنیا ئەوە نەبێ لە لاپاڵ و تەنیشتەوە هێرشمان دەبرد و رێگەی خۆمان دەکردەوە و کاتێکی خثری سوفوس لەگەڵ دوژمن روبەرو دەبوو من و سوپای خۆم بە کێودا هەڵ دەکشاین وەلای سەرویان دەکەوتین و دوژمنمان رادەدا و خثری‌سوفوس هەر بەوجورە بە یارمەتی منەوە دەهات کاتێکی من دەورە دەدرام و زۆر لە سەرپەلەکان و چەک بەدەستانی بە جەرگ و زۆرزان و بە زیپک بەو جورە یاریدەی یەکتریان دەدا و خۆیان رەپێش دەخست. ئێمە چەک و قەڵغانی قورسمان پێ بوو لەگەڵ ئەوەیش بۆ سەرکەوتن لە شاخان دەستێکی کەممان لە کوردان نەبوو هەرچەند چەک و شت‌ومەکی ئەوان تەنیا تیر و کەوان و قۆچەقانی بوو بەڵام لە کاتی هەڵاتندا هیچ کات دەستمان پێیان نەدەگەیی و کەمان‌داری ئێمە کە ئستراتوکلس سەرپەلیان بوو کارێکیان لە دەست نەدەهات لە ئاکامدا لە خەزەڵوەر لە کاتی گەڵارێزاندا چاوم بە چۆمی کنتریتس کەوت و نەفەسێکی ئاسودەییم کێشاو چونکە کەل وپەل و نان و پێخورێکی باش و زۆرمان پێ بوو شەومان بە خۆشی و باشی بە قسەکردن و **بیستن لە بارەی کوردانەوە گوزەراند حەوت رۆژ بوو هەر شەرمان دەکرد و بەلا و دەرد و ئازار و رەنج و کوشتارێک کە لەم رێگەدا دیمان زۆر زیاتر لە کوشتار و مەترسی و سامداری ئەو شەرانە بوو کە لەگەڵ ئەردەشیر و تیسافرن تووشی بووین**

# ٢- زمان

زمان لە زەمانی زۆر کۆنەوە چەند فەیلەسوف و زانای وەک ئەفلاتون و ئەرەستوو تا ئەمڕۆ بە خۆیەوە خەریک کردوە و لێکۆڵینەوەیێکی زۆر لە ڕێگای جۆراجۆر لە بارەی مەنتیق و فەڵسەفە و بیر و باوەر و فقه اللغه و ئەجزای پێک هێنانی گفت وگۆ، پێک هاتوە، و شاخ و بەرگێکی زۆری لێ پەیدا بوە، وەکو: **ڕەوانشناسی زمان، جامعەشناسی زمان، عەسەبشناسی زمان، زمانشناسی، مرۆڤشناسی، زمان ناسینی رایانە (کامپیوتر)، زمانناسی ریاضی، موهەندیسی ئیرتباتات.**

**زمان چیە؟** زمان ڕەوشتێکی کومەڵایەتیە و مەبەست لەو ئاگاداری خەڵکە لە دڵ و دەرونی یەکتری و پێک هاتنی پێوەند لە مابەینیاندا.

## دو شکڵی زمان

زمان دو شکڵی هەیە (کوترا و نوسراوە) شێوەی کوتراوی بریەتیە لە لەرزینی دەنگ کە لە هەوا دا بڵاو دەبێتەوە و شکڵی نوسراوەی بریەتیە لە جێگیر کردن و زەبتی روی دیکەی(کوتراو)بە قەلەم کە بمێنێتەوە. دایمە شکڵی (نوسراوە) لە شکڵی (کوتراوە)ڕێزی زیاترە (١) بەڵام لە عیلمی زمانناسیدا ئەوی بە زمان دەکوترێ قەدر و قیمەتی لە نوسراوە زۆرترە.

## زمانی نمونە

دەبێ هەمو میللەتێک لە روی بەڵگە و قاعدەوە بتوانێ بە ئاسانی وشەکان بە زمان بڵێ و دەنگی گرو نالەباری نەبێ و دەبێ دەنگی پیتەکانی جۆریک بێ بۆ هەموو کەسێک بێ لەنگە کوتنیان ڕەوان بێ و زوو لە بەر کرێ و ئاهەنگی مۆسیقی ببێ، تا ببێتە هۆی شۆر و شەوق وزەوقی گرانیبێژو نوسەر و شاعیر و هونەرمەند.دەبێ پێش بە هێرشی زمانی زۆردار و ئیستعمار بگرێ و دەبێ عیلمی بێ.

١ـ عیلم دەیەوێ زمان سادە بێ و پێچ و پێچاندنی تێدانەبێ.
٢ـ لە رێی قانون و دەستوری کورت وکەمەوە رێک و پێک و دامەزراو بێ و وشە و مانای نادیاری تیدا نەبێ.
٣ـ هۆش و بیر و را لە قسەکردن دا تووشی دڵەکوتە نەکا.
٤ـ کوتن و نوسینی خەرجی زۆر هەڵنەگرێ و بەکەمترین وتار زۆرترین مەبەست راگەیندرێ.
٥ـ وشەی رەسەن و ئەسڵ بێ کە رو بەکەماڵی جوانی بێ و بەرە و زمان تیژی و پاراوی بروا و دەبێ ئەوەی بلیم کە وەرگێرانی مەبەستی عیلمی و ئابوری و سەنعەت و پیشەی

جۆراوجۆر لە زمانی ئینگلیسی و ئالمانی و روسی و فەرانسە و چەند زمانی دیکە بە کوردی دەبێتە هۆی پشکوتن و پێشکەوتنی ئەم زمانە.

# ئەندامی قسە و باس

**سەداو ئاوا** ئەگەر لەرزینێکی توند لە سەر شتێکی پەیدا بێ و ببێتە هۆی فشار لە سەر مولکولی هەوا و جێبەجێ بوونی ئەوان دەنگ پێک دێ کەوا بوو دەنگ بە راستی ئەمواجی هەوایە کە پەردەی گوێ دەلەرزێنی و بە مێشک دەگا و لە ئاکامدا دەنگ دەبیسرێ.

**ئاوا** لە روانگە و دیدی **فیزیکە** وە شەپۆڵ و لەرزینی جۆراجۆرە بە هۆی زەختێک کەلە سەر هەوایێک کەلە سیپەلاک (جەرگی سپی) دیتەدەرێ و لە گەرودا لە تارەکانی دەنگ دەکەوێ و لە ئاکامی بزوتنەوەی ئەو تارانە دەنگ بەدی دێ و دەنگی ناسک یاگڕ پێوەندی لە گەڵ رادەی فشاری هەوا هەیە لێرە روون دەبێتەوە کە سەر چاوەی دەنگ هەوایێکە کەلە سیپەلاکەوە و لە رێی گەروەوە دەگاتە حەنجەرە و لەوێ لە گەڵ تاری دەنگ لێک دەکەون و دوای تیپەرین لە تاری دەنگەکان دەگاتە زار لە زاردا بە هۆی هەلسوڕانی زمان و لێو و چەنە دەنگی جیا جیا پێک دێ جا لەم باسەدا دەردەکەوێ کە ئەندامی گفتوگۆ بریەتین لە: سی، گەرو، حەنجەرە، زار، زمان، ددان، لێو، کەوا بوو قسە کردن و بیستن لە گەڵ برێک لە مەبەستەکانی فیزیکی و فیزیولۆژی تیکەڵە و (ئاوا) دەنگ لە گەڵ زمان پێوەندی هەیە و لە رێی گوێچکەوە وەردەگیردرێ.

## هیجا

بریتیە لەرێز بوونی لەت لەتی دەنگ وەک حەلقەی زنجیر کە لەکاتی قسە کردن دا، دەگاتە گوێ.

## واج

دەنگ و زەمزەمەیێکە کە بە چکۆڵەترین ئەجزای زمان دەناسرێ کە لە رێک و پێکی و تێکەڵاوی ئەوان وشە و رستە پێک دێ بۆ وێنە (د + ە + س + ت = دەست) واج چکۆڵەترین واحدی وشە و وتارە و پیت چکۆڵەترین واحدی نوسراوەیە لێرەدا رون دەبێتەوە کە پیت (حرف) روێکی نوسراوەی واجە و لە هەمو جێیێک پیت و واج یەک نین بۆ وینە ضامن و ظاهر و زمان و ذلیل «ض»، «ظ»، «ز»، «ذ» چوار پیتن و یەک واج. بە سەر و ژێر و بۆر دەڵێن واج بەلام پیتیان پێ ناڵین. (ئاوا) دەبێ لە پێش (واج)دا بناسرێ چونکە لە پێش ناسینیاندا ناکرێ نەزم و تەرتیب لە بەینی ئەواندا پێک بێ.

# الفبای زمانی کوردی:

| پیتی کوردی | پیتی لاتینی |
|---|---|
| ا | A |
| ب | B |
| پ | P |
| ت | T |
| ج | C |
| چ | Ç |
| ح | H |
| ه | H |
| خ | X |
| د | D |
| ر، ڕ | R |
| ز | Z |
| ژ | J |
| س | S |
| ش | Š |
| ف | F |

| پیتی کوردی | پیتی لاتینی |
|---|---|
| ڤ | V |
| ق | Q |
| ك | K |
| گ | G |
| ل، ڵ | L |
| غ | X |
| م | M |
| ن | N |
| و | W |
| وو (دریژ) | Û |
| ۆ | O |
| و (کورت) | U |
| ی | Y |
| ي ، ی (دریژ) | î |
| ێ (کراوه) | ê |
| ە، ه | E |

# پیتی دەنگ‌دار (بزوێن)

دەنگێکە کە لە گەرودا بە یارمەتی لەرزینی تارە کانی دەنگ بە بێ ئەوەی بە بەربەندێ بەر خوردکا یا لە تەنگنایێکەوە رەد بێ و بە دەوری خۆیدا بمالدری و یا رێی رۆینی خۆی بگۆڕی و دەنگێکی تر پێک‌بێنێ بەدی دێ. موسەوت لە زمانی کوردیدا، ئەمانەن و ژمارەیان حەوتە کە دەبنە هۆی شوێن کردن و بزواندن و ئاشکرا و ئاسانی پیتی دیکە وەک رۆشن بوون و بزوتنی موتوری ماشین کە دەبێتە هۆی بزوتنی چەرخە کان.ئەو پیتانە ئەمانەن:

١ـ ا:A ٢ـ و: U ٣ـ ۆ: O ٤ـ و: U

٥ـ ی: î ٦ـ ێ: e ٧ـ ە: E

لە دەنگدا دوان لە ئەمانە لە حینجەی (ـَ و ـُ) سەر و بۆری عەرەبی دەچن یە کیان (ە، ە) یە کە دەنگی سەر (ـَ) دەدا E و ئەوی دیکە واوی کورتە کە دەنگی بۆر (ـُ) دەدا (و کورت U) بەلاّم لە کوردیدا پیتێک یا دەنگێ کە لە (ـِ) ژێر بچێ نیە بۆ وێنە میمی (مِن)ی کوردی وەک میمی (من)ی عەرەبی ناخوێندرێتەوە و دەنگی نایێ.

# پیتی بێ دەنگ

نێوی دەستەیێک لە دەنگی وت و وێژە کە لە دوای رەد بوون لە تارە کانی دەنگ لە مابەینی گەرو و لێودا وە پەرژینێک دە کەوێ یا بە زۆر و فشار لە تەنگنایێکەوە رەد دەبێ یارێی روینی خۆی دە گۆڕێ و لە ئاکامدا دەنگێکی تازەی لێ‌زیاد دەبێ و ئەو دەنگە سامت یا هەمخوانی پێ‌دەڵێن و ئەلف و بێ هەمووی سامتن جگە لە پیتە دەنگ دارە کان (بزوێنە کان) کە باسیان کرا ئەو سێ پیتە موسەوتە (و)، (ا)، (ی).

# زمان‌ناسی تەوسیفی و مێژوویی

ئە گەر زمان‌ناس بە دوای تایبەتێکانی یە ک زمان لە زەمانی دیاری کراو دابوو بە بێ ئەوەی تەماشای رابردوی ئەوکا پێی دەڵێن زمان ناسی تەوسیفی و ئە گەر شاخ و بەرگی ئەو زمانە لە چومەڵی دور و درێژی پڕ پێچی زەمانەدا هۆشی بدرێتێ و لێی بکۆڵدرێتەوە ئەوە موتالاّی تاریخی زمانە.

# ئەسڵی زمان

لەکاتێکدا دو کەس لەگەڵ یەکدا وت و وێژ دەکەن لە هەوەڵەوە لە مێشکی یەکێک لەواندا مانا و زاندراوێک ئامادە دەبێ و مەغز ئەو مانایەکە لەگەڵ تەسەوری دەنگێک کە پێوەندی لەگەڵ دەنگی زمان هەیە بەو جێگاو جوزئانەکە دەنگ ساز دەکەن را دەگەیێنێ و بە دوایاندا شەپۆلی دەنگ لە زار دێتەدەرێ و بە گوێی خەڵک دەگا بەم پێیە روون دەبێتەوەکە زمان حەڵقەی بەینی مانا و وشە و رستەیە و ئەو عونسر و ماکەی کە لە پەیوەندی وشە و مانا بە دەس دێ نیشانەی پێدەڵین و نشانە وەک سکەیێک دورووە یەکێک وشەیە و ئەوی دیش مانایە. نیشانە چەند جۆرە.

١ـ نیشانەی تەسویری وەک عەکس کە دەلالەت لە سەر ساحیبی عەکس دەکات.

٢ـ نیشانەی تەبیعی وەک کۆخەکە دەلالەت لە سەر سینگی ئینسان دەکا.

٣ـ نیشانەی عەقڵی جا یا بە هۆی عیلم بە مەعلوم پەیدا دەبێ وەک ئەوە.

کە بە شەو ئاور دەبینرێ دەزاندرێ کە لەوێ دوو کەل هەیە و ئەوە بەڵگەی (لمی) پێدەڵێن یا بە هۆی مەعلول عیلم بە بەلگە پەیدا دەبێ وەک دیتنی دوکەڵ کە دەبێتە هۆی عیلم بە ئاور و ئەوە پێی دەڵین بەڵگەی (انی).

٤ـ نیشانەی وەزعی لە مابەینی دو روی سکەیێک وشە پیوەندی هەیە و ئەو پێوەندییە لە مابەینی سورەت و مانادا بە هۆی رێکەوتن و قەرار دادێ خەڵکی ناوچەیێک بۆ ئەوەکە مەبەستی خۆیان بە یەکتر راگەیێنن وەک ئالای سپی کە نیشانەی ئاشتییە و نیشانەکانی راهنمایی و راننددگی و دەلالەتی وشە لە سەر مانا وەک وشەی هەڵو بۆ ئەو باڵندەی تیژباڵە. پایەی هەر زمانێک لە دنیادا و لە ناوچەکاندا دەلالەت و نیشانەی وەزعی و قەراردادییە.

# پێوەندی زمان لەگەڵ علوم

زمان ئامێری راگەیاندنی بیر و باوەر و مانایە و چونکە هۆی ئەو راگەیاندنە، دەنگەکانی زمانە و ئەو دەنگانە لە حوکمی کەرەسە دان، جا زمان لەوانە، لە روی داب و دەستوری تایبەت و بو راگەیاندنی مانا قاڵبی دەنگیان بۆساز دەکا لەم روەوە روون دەبێتەوەکە زمانناسی بریتیە لە: دەستور و رێزمان و قاعدە و مانا و ئاوا (دەنگ) ناسین. بە پێوستی دەزانم ئیشارەیێک بە دو بەشی نەزەری و عەمەلی عیلمی زمان بکرێ.

## نەزەری

زمان لە لایێکەوە بۆ بەرهەم و دەسکەوتی پێویستی بە فیزیک، فیزیولۆژی، بافت‌ناسی، عەسەبناسی هەیە و پێوندیان لەگەڵ پەیدا دەکا و لە لایێکی دیکەوە چونکە زمان هۆی جیابونەوەی ئینسان لە حەیواناتە لەگەڵ چەند عیلمی‌ترکە ئینسان سەرەتایانە (موضوع) وەکوو فەلسەفە، مەنتق، تاریخ، هونەر و ئەدەبیات، رەوان‌ناسی، کومەڵ‌ناسین مرۆڤ‌ناسین پێوەند و نزیکییان هەیە.

## بەشی عەمەلی

وەکوو فێرکردنی زمان، وشە دروست‌کردن، و فەرهەنگ نوسین.

## پەیدا بوونی خەت

کۆن‌ترین هۆی پێک هێنانی پەیوەند لە مابەینی خەڵکی‌دا وتە و وتار و ئیشارە بوو، چونکە دوای ئانێ یا چەند ئان لە بەین دەچن و لە نێو چوارچێوەیێکی زەماندان، بەم پێیە ئینسان کەوتە ئەو بیر و رایەکە بۆ راگەیاندنی مەبەست و وتاری خۆی ئامرازێک سازکاکە مەرزی زەمان و مەکانی نەبێ جا لەو زوەوە دەستیان کرد بە خەت کێشان و شکل دروست کردن تا لەرێی پێشکەوتن‌دا سەرکەوتن. چەند جۆرە خەتیان سازکرد و لە نێو ئەو خەتانەدا کۆن‌ترین خەتی نوسراوەی ئێرانی کە ماوەتەوە خەتی میخییە کە کەتیبەی زەمانی هەخامەنشیانی پێ‌نوسراوەتەوە و ئێرانیان ئەو خەتەیان لە خەڵکی نیشتەجێی بین‌النهرین وەرگرتوە.خەتی پەهلەوی لە خەتی ئارامی وەرگیراوە و ئارامی یەکێک لە زمانەکانی سامییە بەڵام لە دەورەی ساسانیاندا خەتێکیان بەدی هێنا بۆ نوسینی ئەوێستا و بە خەتی ئەوێستایی ناوبانگی دەرکرد، دەبێ بکوترێ کە دوای هاتنی ئەسکەندەر علوم و خەتی یونانی رەواجی پەیدا کرد بە تایبەت لە دەرباری ئەشکانیان و ساسانیان. ئەوە بوە هوێێک کە ئەلفبای پەهلەوی بگۆڕن و وەکوو ئەلف بای یونانی بینوسن.

## خەتی نمونە

دەبێ ئەم تایبەتیانەی ببێ یەک پیتی دوپاتەی تێدانەبێ دوهەم دژواری رێنوس (املاء)ی نەبێ سێهەم هەر پیتێک تایبەتی سەدایێک بێ چوارەم هەرچی دەنوسرێ ئەوە بخوێنرێتەوە پێنجەم هەرچی دەبیسرێ ئەوە بنوسرێ.

## دەسکەوت

داهاتی زمان و خەت بریتییە لە زانینی مێژوی جیهان تا ئەمڕۆ و شارستانییەتی و پەیدا بوون و مانەوەی تەواوی عیلم و سەنعەت و هونەر لە هەر زەمانیکدا تا ئەمڕۆ.

# چاوێک لە مێژووی زمانی کوردی ئەمڕۆ

بزانین ئەم وشە و وتارە، ئەم ئاوە زوڵاڵە لە چ کات و زەمانێکەوە لە چیا و شاخە بڵیندە کانی «زاگرۆس» و «ئارارات»را سەرچاوەی گرتوە و لەم چەند هەزار ساڵی تەمەنیدا چەند سەرەو خوارە و سەرەو ژووری هاتوەتە رێ. هەموو دەزانین کە هەر زمانناسێکی بێ غەرەز و مەرەز دەزانێ کە زمانی کوردی بە درێژایی زەمان بە هێز و تین و توانایی، تا ئەمڕۆ هاتوە و هیچ گیر و گرفت و دژوارێک نەیتوانیوە لاوازی کا یا لە بەینی بەرێ وەکوو لە بەین چونی زمانی نژادی دراوید، سەمود، کاسی و زمانی قبطی (مصری قدیم) و بابلی باستان (سوباریەکان) و چەن زمانیتر. چونکە زمانی گەلێکی بە هێز و نەبەزی ئاریایی مادە، بەگەشی ماوەتەوە، هەر چەندە ئەو خزمەتە کە بە زمانی پیشکەوتووی زۆر لەگەلی جیهان کراوە، بە زمانی کوردی نەکراوە بۆ وینە وەک زمانی عەرەبی کە زیاتر لە هەزار ساڵ زانایانی ئیسلام لە سەراسەری دنیا لێی دەکوڵنەوە و زۆر جار لە زۆر کات و زۆرجێ رێزمانیان بۆ نوسیوە و دەستور و قواعیدی عیلمیان بۆ وەدەس هێناوە بەڵام زمانی کوردی بەپێچەوانە هەزاران ساڵە لە نێو گێژەڵوکە و تەپ و تۆزی سمی ئەسپی داگیرکەر و ئیستعماردا خۆی راگرتوە،ولەم چەرخەشداکە دنیای پێشکەوتنی زانیاری و اعلامیەی جهانی حقوقی بەشەر لە لایان سازمانی نەتەوە یەکگرتوەکانەوە لە بەر چاوگیراوە،کەچی دەوڵەتی تورکیە حاشا لە نزیک بیست میلیون کوردی تورکیە و زمانیان دەکا و پێیان دەڵی تورکی کێوی و رۆژنامەی تورکیە کاریکاتورێکی چاپ کردوە کە لە سەربەردی قەبرێک نوسراوە کوردستانی خەیاڵی لیرە (ئارارات) نێژراوە.

بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو دژوارییە جێی شانازییە کە زۆر لە زمانناسان و زانایانی دنیا رێزیان لە زمانی کوردی گرتوە یەکێک لەوان(فەرید وەجدی)یەکە لە دایرةالمعارفی خۆیدا لە وشە «لوغەت»دا باسی زمانی میللەتانی دنیا دەکا و نێویان دەبا،لە دواییدا هەمویان بە دو بەش دابەشیان دەکا:

١ـ زمانی پێشکەوتوو.

٢ـ زمانی دواکەوتوو و زمانی کوردی لە نێو زمانە پێشکەوتوەکاندا نێو دەبا و دەلیل و بەڵگەی زۆریشی نوسیوە. لە زەمانی پێشوودا زانایانی زمانەوان لێکوڵینەوەیان لە روی یەک

مەبەستەوە بوە کە شکیان لە دروستی ئەودا نەبوە ئەویش ئەوەیە کوتویانە وشە و زمان تەنیا یەک سورەتی دروستی هەیە کەوابو دەبێ باش ئاگاپان لێی بی رێ هەڵە نەکەین دەیانکوت زمان بە دی هاتووی خودایە و بە حەزرەتی ئادەمی فێرکردوە، لەو روانگەوە وشە و رستە موبارەکن و لادان لە ماناکانیان، گوناحە. دەگێرنەوە کابرایێک لە کۆڕێکدا لە لای حەزرەتی پێغەمبەر(ص) قسەی دەکرد و وشەیێکی بە غەلەت خوێندەوە حەزرەت بە ئەوانەی لەوێ بوون فەرموی براتان رێی ون بوە رێنمونی کەن و نوسەرێک لە لایان ئەبوموساوە نامەی بۆ حەزرەتی عومەر نوسی غەڵەتێکی تێدا بوو عومەر نوسی تازیانەیێک لە نوسەرەکە بدەن.

لە نێو هەر نەتەوەیێکدا دەزانین زمانێکی رەسمی و ئەدەبی هەیە پێی دەنوسن و قاعدە و قانونی لە بەر چاو دەگرن و لە پاڵ ئەو زمانە وێژەییە (ئەدەبیەدا) چەند زاراوە هەیە کە زانا و ویژەوان زۆر گوێیان نەداوەتێ و لێیان نەکولێوەتەوە بەلام لەم دواییانەدا زمانناسان پایەی ئەو بیرو رایەی ئەوانەی کە پییان وابو (وشە و زمان تەنیا یەک سورەتی ئەسڵی هەیە) لەرزاندیان و دوای لێکولێنەوەیێکی زۆر بەو ئاکامە گەیشتن کە هیچ یەک لەو زمانانەی کە پێشینیان بە بەڵگە، رەسەنایەتی ئەوانیان سابت دەکرد و قاعدە و بنکەیان بۆ دەنوسی وا نیە بەڵکو ئەوانیش ئەسڵی کیان بوە ئێمە نایناسین، کە وابو ئەم سورەتانەش دەگۆڕێن و ئەگەر کەسێک بیهەوێ ئەوانە لە یەک حاڵدا رابگرێ فکرێکی بێهودەیە و لە لایێکی دیکەوە دەبێ زۆر سەبارەت بە لەهجەکانی دیکەی ئەو زمانە موبالات مان بێ چونکە ئەوانیش شێوەیەکی دیکەی ئەو زمانە کۆنەن بەلام لێرەدا ئەم پرسیارە پێش دێ کە ئایا ئاڵ وگۆڕ لە زماندا بە هەڵکەوت و رێکەوتە یا تابعی دەستور و قاعدەیێکی دیاریکراو و ناسراوە؟ لە ولامدا دەکوترێ ئەگەر لە رێ و شوێنێکی تایبەت و ئوسولێوە نەبوایە زمان و زاراوەکان کە پێوندییان بە ریشەیێکەوەیە دەبوو لە ئەسەری گۆڕان بە تەواوی جیاوازی لە گەڵ یەک پەیداکەن و لە هیچ شوێنێکەوە لە یەکتر نەچن بەلام دەبینین وا نیە بەڵکو هەر زمانێ هەر چەند زەمانێکی زۆر لە ماکی خۆی دورکەوتبێتەوە بە ئاسانی پێوەندی لە گەڵ ماک و رەگەزی خۆی و ئەو زمانانەی دیکە کە لەو رەگەزە جۆی بونەتەوە دەناسرێتەوە. زانایان لە روی ئەم مەبەستە بۆیان روون بوەتەوە کە زمان وەکو زۆربەی سرشت و بەدی هاتوی جیهان، لەرێیەکی دیاری کراو لە حالی ئاڵ وگۆڕ و پێشکەوتن و تەکامول دایە و لەو رێگەدا بە شوێنێکی تایبەت دا دەڕوا و لە رێی رێکەوت یا ئارەزو یا هەڵەی یەک کەس و دو کەسدا نیە بەڵکو وەکوو گۆڕانی مادەیێک بە مادەیێکی دیکە یا گۆڕانی سلولێکی زیندوو لە چونیەتێکەوە بو چونیەتێکی دیکەیە و ئەو ئاڵ وگۆڕە بە هۆی خودی مادە و سلولە کە نیە بەڵکو بەڵگەیێکی بە تینی دیکەی جێ گر شوێنی تێکردون وێ دەچی لێرەدا رەخنە بگیردرێ بڵێن ئەگەر زمان دایمە لە حالی گۆڕان دایە جاکەوابێ مورفولوژی و سیناتکس و فەرهەنگ بۆ چیە؟ لە جوابدا دەڵێین وشە بە گیان دار تەشبیە دەکرێ و مانا روحی ئەوە، لە دایک دەبێ گەورە دەبێ، خۆی سەوزە

پۆش دەکا، گوڵ دەکا شاعیر و نوسەر و ئەویندارکەڵکی لێ وەردەگرن، و لە دایک بونی کاتێکە کە خەڵک وشەیێک بۆ مانایێک قەبول دەکەن و لاوی و گەورە بونی ئەو کاتێکە کە مانای بە جوانی بگەیێنێ، و نەخۆشی ئەو ساتێکە کە مەبەستی خۆی بە باشی نیشان نادا و مردنی زەمانێکە کە ئەو وشە ئەو مانای پێویست نەگەیێنێ و لە سەر زمان قورس بێ و خەڵک بەکاری نەهێنێ و لە لایێکی دیکەشەوە دەڵین زمان لەکات و زەمانێکی زۆر دور و درێژدا، دەگۆڕدرێ و شتێکی وانیەکە لە ماوەی چەند بەرە بابێکدا بێ بەڵکو ئەو گۆڕانە لە مەودای چەند بنەچەکە و چەند سەدە دایە وردەوردە رەنگێکی دیکە دەگرێ و لە پێش ئەوەیدا بە شوێنی ئاخر بگا ناتوانێ بڵێی دڵنیاگوڕانێک پێش هاتوە دەزانین وشەی «بلە» ئیبراهیم بوە بەلام نازانین کەی ئەم وشە لاواز بوە و لەکام ناوچەی کوردستاندا گۆڕاوە.

باسێکی دیکە ئەوەیە کە گۆڕانی هەر زمانێک تاکاتێکە کە نەنوسراوەتەوە و ئاساری ئەدەبی لێ‌ساز نەبوە دوای ئەوە چونکە بۆ هەر وشە و مانایێک و بۆ هەر جۆرە وتارێک نمونەیێکی پتەو و جێ گیر بۆ سەرمەشق و چاو لێ کردن هەیە گۆڕان لەو دا بە ئارامی بەدی دێ.

## چەند وشەی ئەوێستا

ئاسارێکی دیکەکە لەم ماوە دور و درێژەدا لە بەین نەچون وشەکانی ئەوێستایەکە دوای هەزاران سال لە نێو شەپۆلی فەرهەنگ و زمانی بێگانەدا برێکی ماوەتەوە و لە روی مێژوو و ریشەوە دەزاندرێ کە سەر چاوەی زمانی کوردییە بۆ وێنە جەدوەلی پەرەی ٢١٥ کورد و کوردستان پروفسور محمّد امین زکی وەرگێراوی حبیب‌الله تابانی پێویستە تەماشای کرێ:

| کوردی سلیمانی | کوردی کرمانجی | ئەوستا | فارسی ئەمڕۆ(دەری) |
| --- | --- | --- | --- |
| گەورە | مارین | ماز | سنگین |
| بەرز | بەرز | بەرەزا | بلند |
| ماسی | ماسی | ماسیا | ماهی |
| حوشتر | ئوشتر | ئوسترا | شتر |
| پرد | پرت | پەرەتا | پل |
| ڕۆژ | خور | هور | آفتاب |
| بەراز | وراز | ورازا | گراز |
| مێش | مش | مەخشی | مگس |
| بەخ | بەرخ | ورخا | بره |
| ویستن | ویستن | واس | خواستن |
| زانین | زانین | زان | دانستن |
| من | ئەز | ازم | من |
| ئەسب | ئەسب | ئەسپە | اسب |
| ئاشتی | ئاشتبونەوە | ئاخشتی | آشتی |
| مانگ | مانگ | ماونگە | ماه |
| زەوی | زەوی | زیما | زمین |

# زمانی ماد

هرودوت لە زۆر جێگە لە جێی وتەی پارسی مادی نوسیوە و بەڵگەی ڕۆشن و ڕوونە چونکە یونانیان دەیانزانی کەگەلی پارس و ماد لە هەر لایێکەوە تەماشاکرێ دەزاندرێ یەک نژاد و دو نەتەوەن و لە بەر ئەوە مادەکان زۆرتر لە پارسەکان هاتونەتە نێو تاریخەوە جار و بار لە جێی پارس مادیان بەکار بردوە. و دارمستتر ڕۆژهەلاتناسی فەرانسەوی دەڵێ زمانی کوردی شاخەیێک لە زمانی مادە. موشیرالدولە دەڵێ چەندکەسی زانا و زمانناس کوتویانە زمانی گەلی ماد زمانی کوردی ئەمڕۆیە و زمانێکی بناغەیی‌یە.

ملکالشعراء لەکتێبی سەبکشناسی بەرگی هەوەڵ لاپەڕەی ٥دا دەڵێ چەند نەفەر لە زانایان بیرو رایان وایە کە گاتهای «زرتشت» بە زمانی ماد بوە و زمانی کوردی شاخەیێک لە زمانی ئێرانی و جێماوەی مادە و هەر لەو لاپەرەدا نوسیویە زمانی خەڵکی ماد زمانێک بوە کە لەگەڵ زمانی دەورەی دوای خۆی کە زمانی پادشایان هەخامەنشییە جیاوازی نەبوە چونکە ئەگەر زمانی مرۆڤی ماد کە بەشێکی گەورە لە ئێران بوە و گرینگترین و زۆرترین خەڵکی شارەکانی ئەو زەمانە بوون لەگەڵ زمانی فارسی هەخامەنشی تەوفیری بوایە شکی تێدا نیە کە کوروش و داریوش و غەیرە لەکەتیبەی خۆیانداکە بە زمان «فارسی و ئاشوری و ئیلامییە» زمانی مادیشیان لێ زیاد دەکرد تا بەشێکی زۆر لە خەڵکی وڵات لە مانای ئەو نوسراوە بێبەش نەبن.

«دارمستتر» نوسیویە: ئەوێستا لە زەمانی مادەکاندا نوسراوەتەوە و ئەوێستا و زمانی کۆنی مادە و تا زەمانی ساسانیان ئاڵ و گۆڕی زۆری بە سەردا هاتوە و مرۆڤی زەمانی ساسانیان باش لێی حاڵی نەدەبوون لە بەر ئەوە بوو ساسانیان وەریان گێڕا سەر زمانی پەهلەوی و بروایشی وایە کە زمانی کوردی لە زمانی (ماد)ەوە وەرگیراوە.

## نمودارهای ششگانه[1]

میخی ماد

اما حروف الفبای میخی ماد ۴۲ حرف بوده است

| | | |
|---|---|---|
| ۱- | [cuneiform] | اَهُرَمَزْدا (خدا) |
| ۲- | [cuneiform] | خشَیَا (شاه) |
| ۳- | [cuneiform] | دَهْیُو (کشور) |
| ٤- | [cuneiform] | بَغا (خدا - بزرگ) |
| ٥- | [cuneiform] | بومی (سرزمین) |
| ٦- | [cuneiform] | علامت ختم جمله |

سبکشناسی «ملکالشعرا بهار»

۱ - از این نمودارها تنها ختم جمله در زمان داریوش مستعمل بوده است و ما بقی در کتیبه‌های خشایارشاه و جانشینان او دیده شده است. و معلوم نیست آنها قدیمی است یا بعد پیدا شده.

# شوێن دانانی مەڵبەند لە سەر زمان

لە پێش‌دا دەبێ ئەوەی بزانین کە ئەسڵ و بنچینە لە هەر زمانێک‌دا ئەوەیە ئاڵ و گۆڕی نەبێ و نەگۆڕێ چونکە دەلالەتی وشە لە سەرمانا زاتی نیە بەڵکو قەراردادیە وەکوو کوترا نیازی بە فێر بوون هەیە، جا ئەگەر دوای خوێندن بگۆڕدرێ، زەحمەتی خوێندن وکەلاس خۆراییە و خەڵکیش لە یەک حاڵی نابن جاکەوابو بۆ ئەوەکە فایدەی دانانی وشە لە بەرامبەری مانادا و قەراردادی خەلک لەو زەمینەدا بە جێ‌بێ دەبێ دەلالەتی وشە لە سەرمانا لانەدا و نەگۆڕدرێ و راستی ئەوەیە ئەو وشانەی کە لە مانای ئەسڵی خۆیان‌دا بە درێژایی مێژوو ماونەتەوە لە هەر زمانێک‌دا زۆرن وەکو وشە و وتاری ئەوێستا بەردە نوسراوەکان و وتەی پەهلەوی بەلاّم ئەو وشانەی کە مردون، یا سازکراون و لە دایک بوون زۆر زیاترن لە وانەی کە لە مانای ئەسلی دا ماونەتەوە. ئەوە نیشان دەدا کە بەڵگەکانی کۆمەلاّیەتی لەگۆڕانی وشەدا زۆرن. و ئەو شوێنانە وەکوو کوتراوە بە سێ جۆرن:

١ـ لە بەین چونی بڕێک وشە.

٢ـ پەیدا بونی بڕێک وتەی تازە.

٣ـ گۆڕانی مانای بڕێک وشە.

١ـ لە بەین چونی برێک وشە: وەک جگین، بازەڵێن، چەقە، زەنبورە، دۆلاّش، قاورمە، تەوەرە، بەستە، کالە، پوزەوانە، سەڵتە (لباسی فەقێ و مەلا بوو) ربە (وەزن و پەیمانەی گەنم) بەلاّم حەفتا ساڵ لە مەو پێش زۆرباو و لە سەر زمانان بوون، ئەو وشانە پێیان دەڵێن وشەی تاریخی چونکە هەر لە تاریخدا هەن.

گرینگایەتی وشە لە زۆر جێگەی دنیادا بۆ وێنە جادوگەر زۆرجار وابوە وشەگەلیکیان بە زماندا دەهات یا دەیان نوسی مانای نەبوو بەلاّم بروایان وابوو هێز و تین و تاو و قودرەتێک لەو وشانە داهەیە.

لە تەوراتدا دەڵێ: خوداکوتی رۆشنایی ببە بۆ و لە ئینجیلی یوحنا دا: وشە و خودا بە یەکێک حسێب دەکا دەڵێ: «لە هەوەڵەوە وشە بو، وشە لە لای خودا بو، و وشە خودا بو».

شوومی وشە: لە لایان بڕێک نەتەوە بۆ نمونە ژمارەی ١٣، لە لایان خەڵکی ئێرانەوە بەد یومن و شوومە. شاسولەیمانی سەفەوی دایمە نەخۆش بو مونەججیم پێیان‌کوت لە تەئسیری نێوت ئەو نەخوشیەت هەیە نێوی «شاسەفی» بو کردیە «شاە سولەیمان» و دوای گۆڕینی نێوی تاج گوزاری کرد برێک کەس نێوی گورگ و مار و کوندەبوو، ناهێنن دەڵین شومە.

# ئاڵ و گۆڕ لە وشەدا

لە هەر وڵات و مەڵبەندی ئینسان لە حاڵی گۆڕان و پێش‌کەوتنە و ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەکە وشەی تازە بۆ شتی تازە پەیدا بوو، پەیداکا و بێجگە لەوەش ئەو وتانەی کە مردون وادەبی وتەی تازەی لە جێی دادەنرێ و ئەوانەش لە چەند شوێنەوە دەبێ.

١ـ نێونان بە وشەی ئاوەڵناو (صفت) نمونە: کورەی نەوتی، چرابەرق، ئاشی ئاور، کاغەزی کاهی.

٢ـ نێونان بە نسبت: دارچینی، توت فەرەنگی.

٣ـ پێش گر و پاش گر نمونە وەک: سەرین، بەرماڵ، ئەحمەد چوە بەر هەتاو.

وبڕی پاش گر دەچنە سەرناوی سادە و دەیان کەن بە ناوی دارێژراو وەک ئەمانە :

١ـ گەر: وەک ئاسینگەر، مسگەر.

٢ـ دار: وەک گیاندار، دوکاندار.

٣ـ باز: وەک سەرباز، کۆترباز.

# وشەی بێگانە

جارجار بە پێویست دەزانرێ وەرگرتنی وشەی بێگانە بۆ ماناو شتی تازە. هیچ زمانێکی هۆز و قەومی پیشکەوتووی دنیا نیە کە لە وشەیێکی زۆری بێگانە خاڵی بێ و بەڵگە بۆ ئەو مەبەستە ئەوەیە کە شارستانیەتی و پیشکەوتن بە هۆی پەیوەندی میللەتانی دنیا لە گەڵ یەکە، لە وشە و وتاری یەکتر کەڵک وەردە گرن و ئیرادی نیە.

# لیکوڵینەوە لە وشەی بێگانە

بەهۆی ئەوەی کە بڕێک لە زمان‌ناسان دەسیان کردوە بە لێکوڵینەوەی زمانەکانی جۆراوجۆری دنیا بەم ئاکامە گەیون.

١ـ ئالبانی لە ٥١٤٠ وشە زیاتر لە ٤٣٠ وشەی ئەسلی ئالبانی لە باشترین فەرهەنگیاندا نیە و ٤٧١٠ وتە لە زمانی بێگانە وەرگیراون.

٢ـ ئەرمەنی قەدیم. ١٩٤٠ وشە لە فەرهەنگیاندا هەیە لە وانە تەنیا ٤٣٨ وشـەی ریشـەی وشەی ئەرمەنی هەیە و باقیەکەی وتەی بێگانەیە.

٣ـ رومانی لە کتێبی فەرهەنگی باشیاندا (٩٩٠٣) وشـە هـەیە و (٦٣٣٧) وشـە ئـەسل و (٣٥٦٦) وشەی بێگانەیە.

# هۆی وەرگرتنی وشەی بێگانە

وشەکانی بێگانە جاری وایە لە رێی بازرگانییەوە دەچێتە نێو زمانیکی دیکە وشەی واش هەیە حاڵەتی جیهانگەردی و گەراڵی هەیە چونکە لە مەملەکەتێک وەدەر دەکەوێ بە سەراسـەری دنیادا دەگەرێ و لە نێو هەر قەومێکدا یادگاری بە جێ دێڵێ، زیـاتر ئـەو وشـانە دەسکـەوتی کەشاوەرزی و جوتیارییە، بۆ نمونە وەک وشەی شەکر کە شیرەی گیایێکی تایبەتە لە هیندوستان وەدەرکەوتوە دەستی کردوە بە سورانەوە و وەکوو تەنباکو (توتن) کە لە ئەمریکاوە هاتوە و بە دنیادا گەراوە بەڵام ئەم جۆرە وشانە پێوەندیان لەگەڵ شارستانیەتی و فەرهەنگدا هەیە لەوێش بنیادەم بۆی دەردەکەوێ کە وڵاتەکەی لەکام قەوم پێشکەوتن فێربوە و چ بەڵگە و شتێک کاری کردوەتە سەریان.

# پەیدا بونی وشە و بەڵگەکانی

ئەوەش بەم جورەیە : ١) داهاتی سروشتی. ٢) داهاتی سەنعەتی ٣)تەمەدون و فەرهەنگ.

الف) دەس هاتی سروشتی وەکوو شینایی یا دەسکەوتی کشت و کاڵ و مەعدەن ئاشکرایە زۆربەی گیا و گوڵ و دار لە ناوچەیێکی کۆرەی زەوێدا بوە دوایی لە ناوچەکانی دیکەدا بڵاو بوەتەوە، بەڵام نێوی ئەسڵی لەگەڵ خۆی بردوە و لەگەڵ کەمێک گۆران رەواجی پەیداکردوە وەکوو ئەم نێوانەکە لە عەرەبستان نەبوون و لە ئێرانەوە بە نێوەوە چونەتە ئەوێ: نەسرین، سوسن، یاسمین، صنوبر، خردل، بندق، و وەکوو ئەم وشانەکە هاتونەتە ئێران (برنج) وەتەنی ئەسلی ئەو هیندوستانە و چایی لە چینەوە هاتوە لە چینی باکوریدا پێ‌دەڵێن «چا» هـیندوانـە لە وشـەکـە مەعلومە لە هیندەوە هاتوە.

ب) دەس هاتی سەنعەتی: دەسکردی ئینسان لەوجێگای دروست دەکرێ نێوی دەنرێ و بەو نێوەوە دەچێتە زۆربەی مەلبەندی دنیا و لەوێ دەسورێتەوە کەم وایە نێوی بگۆردرێ. بۆ نمونە شتومەکی ماڵ کە لەکوردەواری‌دا رەواجی هـەیە لە ئـەوروپاوە هـاتوە: ئیستکان، گـیلاس، سرویس، سماور، پریموس، پارچ و وشەی مەنجەنیق لە یونانیەوەرا هاتوە.

ئەوەی لە ئەورووپاوە هاتوە ئەوەندە زۆرە کە کتێبێکی لێ دەنوسرێ ئەوە چەند وشەی دیکە لەوانە: اتومبیل، تلفن، تلمبە، ماشین، ترن، تراکتور، تلگراف، رادیو، تلویزیون، گرامافون، کراوات، کت، مانتو، پوتین، نایلون، وال، گریپ، فاستونی....
ج) شارستانی و فەرهەنگ: ئەوانە بریتین لە شتی پێوستی کۆمەڵایەتی، رێ و شوێن و قشلە، دین و مەزهەب. وەکو: بانگ، ژاندارم، پست، کابینە، ئارشیو، بودجە، کمیسیون، کنفرانس، سمینار، سمپوزیوم، ئاجودان، ژنرال، رستوران، کافە، سوپرمارکت و هتد. وشە و وتارێک کە لە گەڵ شارستانیەت و فەرهەنگ لە میللەتی دیکە وەرگیراوە، وەکوو ئاداب و رسومی دینی ئیسلام، زکات، خمس، حج، قبلە، سەلسەبیل، رکوع و هتد.

## عیلم و مەعارف:

شیمی، فیزیک، الکتریستە، هیدرولیک و چەند شتی دیکە وەک ئەمانە گۆڕانی مانای بڕێک لە وشەکان هەوەڵین شتێک کە دەبێتە هۆی گۆڕانی مانا مانای مەجازییە لە دوای بەینێک بێ ئەوەی ئاگاداری لە بارەیدا بێ دەگوڕدرێ نمونە «رکێف» ئەگەر کوترا شاگرد شۆفیر لە سەر رکێف ئوتوبوس راوەستا شتێکی وەک پلەی نێردیوان دێتە زەین بەڵام پەنجا ساڵ لە مەوپێش ئەومانایە نەدەهاتە زەینەوە بەڵکو مانای ئاسنێکی حەڵقەیی کە بە زینی ئەسپەوە بوو لە کوردیدا پێیان دەکوت ئاوزەنگی و رکێف، دەهاتە زەینەوە و ئەو مەبەستەی کە ئەمڕۆ ئێمە لە کەوش و کڵاو و لباس و چراوە هەمانە، سەد ساڵ پێش ئەو مانایە لە بەر چاو نە دەگیرا ـ قەڵەم ـ تۆڕ، دەفتەر لە زمانی قەدیم بە مانای کتێبچەیێک بوو کە برێک شتیان تیدا دەنوسی بەڵام ئەمڕۆ ئەگەر کوتمان دەفتەری مەرکەزی مەسەلەن دەبیرخانە دیتە زەین و مانای مەجازی مورسەلە، یارابتەی تەشبیهیە.

## زمان و زاراوە

«سیدنی سمیت» دەڵێ: زمانی کوردی زمانیکی سەربەخۆ وکۆنی ئاریایی و لە شاخەی زمانەکانی هیندو ئوروپاییە و ئەو میللەتانە لە پێش ئەوەیدا لێک جیا بنەوە لە دەشتی پان و بەرینی خۆر هەڵات و باکووری رۆژهەلاتی دەریای خەزەر پێکەوە بوون و هەموو بە زمانێک پێکەوە قسەیان دەکرد و چونکە لە دواییدا بڵاوبونەوە و لە هێندەوە تا ئوروپایان داگیر کرد بە هیند و ئوروپایی نێو بران و زمانی ئەمانە هەموی لە شاخەی ئەو زمانەیە و زمانی کوردیش هەر لەو زمانە، سەرچاوەی گرتوە.

زمانی هیندو ئوروپایی لەگەڵ خەڵکەکە بەم وڵاتانەدا بڵاو بوەتەوە.

١ـ هێندێک هۆز، رێی رۆژئاوایان گرتوەتە پێش و لە چۆمی دانوب رەد بـوون چـون بـو ئوروپا.

٢ـ دەستەیێکی دیکە چون بۆ لای باشووری رۆژهەڵات و گەینە هیندوستان.

٣ـ دەستەی سێهەم هاتنە ئاسیای سەغیر و کێوەکانی زاگرۆس کە بریتی بوون لەگوتی و بە دوای ئەواندا، مادەکانیش هەرچونە زنجیرە کێوەکانی زاگرۆس و میللەتی فارس رویان کردە دەشتەکانی باشووری ئێران.

# زاراوە

زاراواه لە زمانناسیدا بریتیە لە ئەو زمانانەی کە سەرچاوەی هەمویان یەک بێ و لەو ناوچەدا هەمو رمێن و برەویان بێ.

زمان وەکوو دەزانین هەمیشە لە حاڵی ئاڵ وگۆڕدایە و هیچ کاتێک بەدرێژایی مێژوو بە یەک حاڵەت و چونیەتی نامێنێ و ئەگەر قەومێک لە یەک سەرزەمیندا نیشتەجێ بن و تەواو لەگەڵ یەک هات و چۆیان بێ زمانیان بە یەک جۆر دەگۆڕدرێ، بەلاّم ئەگەر پێوەند و هات و چۆیان لەگەڵ یەک نەمێنێ هەر تایفەیێک زمانی بە جۆری جیاتر لەویتر دەگوڕدرێ.

هەمیشە قەومێک کە بە یەک زمان قسەیان کرد بێ، کاتێکی لە سەرزەمینێکی بەرین و بەربلاّودا بلاّو بوو بێتنەوە و جیاگانە ژیانیان برد بێتە سەر لە دوای بەینێک زمانیان بە چەند لەهجەی جۆراوجۆر دابەش دەکرێ.

## هۆی پەیدا بوونی لەهجەی جۆراوجۆری کوردی:

١ـ کوێستان و شاخ و داخی کوردستان.

٢ـ کۆچی هۆز و قەومی ماد دو هەزار و پینسەد ساڵ پێش میلاد بۆ رۆژئاوای کوردستان و تیکلاّو بونیان لەگەڵ چەند هۆز و تیرەی کۆن و قەدیمی ئاریایی کە لە پێشدا لەکوردستان نیشتەجێ بوون. وەکو: گوتییەکان، لولو، کاسی، ئیلامی، و...

٣ـ دابەش بونی میللەتی کورد لە مابەینی چەند دەوڵەتی وەک ئێران، تورکیە، سوریە، عێراق، ئەرمەنستانی روسیە.

٤ـ خەیانەتی هارپاک سەرداری لەشکری ماد بە ئەژدەهاک لە (٥٥٠پ.ز.) کە بوە هۆی لە بەین چوونی پادشایی مادەکان.

٥ـ جیرانەتی لەگەڵ ئەرمەنی و رۆمی و تورک، و عەرەب و...

٦ـ هاتنی لەشکری عەرەب بۆکوردستان.

٧ـ هاتنی تورک بۆ ولاّتی کوردستان ٩٠٠ ساڵ دوای میلاد، هاتنی مەغول و چەند بەڵگەی دیکە.

# لێکوڵینەوە لە بارەی زاراوەدا

کەلکی زۆرە، فایدەی زمانناسی، سوودی تاریخی، کومەڵناسی، ناسینی چینەکانی جۆراوجۆری وڵات و بیرکردنەوە لە رێزمانی ئەو لەهجەو هەڵسەنگاندنی لەگەڵ زمانی پێویست. کەسێکی کاری لێکوڵینەوەی لەهجە دەکا دەبێ دەورەی دیبێ و ریشەی زمان لە روی عیلمەوە بناسێ و لە روی نەخشەی داریژراو بۆ دێهات و شار بروا و لە دەستگای ضبط صوت و عەکاسی و فیلم کەڵک وەرگرێ.

## ویژەر

کەسێک کە بە لەهجەیێکی تایبەت قسە دەکا باش وایە بێ سەواد بێ، چون سەوادی ببێ حەول دەدا بە زمانی ئەدەبی قسە بکا و بە لانی کەمەوە بیست ساڵی بێ لەو دێیە بێ و دەبێ نێو و تەمەن و سەواد و شوغلی و جێی ژیانی بنوسێ جا ئەمجار وشەی لێ بپرسرێ.

## تەرزی نوسین

بۆ ئەوە ئاکامی کار و لێکوڵینەوە قازانجی ببێ دەبێ بە وردی، وشە و دەنگ بە ئەلف بێیەکی تایبەت بە هەموو وردەکارییەکەوە بنوسرێ و ئەمانە لە بەر چاوگیرێ:

١ـ لە سەر هەر پیتێ سەر و ژێر و بۆر دابندرێ.

٢ـ تەنیا پیتێک بنوسین کە بە زمان دادێ و دەکوترێ.

٣ـ پیتێک کە ناخوێندرێتەوە دەبێ نەینوسین.

## زاراوە لە جیهاندا

لە نێو تەواوی زمانی دونیادا زاراوە هەیە، بەڵام میللەتانی پێشکەوتوو لە هەموو ناوچەی وڵاتی خۆیاندا لەو بیرەدا بوون کە خزمەت بە زمانی رەسمی خۆیان بکەن و نوسراوە و ئەدەبیات و هونەریان لەو بارەدا نیشان بدەن بۆ وێنە سەعدی دیوان و شێعری خۆی بە زمانی (دەری) نوسیوە و بە زاراوەی شیرازیش هونراوەی هەیە و لە دیوانی حافزیشدا غەزەڵیکی مولەممەع دەبیندرێ و شێعر بە زاراوەی تەبەری لە نیماوە؛ و ئاشکرایە ئەوانە لەگەڵ یەکتریدا بە زاراوەی ناوچەی خۆیان گفت و گۆیان بوە، شێعر بە لەهجەی طبری لە نیمایوشیج:

وە چەویمْ آخونْ مُن چو زواْ گتَ بـویمْ دُنـی مُنِ لوزواْ

کیجایِ دَس سۆ مُن سوزُواُ     مارۆرگُت تِشُو آبروزواُ

منالْ بوم ئاخوند به دار لێیدام، گەورە بوم دنیا وەبەر پێلەقەی دام، کچێک بە دەست ئیشارەی پێکردم و چاوە قرتێی دەکرد، دایکی پێی کوت مەرۆ قەبولی نەکرد (بە برۆ دەیکوت نا)

شێعری حافظ بە زمانی خۆجێیی:

| | |
|---|---|
| بپی ماچان غرامت بسپریمن | غرت یک وی روشتی از امادی |
| غم این دل بواتت خورد ناچار | وه غرنه و ابنی آنچت نشادی |
| که همچون مُت ببوتن دل وای ره | غریق العشق فی بحر الوداد |

ئەگەر ئەتۆ ناکۆکی و ناتەباییت لە ئێمەوە دی روح وگیانمان بە تاوانی ئەوە دەخەینە بەر پێت.

دەبێ غەمی دڵ بخۆی دەنا ئەوەی شان و شیاوی تۆ نیە دەیبینی.

ئەی کەسێک کە بە عیشقی من باوەریت نیە دەبێ دڵی تۆ وەک من لە دەریای ئەوین و دڵداری‌دا غەرق بێ تابزانی من چ سەوداسەرێکم.

## دەورانی یەکیەتی

هەروەک بلاّوبونەوەی میللەتێک و نەبوونی هات و چۆی زۆر لە ناویاندا دەبێتە هۆی ئەوە کە جیایی لە زمانیاندا پەیدا بێ و یەک زمان ببێتە چەند زاراوەی جیا جیا هەر بەو جورەش پەیوند و هات و چۆ پێکەوە بونی خەڵکی شار و دێ و ولاّت دەبێتە هۆی نیزیکی لەهجەکان و پێک هاتنی زاراوەیێک بە نێوی زمانی رەسمی و ئەوەیش هۆی سەرەتایی یەکگرتنی قەوم و میللەتە بەم پێیە وێژەوان و زانا لە روی زانیارییەوە بۆ یەکگرتنی زمان و فەرهەنگ تێدە کۆشن.

## زمانی رەسمی

خەلکێکی هەم‌نەژاد و هەم‌زمان، کە لە سەرزەمینێکی زۆر پان‌و پور پێکەوە دەژین چارە نیە دەبێ هات و چۆ و هاوکارییان بێ و بۆ ئەم جۆرە پێوەندییە دەستاوێزێکی یەکیەتی پێویستە لەو رووەوە هەموو دەبێ زمانێک فێر بن و ئەو زمانە هۆی کۆمەلاّیەتی، ئابوری و فەرهەنگی بێ ئەو زمانە یەکێک لەو زاراوە جۆراوجۆرە بێ کە لە زمانە ریشەیی و ئەسلی‌یەکە جوێ بوبێتەوە.

بەلاّم کام زاراوە بۆ زمانی یەکگرتوو و ئەدەبی لە بەر چاو گیراوە؟

زۆر بەڵگە وەبەر چاو دەکەوی، بۆ ئەوە کە زاراوەی کرمانجی ناوەندی(سورانی) بە نێوی زمان دیاردەی رەسمی پشتیبانی لێ کراوە و بە برایێکی باش بۆ زاراوەکانی دیکە ناسراوە:

١ـ خوێندن و نوسین چەندین ساڵە بە زمانی سۆرانی لە قوتابخانەی سەرەتایی و قوتابخانەی ناوەندی و زانکو و زانستگەیە.

٢ـ پشتیوانی حکومەتی شێخ مەحموودی نەمر و قازی محەممەد و مەلا مستەفای بارزانی و بابان.

٣ـ نوسراوەی فەرهەنگی خاڵ و محەممەدی مەردوخ و گیوی موکریانی و هەژار و چەند فەرهەنگی بەرێزی دیکە.

٤ـ لایانگری گۆڤاری فەرهەنگی، ئەدەبی و کتێبی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی و هونەری زانستی.

٥ـ زۆربەی شاعیرانی ناوداری کورد و...

## زمانی پەهلەوی

بە هاتنی ئەسکەندەری مەقدوونی (٣٣١پ.ز.) زمانی کۆنی ئێرانی دوایی هات و ساکاری و رەوانی زمان پەیدا بوو و زەمانی زمانی ناوەراست گەیی کە زمانی پارتی پەهلەوی بوو کە زانایان دەڵێن لە (پرڤو)گیراوەتەوە و نێوی قەومێکە لە مادکە ئەو هۆزە وەک لە باسی زەردەشت و ئەوێستادا ئیشارەی پێ کراوە لە کاتی شەری گشتاسب و ئەرجاسب لە ناوچەی سنە و کرماشاندا،کە بوە هۆی کوژرانی زەردەشت. ئەوانە کە پەیرەوی ئەوبوون دەرەقەتی شای توران نەهاتن ناچار بە سێلاوی خوێندا رو بە رۆژهەلات خۆیان دەربازکرد و لە کوژران رزگاریان بوو گەینە خوراسان ولەوی نیشتەجێ بوون و لە سالی (٢٥٠پ.ز.) حکومەتیان‌سازکرد و تەواوی ولاتی ماد و هەخامەنشیان خستە ژێر دەسەلاتی خۆیان و زمانی پارت بوە زمانی نێوەراست لە مابەینی زمانی کۆنی باستان و زمانی کوردی ئەمرۆ.

دێهخودا بە نەقل لە حەمدولای مستەوفیەوە دەڵێ باباتاهیری عوریان زمانی شێعری پەهلەوییە:

| | |
|---|---|
| اگر روزی دوسێ بارت بوینم | بجان مشتاق بار دیگر ستم |
| زبانی پهلوی را اوستادم | کتاب عاشقی را مسطر ستم |
| خدایا عشق طاهر بی نشان بی | که از عشق بتان بی پا سر ستم |

ملک‌الشعراءبهار لە کتێبی سەبک‌شناسی‌دا دەڵێ کۆنترین ئاسار و دیاردە کە بە خەت و زمانی پەهلەوی لە دەس دایە و خوێندومەتەوە دو قەبالەی مولکییە کە لە ئەورامانی کوردستان بە زمان و خەتی پەهلەوی ئەشکانی لە سەر پێستی ئاسک نوسراوە لە سالی (١٢٠پ.ز.) و

پێتەختی ئەشکانی: رەی، ئیسفەهان، هەمەدان، ماەنەهاوەند، زەنجان و ئازەربایجان بوە.

زمانی پەهلەوی زمانی پالەوانانی کەیانییە و (٥٠٠)سال زیاتر زمانی رەسمی ئەشکانی و نیزیک (٤٠٠) سال زمانی رەسمی ساسانی بوە و ئەوێستاش بە زمانی ئەشکانی وەرگێردراوەتەوە و مانای لێدراوەتەوە و پورداود دەڵێ زۆربەی زانایان بروایان وایە کە زەردشت خەڵکی نزیک زرێچەی ورمێیە لە کوردستانی ئێران و لەوێ هاتوەتە دنیاوە و ئەوێستا بە زمانی نیشتمانی خۆی بە زاراوەیێکی مادی دەسنوس کراوە و(متبرون) نوسیویە زمانی کۆنی ئاریایی ئەوێستا و پەهلەوییە و ئەوێستا زمانی ئێرانی زوو بوە و لە دنیای ئەمرۆش‌دا لە نێو زەردشتیاندا بە کار دەبرێ و شک لە وەیدا نیە کە لەو چەند هەزار ساڵەدا ئاڵ و گۆڕێکی زۆری بە سەردا هاتوە و ئەم مەبەستە نیازێکی زیاتری بە لێکۆڵینەوە هەیە و بە وەدەس هاتنی نوسراوە و لەوح و ئاسەواری کۆنی ژێرزەوی شتی‌ترمان بۆ روون دەبێتەوە.

لە بارەی وشەی پەهلەوی کە بە مانای بە جەرگ و بە هێزە (لغت‌نامەدهخدا) و زۆربەی کتێبی فەرهەنگ باسی دەکەن و فردوسی دەڵێ:

بدان پهلوی بازوانی دراز همی شاخ بشکست آن سرفراز

هەر بەو مانایەن ئەو وشانەی (گاردو) یا (کارتو) و (گورد). ملک‌الشعراء بهار لە بەرگی هەوەڵی سەبک‌شناسی لاپەرەی شەش دەڵێ: تەبەری دەڵێ ئەردەشیری بابەکان لە کوردانی بازرنگی نیشتەجێی پارس بوە... و کردو بە سەری کاف و زیادی واو بە زمانی ئاشووری بە مانای رەشید و دلیر و نەبەزە و لە یەکێک لە کتێبەکانی سەرجون پادشای ئاشوور کە بە خەتی میخی نوسراوە وشەی «کردو» یا «کاردو» هەر بەو مانایەیە و دور نیە وشەی «گرد»یش هەر لەو ئەسڵ و ریشە بێ کە بە مانای بە جەرگ و قەویی و پالەوانە و لە لاپەرەی ١٤٥ هەر ئەو کتێبەدا دەڵێ خەت و زمانی پەهلەوی بە هۆی دو شت روو بە نەمان دەچوو یەکێک ئەوە کە زمان و خەتی نێو براو زۆر زیاتر لە خەت و زمانی عەرەبی سەخت‌تر و دژوارتر بوە و ئەوی دیکە ئەوەیە کە زمانی عەرەبی زمانی حکومەت بوو و خەڵک زۆرتر نیازیان پێ‌بوو لە گەڵ ئەوەیش‌دا تا سەدەی پێنجەم، شەشەمی (کۆچی) دەوامی بوو و لە رۆژئاوای ئێران کە خەڵک بەو زمانە قسە و باسیان دەکرد برەوی بوو.

دێهخودا لە زمانی چەند مێژوو نوسەوە دەڵێ زمانی پەهلەوی زمانی خەڵکی وڵاتی مادە کە دەڵێ «قال عبدالله بن المقفع لغات الفارسیة الفهلویة و الدریة... فاما الفهلویه فمنسوب الی فهله اسم یقع علی خسمة بلدان و هی اصفهان و الری و همدان و ماه نهاوند و آذربایجان» و رونە ئەم مەڵبەندانە کە نێو بران لە ژێر دەسەڵاتی مادەکاندا بوە و هەر بۆیەشە کە دەڵێ: «پەهلەوی زمانی پاڵەوانانی پێتەختی کەیانییان بوە» دەر دەکەوێ کە زمانی تەنیا ئەشکانیان و ساسانیان نیە بەڵکو زمانی ماد و پێش مادیش کەیانیان بوە و لەلایێکی دیکەوە بەپێی روایەتی پیرنیا ئەشکانیان لە نژاد کەیقوبادی کەیانین و فردەوسیش پشتیوانی لەو بیرورایە دەکا کە دەڵێ:

نخست اشک بود از نژاد قباد دگر گرد شاپور خسرونژاد

دگر بود گـودرز از اشکـانیان چه بیژن که بود از نژاد کـیان

# زمانی کوردی پەهلەوییە

ئەوانەی وا لە مێژوی کۆنیان کۆڵیوەتەوە و بە باشی رونیان کردوەتەوە، دەزانن کە یەکەم رەگەز، کە قەوارەی سەر بە خۆیی ئێرانی پێک هێناگەلی کورد بوو و لە تاریخە کۆنەکاندا ناوی گودەرز زۆر هاتوە و لە زمانی پەهلەویدا «گوتەرز» دەخوێندرێتەوە و ئەم وشە واژەی گوتییە کە بابل و ئاشوور بۆ هۆزی کورد بەکاریان هێناوە و بە مانای (گەورەی گوتو) و گوتو هـۆزێکی کورد بوون هاونژادی ماد و بە مانای: نەترس و بە جەرگ و پاڵەوان و ئاشوورییەکان گوتویان بە (گاردو) یا (کاردو) کوتوەوە مەبەستیان گەلی کورد بوە و بابلییەکان ئێرانییان بەگوتی نێو دەبرد کە «گوتەرز» یا «گودرەز»یش دەگرێتەوە و مێژو نوسیویە گوتەرز ٧٢ رۆڵەی نەبەزی بوە کە حەفتا و دو هۆزیان لی کەوتونەوە و بە تەواو ئێراندا بـڵاو بـونەوە یـانی ئـێران کـەوتە دەست نەتەوەی کورد و کورد بە تەواوی لەهجە گرینگەکانیەوە لە نژادی گوتی و مادن و زمـانیان لە تەواوی وڵاتی بەربڵاوی ماد دا پەهلەوی بوە یانی زمانی پاڵەوانان کە ئەویش مانای (گوتو و کاردو)یە (گورد)یش دەگەیێنی و کوردیش بە ئازا و بێباک بەناوبانگ بوە، خۆیشی بە دلیر و لێهاتوو دەزانی. زمانی پەهلەوی لە دیوانی پادشایانیشدا بەکار هاتوە و فردوسی دەڵێ:

تهمتن از او در شگفتی بماند همی پهلوی نام یزدان بخواند

بەڵام لە سالی ٢١١ میلادی بەم لاوە ئاڵ و گۆڕیکی زۆری بە سەرداهات و روو بە سادەیی و رەوانی و تەکامول و پێشکەوتن هات. وشە و وتـاری لە سـەر زمـان سـوک و رەوان‌تـر لە پەهلەوی کۆنی لێ پەیدا بو و جێگای ئەوی گرتەوە و لە مێژوودا بە رونی دەبیندرێ کە پەهلەوی ریشەی زمانی کوردی ئەمرۆ، زمانی ساسانی، ئەشکانی، هەخامەنشی و ماد و کەیانی بوە بەڵام هەر زانایێک لەمە سەری سور دەمێنێ کە لە نێو ئەو هەموو گێژەڵوکەی شەر و شوور و شاڵاوێک کە بۆ کورد هاتوەتە پێشێ چۆن ماوە و چۆن پێشکەوتوە بەڵام بە پێی قانونی تایبەتی زمان هەر زمانێک لە دنیادا جاری واهەیە دەگۆڕدرێ، گەشە دەکا گەڵا و گوڵ دەکا و سادە و جوان دەبێ و زمانی کوردیش لەم یاسا و قانونە دەر نەکەوتوە.[1]

---

١ - کتێبی «با این رسوائی چە بخشایشی» وەرگێراوی ئیبراهیمی یونسی دەڵێ «زمانی کۆنی کودری زمـانێک بە نێوی «پەهلەوانی» بووە کە لە زنجیرە کێوەکانی زاگرۆس کە ناوەندی کوردستان بوە زمانی تریفەدار و بەدەسەڵاتی کوردان بوو.

⇐

# کۆنترین دیاردەی زمانی کوردی

بە هەڵدانەوەی لاپەڕەی کتێبی کۆن و تازەی هەرە گرینگ روون دەبێتەوە کە کۆنترین نوسراوەی زمانی کوردی ئەوێستای زەردەشتە کە بۆ وێنە چەند رستەی لێرەدا دەنوسین و وشەکانی بە کوردی ئەمڕۆ وەردەگێرینەوە.

| کوردی ئەوێستایی | کوردی ئەمڕۆیی | کوردی ئەوێستایی | کوردی ئەمڕۆیی |
|---|---|---|---|
| وَ إدا، | ئەوەی | تت، | دەزانم |
| یا، | کە | اَهمی، | هم |
| مَزدا، | ایمزدا | آن ، | ناکام |
| اِاشو، | شوێن | ما، | کەوتوانم |
| کَمن، | کەمن | فش وْ، | دەستەی |
| هیت چا، | وەئەوەکە | کَمنانا، | کەم مرو |
| اَهمی، | هەم | گرزوئی، | داوایدادگەریدەکەم |
| توئی، | بەتو | لە | |
| ئیت، | ئەمە | اَوَ اِنا، | تەماشاکە |
| اَهورا، | ئەی ئاهورا | رَفزرم، | شادی |

---

← بەڵام لە سەدەی ١٦دا ئەو وڵاتە بەرینە لە مابەینی سوریە و عێراق و تورکیە و ئێراندا، دابەش کرا و پەراوێز و سنوور لە بەینیاندا دامەزراوە ئەم ئاڵ و گۆڕە و چەند بەڵگەی دیکە، بوونەتە هۆی ئەوە کە زمانی «پەهلەوانی» وردە وردە جێگەی خۆی بدا بە کوردی کرمانجی کە زمانی کوردەکانی چادرنشین بوو لە کێو و چیاکانی حەکاری کە لە رۆژئاوای گۆلی ورمێ ژیانیان دەبردەسەر.
کرمانجی و پەهلەوانی لە دوو ناوچەی بەرامبەر یەکتر یەکێک باشووری ئێران کە گۆرانی پێ دەڵێن و ئەوی دیکە «زازایە» لە کوردستانی تورکیە لە ناوچەی تونجلی و بینگۆل و سیوەرک و مەلاتیە و ئادیامان و چەند جێگەی دیکە قسەی پێ دەکرێ و زمانی کرمانجی بە دوو شاخەی باشوور و باکوور دابەش بووە شاخەی باشووری بە نێوی سۆرانی کە زۆربەی کوردی ئێران و عێراق بە و زمانە قسە دەکەن و شاخەی باکووری زمانی بادینانییە کە باکوور عێراق و ئێران و زۆربەی کوردی تورکیە بەم زمانە گفتوگۆ دەکەن گومان وایە $\frac{3}{4}$ خەڵکی کورد بەو زمانە قسە دەکەن و ئەوانەی کە بە زمانی کرمانجی پەهلەوانی لە گەڵ ئەوان قسە دەکەن لێک حاڵی دەبن.

| چکٔ واو، | داوادە کەم | هێت، | ئەوجورە |
| --- | --- | --- | --- |
| فریو، | دوست بو | فریاٸی، | دوستی |
| دَٸی دیت، | رەوای دەزانی | آخسو، | فێرکە |
| ونگٔ ءِ ئوش، | چاکٔ | اَشا، | لەگەڵ پاکی |
| ئیش تیم، | شادی | مننگٔ هو | بیرکردنەوە |

وەرگێردراو: ئەوەی دەزانم کە هەم ناکام ئەی مەزدا دەستەی شوێن کەواتوانم کەمن و ئەوە کە هەم کەم مرو داوای دادگەری دە کەم بەتۆ لە ئەمە تەماشاکە ئەی ئاهورا شادی داوادە کەم ئەوجورە دۆست بۆ دۆستی رەوای دەزانی فێرکە شادی لەگەڵ پاکی چاکٔ بیرکردنەوە.

* * ئەم کەتیبە (نوسراوەی سەربەرد) بە خەت و زمانی پەهلەوی ملکٔ‌الشعراءبهار لە بەرگی هەوەڵی سەبکٔ‌شناسی نوسیویە لەکوردستانە و پروفسور هرتسفلد خوێندویەتەوە و کتێبێکی بایەخدار و گەورەی لەبارەیدا نوسیوە ئەمە بەشێکی کەمە لەکەتیبەی پایکولی «هیچ ویسپهران و هرکوپز و ژرکان و آزاتان، فرستکی اواماخ مت کوشهان شەپز کرپکیهی هچ ارمن ی، اوروnی (ظ: سعادت) او ایران شتری ایو و هیچت و خورە و شتری و خویش گاس، و پاتهشری زی نیداکان هچ یزدان پتگرت....»

وەرگێردراو: پیاوە گەورەکان و پاڵەوانان و مەزنەکان و مرۆڤ سەربەستە و ئازادەکان بۆ لای ئێمە هاتن کە پادشایانی پادشا بە موبارکی و باشی لە ئەرمەنستان ئێرە (بسعادت) بە ئێران شەهری ئیرادە و ئارەزوی دەکا و گەورەیی و شکۆ و وڵات بۆ تەختی خۆی و پادشایی ئیرسی لە باپیران لە خودای قەبوڵ دەکات.

کۆنترین نمونەی شێعری کوردی هیند و ئوروپایی لە نوسراوەی پەهلەوی دەورەی ساسانی :

(چـی؟) وَس ـ رفت هـم اَنـدر اوام — وس ـ اَم و چـیت کُسـتکٔ کستک
وَس ـ اَمُ چست هـچ دین اُت مـانسر — وِس ـ اَم هـــچ نـپیکٔ اُت نـامکٔ
کـــرت هُــم دسـتوور و چـارتار — کـرتُ هـم هـمپرسکیە سـتاییتکٔ

مانا: چونکە زۆر لە ساڵی ژیانم چـومەتە پـێشەوە زۆر وڵاتـم دیـوە لە زۆر دینەکـانم کوڵیوەتەوە، زۆر نوسراوە و کتێب (فێربوم) رابەری رەوان بێژم هەڵبژاردوە و باسی دینم بوە.

# کۆنترین شێعری کوردی سەدەی هەوەڵ

گـۆشت جــە واتــەی پـیر شـالیار بـۆ — هۆشەت جە کیا ستەی زانای سیمیار بـۆ
داران گیان دارەن، جەرگ و دل بەرگەن — گـاێی پـر بـەرگەن، گـاێی بـێ بـەرگەن
کەرەگ جەهێڵین، هێڵێ جە کـەرگەن — ڕواس جە ڕواس وُرگـەن جـەوُرگـەن
وەورێ وەوارۆ وەرەوەرێـــــنە — وُریـــــە بـــــریو چـــوار ســـەرینە
کــــەرگێ سـیاوە هـێڵێش چـەرمینە — گـۆشڵێ مـە، مـەڕیو دوی دەرێـنە[1]

## مانای شێعرەکان

١ـ گوێ بدە وتاری پیر شالیار و هوش و بیرت بدە قسەی زانای سیمیار (زەدەشت).
٢ـ دار روحی هەیە و جەرگ و دڵیان بریەتین لە گەڵاکان جاری وایە گەڵایان زۆرە و جاری وایش هەیە بێ گەڵان.
٣ـ باڵندە لە هێلکەیە و هێلکەش لە باڵندە و رێوی لە رێوییە و گورگیش لە گورگە.
٤ـ بەفرێک دەبارێ کە بەفرخۆرەیە تەناف کە لەت بوو چوار سەر پەیدا دەکا.
٥ـ مریشکی ماڵی رەش هێلکەی سپی دەکا مەنجەڵی چکۆلە کە کون بو دوو درگا پەیدا دەکا.[2]

---

١ـ ئەم شێعرانە هونراوەی پیری شالیاری ئەورامانی هەوەڵە کوڕی جاماسب یەکێک لە موغانی دینی زەردەشت بوە لە مێژوودا وەدەر دەکەوێ کە لە دواییکانی سەدەی هەوەڵدا ژیاوە و تا ئاخرین کاتی تەمەنی لە سەر ئەو دینە بوە و چونکە شێعرەکانی باسی مەجوسییەتە و باسی ئیسلامی تێدا نیە و لە لایێکی دیکەوە دینی ئیسلام لە سەدەی سێ و چوار و پێنج لە هەورامان رەواجی پەیدا کردوە پیری شالیاری دوهەم نێوی سەیید مصطفی بوە و مرید شێخ عبدالقادر گیلانی بوە (٤٧١ ـ ٥٦١) شێعرەکانی مارفەتو پیر شالیاری هەوەڵی دەس تێوەرداوە ئەو شێعرانەی باسی دینی زەردەشت بوە گوڕیویە و مەبەستی ئیسلامی لە جێی ئەوان داناوە.

٢ ـ مەشاهیر کرد جلد اوّل صفحه ٣.

## بەسامی کورد[1] (سەدەی سێهەم)

بەسام بوو لە کوردان دوهەم شاعیرێ
بە فارسی بوو شێعری ئەمانەن برێ

«هر کە نبود اوی بە دل متهم
بر اثر دعوت تو کرد نَعَم

عُمر زعَمّار بدان شد بَری
کُاوی خلاف آورد تا لاجَرَم

دید بَلا بر تن و بر جان خویش
گشت بە عالم تن او در اَلَم

مکە حَرَم کرد عرب را خدای
عهد ترا کرد حرم در عَجَم

هر کە در آمد همە باقی شدندباز فنا شد کە ندید این حرم»

١ ـ بەسام هەوەڵین شاعیری کوردە کە بە فارسی شێعری کوتوە و لە رۆژگاری فەرمان رەوایی (یعقوب لیث صفاری) دا بوە کە لە (سالی ٢٦٥ هـ‌ق.) مردوە و «ملکالشعراء بهار» لە کتێبی سەبکشناسی بەرگی هەوەڵدا نوسیویە: «قەدیمی‌ترین شێعری فارسی کە لە خوراسان و سیستان لە لایان حنظلەی بادغیسی و محمّد کوری وصیف سکزی و بەسامی کورد و...هتد کوتراوە بە زمانی رەوانی دەری بوە» جا بۆیە روون دەبێتەوە کە بەسام هەوەڵین کوردێکە کە بە فارسی شێعری کوتوە و دوهەمین یا سێهەمین کەسێکە کە لە ئێراندا شێعری فارسی کوتوە.

## ابوالحسن علی لوکری (سەدەی چوارەم)

لە قـــەرنی چـــوارەم لە کـــوردی ولاّت
ئـەدیب لوکـەری بـوو وەکـو رۆژهـەلاّت

لە لوکـــــەر لە دێـــــهاتی ئـــەفغانەوە
دەچـــوو بـــۆ بـــخارا لەوێ مـــانەوە

لەوێ زۆر بـەرێز بـوو لەکـن شـا و وەزیـر
لە لای پـیاوی زانـا بـە هـۆش و بـە بـیر

ئـــەئەم شـــێعرەیانەی دەنـارد بـۆ وەزیـر
وەزیـــر نـــەترس و گـــەلی رون و ژیـــر

«عـبیداللّـه بـن احـمد وزیـر شـاه سـامانی
هـمی تـابد شـعاع داد ازان پـر نـور پیشانی

به صورت آدمی آمـد بـه معنی نـور سبحانی
خدایا چشم بد خواهم، کزان صورت بگردانـی

بـخارا خـوشتر از لوکـر خـداونـدا همیدانـی
و لیکـــن کـــرد نشکـــیبد از دوغ بـیابانی»

## ئەم چەند شێعرەیشی لە تاریفی شای سامانی ئەمیر رەزی نوحی بن مەنسور بن نوح کە لە ٣٦٥ تا ٣٨٧ پادشایی کردوە نوسیویە:

نگـار مـن آن کـرد گـوهر پسر
کە زین ست و حسن از قدم تا بە سر

ز عـــنبر زره دارد اوبـــر ســمن
ز ســـنبل گـــره دارد او بـر قـمر

چـو برداشت جوزا کمر گه نگر
بـجست و ببست از فلاخن کمر

برون برد از چشم سودای خواب
در آورد در دل هـــوای ســفر

بره کرد عزم آن بست خوشخرام
گره کرد بند سر آن خوش پسر

شتابان بیامد سوی کوهسار
به آهستگی کرد هر سو نظر

بتابید سخت و بپچید سست
بگرد کمرگاه دستار سر

بر آورد ازان و هم پیکر میان
یکی زرد گویای ناجا نور

به بلبل ز بلبل بدستان فزون
نه طوطی ز طوطی سخنگوی‌تر

چو دوشیزگان زیر پرده نهان
چو دوشیزه سفته همه روی و بر

بریده سر و پای او بی گنه
ز مالیده‌نش شادمانه پسر

ز سر بستد به زرّینه نی دردمید
به ارسال نی داد دم راگذر

برخ بر زد آن [زلف] عنبر فروش
بنی بر زد انگشت وقت سحر

هموگفت در نی که‌ای لوکری
غم خدمت شاه خوردی مخور

ابوالحسن علی لوکری شاعیری خوشەویستی ابوالحسین عبیداللّٰه کوڕی احمد وەزیری سامانیان و لە لوکرەوە کە یەکێک لە دێهاتی ئەفغانستانە چوە بۆ بوخارا پێتەختی سامانیان و هاونشینی وەزیر بوو و لە دوای بەینێک ماندوو دەبێ ئارەزوی وڵاتی خۆی لوکەر دەکا، و بۆ بیانوو و عوزر هێنانەوە قەسیدەیێک دەنوسێ کە ئەو شێعرانە برێکن لەو؛ و دەینێری بۆ وەزیر. لوکری دوای بەسام قەدیم‌ترین شاعیر کوردە کە بە فارسی شێعری کوتوە.لە زەمانی سامانیاندا لە ئەفغانستان و سیستان و خوراسان کورد زۆر بوە.

# چوار خشتەکی بابا تاهیری عوریان (ئاخری سەدەی چوارەم)

«حەمدولآی موستەوفی» نوسیویە: بابا تاهیر شێعرەکانی خۆی بە پەهلەوی ناو دەبا وەک لە پێش داکوترا:

اگر روزی دوسی بارەت بوینم
به جان موشتاق بار دیگر ستم
زبـــانی پـــەهلەوی اوســـتادم
کتاب عـاشقی را مستطر ستم

لوغەتنامەی دێهخودا نوسیویە: چوار خشتیەکیەکانی باباتاهیر لەکتێبەکۆنەکاندا بە «فهلویات» نێو براون و شێعرەکانی بەحری هەزەجی موسەدەسی قرتاوە.[1]

---

١ـ کاتێک سوڵتان توغرل بەگ بە لەشکر و شکۆیێکی زۆرەوە چوە هەمەدان و باباتاهیری بێ حاڵ و ماڵی چاو پێکەوت. بابا بە پادشای کوت: ئەی تورک لەگەڵ خەڵکدا دەتهەوێ چۆن رەفتارکەی شا لە وڵامدا کوتی: هەر چۆن تۆ بڵێی باباتاهیر کوتی: «إنَّ اللّٰهَ يَأمُرُ بِالْعَدْلِ وَ الإحْسَانِ» شاگریا وکوتی وا رەفتار دەکەم و باباتاهیر سەری لولەی ئەفتاوە شکاوەکەی لە قامیکدا بوو دەری هێنا و لە قامکی شای کرد و پێیکوت: ئەوا مەملەکەتی دنیام ئاوا خستە دەستی تۆ و عەدالەتت بێ.

لە بارەی بە دنیا هاتنی باباتاهیر «میرزا مەهدیخانی کەوکەب» یەکێک لە دوبەیتیەکانی رەمزی ئەوی بە حسێبی ئەبجەد حەل کردوە و تاریخی لە دایک بوونی شاعیری روون کردوەتەوە:

مو آن بحرم که در ظرف آمد ستم — مو آن نقطه که در حرف آمد ستم
بـه هـر الفی الف قـدی بـر آیـد — الف قـدم کـه در الف آمد ستم

«الف قد» و «تاهیر» و «دەریا» بە حسابی ئەبجەد هەر یەک ٢١٥یە و لێرەدا «الف قد» کە ٢١٥ یە لەگەڵ «الف» کە ١١١ یە کۆی کەینە دەبێتە ٣٢٦ کە دروست لەگەڵ کۆکراوەکەی وتەکانی وشەی «هـەزار» یەک دەگرێتەوە ئەگەر هەزار بەم جۆرە بنوسرێ «ها ـ زا ـ الف ـ را» مەعنای دو شێعرەکە ئاوای لێ دێ لە دوای هەر هەزار ساڵ پیاوێکی گەورە سەر هەڵدێنێ و من ئەو «الف قد» م یانی «طاهر» کـە لە ئـەلف دا هاتومە دنیا، یانی ساڵی «ئەلف قەد ـ ئەلف» کە ساڵی ٣٢٦.

«دهخدا» لە «رەشید یاسمی» نەقل دەکاکە: سەفەری توغرل بۆ هەمەدان نیزیکی ساڵی ٤٥٠ هق. بـوە و باباتاهیر پەنجا ساڵێکی عومر بوەکە وابوو لە دایک بوونی لە ئاخری سەدەی چوارەم بـوە و لە نـێو زۆر میللەتانی دنیا وەکوو زەردەشتی و مەسیحی باورەیان وابوەکە هەر لە هەزار ساڵ دا پیاوێکی گەورە سەر هەڵدێنێ و خاقانی شیروانی دەڵێ:

گویند که بر هزار سال از عـالم — آید بوجود اهـل وفـایی مـحرم

باباتاهیریش دەڵێ: «الف قدم که در الف آمدستم» ئاشکرایە تاریخ هق. مەبەست نـەبوە بـەڵکو تـاریخی مەسیحی لە بەر چاو گرتوەکە لە ٣٩١هق. لە دایک بوونی دەبێتە ١٠٠٠ میلادی.

# حکومەت لە ئێران:

١ ـ هەوەڵین دەوڵەتێک کە لە رەگەزەی ئاریایی لە ئێران پێک هات حکوومەتی ماد بوو کە تاریخی هرودوت چواریان نێو دەبات. هەوەڵین پادشایان دیوکس (٧٠٨ تا ٦٣٣ پ.ز)

دوهەمیان فرەوەرتیش (٦٥٥ ـ ٦٣٣ پ. ز.)

سێهەمیان هووەخشتر (٦٣٣ ـ ٥٨٥ پ. ز.)

چوارەمیان ئاژی دەهاک (٥٨٥ ـ ٥٥٠ پ. ز.)

و لە دوای لەبەین چوونی دەوڵەتی ماد بە دەستی کوورەشی کەبیر

حکومەتی هەخامەنشی هاتە سەرکار و ئاخرین پادشای ئەو هۆز و بنەماڵە داریوشی سێهەم بوو (٣٣٦ ـ ٣٢٠ پ. ز.)

بە هێرشی ئەسکەندەری مەقدوونی پادشاییان دوایی هات و لە (٣٢٣ پ. ز.) ئەسکەندریش بە یەک جارەکی سەری نایەوە. سلوکیان (جێنشینانی ئەسکەندەر) حکومەتیان تا ساڵی (٢٥٠ پ. ز.)کەوتە دەست.

# ئەشکی هەوەڵ (ئەشەک)

لە تیرەی پارتی بوو کە لە دەستووری سلوکیان سەرپێچی کرد و خۆی نێونا شاو زنجیرەی پادشایانی ئەشکانی پێک هێنا و بۆ شانازی و مانەوەی نێوی ئەشک خۆیان بە ئەشکانی نێو برد و دێهخودا نووسیوویە لە نژادی کەیقوبادن کە «تاریخی ارومیە» بە مادیان نێودەبات و فردوسی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| نخست اشک بود از نژاد قباد | دگر گرد شاپور خسرو نژاد |
| دگر بود گودرز از اشکانیان | چو بیژن که بود از نژاد کیان |

٢٨ مرۆڤ لەو هۆزە نزیک ٥٠٠ ساڵ حکومەتیان کردوە تا لە ساڵی (٢٢٠ پ. ز.) دوایی هات و زنجیرە پادشایانی ساسانی پێک هات و تا ساڵی ٦٥٢ یزدگرد ئاخرین پادشایان لە شەرێکدا لە مەروکوژرا و ساسانیان فەرمانڕەواییان چۆڕاوی هات کە ٤٠٠ ساڵ حکومەتیان کرد کە لە ناوەرۆکی پێشەکیدا روون دەبێتەوە.

٢ـ بەشێکی زۆر کەم باسی هەوەڵ حەڵقە لە زنجیرەی نەتەوە و رەگەزی کۆنی کورد پادشایانی پێش دادی کیانی و ماد و ئەشکانی و ساسانی و شەدادی و چەند بنەماڵەی دیکەی کورد کرا. لێرە بە پێویستی دەزانم دیسان زۆر بە کورتی لە سەرەتای ئیسلامەوە تا ئەم سەدە لە بارەی کورد و مەلبەندی بە تایبەت قارەمانانی بخەمە بەر چاو.

## کوردلە سەرەتای ئیسلامەوە تا ئەم سەدە

لە سەرەتای ئیسلامدا زۆر کتێبی تاریخ نوسیویانە «سەعدی وەقاس» لە ١٦ مارس ٦٣٧ زایینیدا(١٥ کۆچی) مەدائینی گرت و لە ساڵی ١٦ کوچی کورد لە گەڵ لشکری ئیسلام روو بە روو بوون بەڵام لە پێش ئەوەداکورد بە شانازییەوە بوونەتە هەواڵی خۆشەویستی پێغەمبەر. کە تەفسیری «روح المعانی» نێوی جابان (گابان)ی کوردی و مەیمونی کوری دەبات کە زۆر لە پێغەمبەر نیزیک بوون و فەرمودەکانیان لە بەر کردوە. وێ دەچێ لە کتێبی مێژوو نێوی چەند ئەسحابەی دیکە کورد نووسرابێ.

الکامل دەڵێ کورد دوای سەرکەوتنی ئیسلام لە ساڵی ٢١ کوچیدا خەلیفەی دوهەم حەزرەتی عومەر بەسەرکردایەتی عتبەی کوری فرقد لەشکری ناردە شارەزور و دوای شەڕێکی قورس ئیسلام سەرکەوتوو بوو.

لە ساڵی ٢٥ کۆچیدا لە بەسرە لە زەمانی حکومەتی ئەبوموسای ئەشعەری کوردەکان لە ئەهواز و فارس شۆڕشیان کرد و لە زەمانی خەلافەتی «عبدالملک» لە ساڵی ٨٢ لە ناوچەی فارس حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفییان شکاند و ئەو ناوچەیان لە زوڵم و زۆری حەجاج نەجات دا.

ئەبو موسلمی خوراسانی حکومەتی بەنی ئومەیەی لە نزیک ساڵی ١٣٢ (ک. م)تێک دا، و خەلیفە مەهدی کوڕی خۆی هارونە رەشیدی کردە فرمان رەوای کوردستان و لە زەمانی خەلیفە المقتدر دەیسیمی کوڕی ئیبراهیم لە ساڵی ٣١۴ (ک. م) لە ئازەربایجان پایەی حکوومەتی دامەزراند.

# شۆڕش لە زەمانی خەلیفەی دوهەمدا

لە دوای شکانی (یزدگرد سوم) و هەلاّتنی بۆکوردستان ناوچەی حەلوان لە سالی ١٨ بە ئیزنی حەزرەتی عومەر و فەرمانی سەعدی وەقاص عەیازی کوڕی غەنەم هەلّمەتی هێنا بۆکوردستان و جزیرە و رەها و ماردین و دیاربەکری خستە ژێر دەسەلاّتی خۆی و خەلیفەی دوهەم قەیس کوری «سلمه الاشجعی» نارد بۆ شەری لۆرستان زۆر لەکورد و عەرەب لە وێ کوژران بەلاّم کوردەکان دەستیان لە شۆرش هەڵنەگرت و ٢٥کوچی هۆزی کورد و فارسی خوزستان کوتیان ئەگەر عەرەب هەر پێیان داگرت و بە لەشکرەوە هاتن ئێمە هەتا دەسمان چەک بگرێ هەتا رەگی تەرمان لە بەدەندا مابێ پێشیان پێدەگرین و بەگژیاندا دەچین.

# کورد و یەعقوبی لەیس سەففاری

یەعقوبی لەیسی سەففاری بەگوێرەی فەرهەنگی دێهخودا تاریخی سیستان نوسیویەکە لە تیرەی ساسانیان وکەیومەرسن و بۆ سەربەخۆیی ئێران لە بەرامبەری بەغدا دا شۆرشی کرد و سپا و لەشکری کورد زۆریان یارمەتی پێ کرد هەر بۆیە محمد کوڕی عبدالله کە یەکێک لە سەرپەلانی کورد بووکردیە حاکمی ئەهواز.

# شۆرش لە موسڵ

شۆرش لە موسڵ لە ساڵی ٢٨١ حەمدانی کوڕی حەمدون راپەڕی و بۆ دروس کردنی پادشایی حەمدانی تێکۆشا و پیاوێکی لێزان و بە مشور بووکەس نەیدەتوانی سەربزێوی بکا شۆڕشێکی دیکە لە ساڵی ٢٩٣ لە لایان کوردانی هذبانیەوە لە موسل بە فەرمان رەوایی محمد کوڕی بلال پێک هات و ناوچەێ نەینەوا تووشی تالاّن وکوشتار هات و ئەبوالهیجا حاکمی موسڵ هات شالاّوی بردە سەرکوردان بەلاّم شێرە پێشمەرگەی کورد جەوهەری خۆیان نیشاندا و لە (معطوبه) شکستیان پێ دا و بەسەرشۆری گەڕاوە موسڵ وکوردان لەو شۆڕشانەکە بە دژی خەلیفەی بەغدا دەیان کرد لە زۆر جێگەدا حکومەتیان پێک دێنا و نیزیک بە ساڵی ٣٤٠ (ک.م) چەند ئاژاوە لە لایان نەتەوەی ماد دژی بەغدا پێک هات یەکێک لەوانە زنجیرە پادشایانی شەددادی بو لە هۆزێک کە لە ئەردەبیل وگەنجەدا نیشتە جێ بوون.

# کوردی بەرزیکانی

کوردی بەرزیکانی لە سالْی ٣٤٨ (ک.م.) دا حسنویە کوڕی حوسێن لە دینەوەر و نەهاوەند و هەمەدان بەمەبەستی ئازادی هۆزەکەی ڕاپەری و لە سرماج نیزیکی بیستون حکومەتی سازکرد و ئالی بویە بە تایبەت (رکن الدولە) یارمەتێکی زۆری دا. (تاریخ کُرد، رشید یاسمی).

# دەیلەمییان

«سەدەفی» لە «تاریخ الدول» (لاپەڕەی ٧٥) دەڵێ حکومەتی سالاری یا مسافری دەیلەمیان پێ‌دەڵێن و دایرةالمعارف اسلامی ئەو زنجیرە پادشایانە بێگومان و بە دلْنیایی بەکورد دەزانێ و تاریخی «عالم آرای عەبباسی» نوسیویە کە: «ئێرانیانی قەدیم و کۆن بەکوردی تەبەرستان‌یان کوتوە دەیلەم[1]»و هۆزی «آل‌جستان» لە تیرە و ڕەگەزی کۆنی کوردی دەیلەم ناسراون و ناوەندی حکومەتی ئەمان روباری منجیل و ئاوایی دەیلەمیانی ئەمڕۆ بوە و لە ئاخری سەدەی دوهەم تا هەوەڵی سەدەی چوارەم یانی زیاتر لە سەد ساڵ حکومەتیان بوە.

الکامل نوسیویە لەساڵی ٣٧٣ لە هۆزی کوردی حمیدیە «باز» ناوێک کە بە ڕواڵەت و سام وەک روستەمی زاڵ بوو چوە لای «عضدالدولە دیلمی» بەلاّم شاکە چاوی پێیکەوت ترس و لەرز کەوتە دلی ویستی بیگرێ ئەویش پێی زانی و هەستا ڕۆیی خۆی دەربازکرد و چوە موسڵ و لە ناوچەی میافارقین و دیاربەکر لەشکرێکی کۆکردەوە و دوای مردنی «عضدالدولە» دو جار «صمصام‌الدولە» سوپا و قۆشەنێکی بەگەف ساندان و تەیار بەکلاّو خود و زرێ و تیر و کەوان و قەڵغان شالاّوی بردە سەر «باز» بەلاّم هەر دوکەڕەت تێشکان و موسڵ کەوتە دەس «باز» و دوای بەینێک کوڕانی حمدان وەک بەبر و پڵینگی شاخان هەڵمەتیان بردە موسڵ و گرتیان و باز دوبارە لەشکری دیاربەکری هێنا کە زۆرتریان لە کوردانی بشنوێ بون و لەساڵی ٣٧٩ هێرشی

---

١ - ناوچەی دەیلەم بەشێک لە گیلان بوە کە لە باشورەوە تاولاّتی قەزوینی گرتوە و لە ڕۆژهەلاتەوە سنووری چالوس ناسراوە و لە کاتی دەسەلاّت داری دەیالەمە بەینی تەواوی گیلان و زەمانێ هەمو ناوچەی دەریایی خەزەر بەشێک لە ولاّتی دەیالەمە و زەمانێ هەموو ناوچەی ئەمرۆکە پێی دەڵێن دەیلەمیان یا دەیلەمستان یانی جێی هۆزی دەیلمی. گیلان بە مانای جێی قەومی گیل. سەرچاوە: کرد نوسراوەی رشید یاسمی ـ مشاهیر کرد بابا مردوخ

برده سەر موسڵ بەلآم لەمەیدانی شەردا لەکاتی گۆڕینەوەی ئەسب و سوار بون کەوت و پشتی شکاو لاشەیان برده موسڵ و بە مردوویی هەڵیانواسی و خەڵک زانییان و چونکە خۆشیان دەویست و شۆرشیان کرد. باز کەکوژرا علی کوڕی مەروانی خوشکەزای لەکوردی مەروانیان دوو جار چوە مەیدانی شەڕی حەمدانیان و یەخسیری زۆری لێگرتن لە دوای بەینێک لە گوناهیان خۆش بوو پایەی حکومەتی خۆی لە دیاربەکر پتەو و قایم کرد. «رشیدی یاسمی» نوسیویە: کوردی مەروانیان لە سالی ٣٨٠ تا ۴٨٩ لە دیاربەکر، ئەرزان، میافارقین، حیسن‌کێف، خەلات، ملازگرد، ئەرجیش و دەوروبەری باکوری رۆژهەلاتی زرێچەی وان حکومەت و فەرمانرەواییان بوو و ئەبو عەلی حەسەن لە ساڵی ٣٨١ چوە شام و ئەو ولآتەی لە ژێر دەست قەیسەری رۆم (بازیل) هێنادەرێ و خۆی بە باشی پیێ چاری.

لە ساڵی ٣٧٠ (ک.م) ئەبوو شوجاع لە عەشیرەی حەمیدیە حکومەتێکی لەکوردستانی مەرکەزی دیاربەکر ـ ئەرجیس ـ میافارقین ساز کرد کتێبی «تجارب الامم» لاپەرەی ١۴٧ دا نوسیویە: یەکێک لە سەرۆک عەشیرەکانی کورد بە نێوی ئەحمەدی کوڕی زوحاک لە تاریخی ٣٨١ بە ٥٠٠ سوارەوە هەڵمەتی برده سەر لەشکری رۆم و شکاندی و فەرماندەکەشی کوشت لە مابەینی ساڵی ٣٦٦ تا ٣٨٨ (ک.م) لە دژی و ناکۆکی ئالی‌بویە و ئالی‌زیاد لە سەر ناوچەی گورگان عەشایری کورد یارمەتی ئالی بویەیان دا و نەیانهێشت تێک بشکێ و هەر لەوکاتەدا هۆزی بەنوعقیل هەڵمەتیان بردەسەر موسڵ و کوردان پێشیان پێ گرتن نەیانهێشت شار تووشی تالآن و برۆ بێ. (الکامل جلد ٩).

# فەرمانڕەوایانی ورمێ

«بلازەری» نوسیوویە: لە زەمانی خەلافەتی مەنسووری عەبباسی (١٣٦ تا ١٨٥ ک.م) سەدەقەی کوری عەلی بە زۆری شەڕ و شمشیر ورمێی خستە ژێردەستەڵاتی خۆی و خۆی و براکەی بۆ ئاوەدانی ئەو شارە زۆریان زەحمەت کێشا و زۆر خانوو و عیمارەتیان لەوێ سازکرد.

# ئەمیر سەدەقەی دوهەم

ئەمیر سەدەقە بە نێوی باپیری نێوی نرا و بەسەر ناوچەی موسڵ و ئازەبایجان‌دا دەسەڵاتی بووە و لە ساڵی ٢٠٩ ک.م لە لایان مأمون عەبباسی بووە حاکمی ئازەربایجان و ئەرمەنستان و شەڕکردن لەگەڵ بابەکی خۆڕەمی خرا ئەستۆی ئەو.

# ڕەوادیانی (شدادیان)

ڕەوادیانی هذبانی (شدادیان) هۆزێکی گەورە بوون لە ئەرمەنستان نیزیک بە شاری «دوێن» لای ڕۆژ هەڵاتی ئارارات و باشوری ئیرەوان.«الکامل» دەڵێ: ڕەوادی چاکترین هۆزی کوردن کە تیرەی صلاح‌الدین ایوبی لەوانن.

# شەددادیانی ڕەوادی

«ابن اثیر» دەڵێ ئەو تایفەی هۆزی کوردانن لە ٣٤٠ تا ٥٧٠ (ک.م.) حکوومەتیان کردوە و شاری گەنجە پێ تەختیان بووە.

ئەتابەک عەلائەددینی کوڕپە ئەرسەلان ڕەوادی حاکم و فەرمانڕەوای مەراغە بوو و هەتا خودا حەز دەکا دڵ ئاوا و مەرد و ڕەند و سەر بڵیند و باڵا دەست بووە و لە ساڵی ٥٧٤ (ک.م) چووەتە لای «توغرلی سێهەم» ئاخرین پادشای سەلجوقی و ئەویش زۆری ڕێزلێ گرتوە و کوڕی منالکاری خۆی (بی کیارق)ی بەو سپارد، بۆ باش بارهێنان و دەرس‌دان و مەشق‌دان. (ڕاوندی) لە کتێبی «راحە الصدور» بە پادشای دادگەر و داد پەروەری نێودەبا و «حکیم نظامی

گنجوی» بهرام‌نامه، کە یەکێک لە پێنج گەنجەیە بە نێوی «اتابک علاءالدین» کورپەی ئەرسەلانی کردوە ئەوەش چەند شێعر لەوانە:

چون اشارت رسید پنهانی
از سراپردهٔ سلیمانی
پر گرفتم چو مرغ بال گشای
که کنم بر درِ سلیمان جای
در اشارت چنان نمود برید
که هلالی برآور از شب عید
آن چنان کز حجاب تاریکی
کس نبیند در او ز باریکی
چون برید از من از این غرض درخواست
شادمانی نشست و غم برخاست
جُستم از نامهای نغز نورد
آنچه دل راگشاده داند کرد
هرچه تاریخ شهریاران بود
در یکی از نسخه اختیار آن بود
مانده زان لعلی ریزه لختی کرد
هر یکی زان قراضه چیزی کرد
من از آن خُرده چون گهر سنجی
بر تراشیدم این چنین گنجی
آنچه زو نیم گفته بُد، گفتم
گهر نیم سُفته را، سُفتم
و آنچه دیدم که راست بود و درست
ماندمش هم بر آن قرار نخست
باز جستم ز نامهای نهان
کو پراکنده بود گرد جهان
زان سُخنها که تازی است و دری
درسواد بُخاری و طبری

آن ورق کو فتاده در دستم
همه را در خریطه‌ای بستم
آنچه مقصود شد در این پرگار
چار فصل است به ز فصل بهار
اولین فصل آفرین خدای
کافرینش به فضل او است به جای
وان دگر فصل خُطبه نبوی
کین کُهن سکه زو گرفت نوی...
...نظم اولاد او به سعد نجوم
در به درباد تا ابد منظوم
نقشبند طراز افسر و جاه
نصرةالدین ملک محمد شاه
در دو قسمت که ملکشان به هم است
احمدی و محمدی رقم است
نصرت این را به تربیت کاری
فلک آن را به تقویت داری
این ز نصرت زده سه پایه بخت
فلک آن را به چارپایهٔ تخت
چشم شه زیر چرخ مینایی
باد روشن بدین دو بینایی
نام این خضر، جاودانی باد
حکم آن آب زندگانی باد
سایهٔ شه که هست چشمهٔ نور
زان گل و گلستان مبادا دور

# کورد و سەلجوقیان

هۆزی ئاغوزە کە پێش قەرەوڵی سەلجوقیان بوون لە ساڵی ٢٤٩ روو بە مەراغە هاتن تاڵان و وێرانیان کرد و بە هۆی ئەوە کە کورد یارمەتی فەرمانڕەوای ئازەربایجانیان داو پێشیان بە (ئاغوزە)کان گرت تێکیان شکاندن و کوڵیان پێدان. هۆزێکی دیکەیان رۆییبوون بۆ ئەرمەنستان دوای کوشت و کوشتارێکی زۆر روویان کردە ورمێ و هێرشیان بردە سەر ابوالهیجای هازینی کورد کە ئەو ناوچەیەی لە دەسدابوو بەڵام ئاغوزیەکان زۆر شپرزە و بڵاو بوون.

لە ساڵی ٤٢٠ (کۆچی) حکومەتی کوردی رەوادی لە تەورێز دوبارە پێک هات و سازبوونی پایەی بە دەستی وەهسوودانی کوڕی مەملان بوو و تا ٤٢٦(کوچی) دەوامی کرد.

لە ساڵی ٤٢١(کوچی) حکومەتی شوانکارە لە فارس داوو دامەزراو بوو و تا ساڵی ٧٥٦ دەوامی هێنا.

سەر لەشکەر: مظفر زنگنە

لە ساڵی ٤٣٢ وەهسودانی کوڕی مەملان فەرمانڕەوای کوردی نەبەز سەرۆکانی غەزی بۆ شاری تەورێز بانگێشتن کرد و سی مرۆڤی بەجەرگی لەوان لەکاتی نان خواردنداکوشت لەو روەوە غز شکان لە ورمێوە چوونە حەکاری و موسڵ و دەستیان کرد بە تاڵان و کوشتاری عەشایری کورد کە لە کتێبی تاریخی قارەمانی کورد نوسراوە.

بەرگی سێهەمی مشاهیر کرد مردوخ روحانی

# سەلجوقیان

سەلجوقیان سێلاوێکی بەسام و بەترس بوو لە لای خوراسانەوە هات زۆردار و بێزۆر لە کورد و لە تورک لە ئەرمەنی و لە رومی و فارس و عەرەب و چەند تیرەی‌تر لە نێو خۆی‌دا پێچایەوە و شەڕ و شووڕ و بەربەرە کانیی بەینی عەشایری لە بەین برد هەر چەندە توغرل بیگ لە رۆژئاوا زیاتر نیزیک دەبوەوە قەوم و تیرەی غەز توندتر و باش‌تر ولاتیان چۆل و تالان دەکرد هەلدەهاتن. کوردی بشنوی خەلکی فینیک هەرچەند هەلیان دەبرین و مۆلەتیان نەدەدان هێشتا تەواوی ولاتی دیاربەکر و موسل‌یان تالان کرد.لەو زەمانەدا لە کوردستانی رۆژ ئاوا عەشایری ئەبوالشوالک کورە کورەی کوردی بە گوڕی تینوو بەخوێنی داگیرکەرانی غەزکلی شەریان لێ گەرم کردن و زۆریان لە بەین بردن. هۆزی ئەبوالشوک لە زەمانی دەیلەمیان‌دا تەواوی ناوچەی حەلوانیان لە دەستدا بوو و لە ٣٤٠دا معزالدولەی دەیلەمی یارمەتی لێ دەخواستن ئەم حکوومەتە بەدەس پسپۆڕی لێزان ئەبوالفتح محمد بن عناز بناغەی دارێژرا و لە سالی ٣٨٠ تا ٤٠١ ک.م فەرمان‌رەوایی کردووە و ئەو هۆزە لە شارەزوور و کرماشان و بیلوار و دەورو بەریان میری و فەرمان رەوایی‌یان بوە و ئەبوشواک لە سالی ٤٣٨ لە دەورو بەری سیروان وەفاتی کرد و لە کاتێکدا ئولوب ئەرسەلان لە ملازگرد لەشکری قەیسەری رۆمی تێک شکاند دوای ئەوە تەواوی کوردستان و ئەرمەنستان کەوتنە ژێر دەسەلاتی سەلجوقیان و تەواوی ئەو حکوومەتە چکۆلانەی کورد لە بەین چوون مەگەر حکومەتی کوردانی شوانکارە لە ولاتی فارس نەبێ و مەلکشا کە لە گەل قاوردی مامی لە دەور و بەری هەمەدان هەلمەتیان بردە سەریەک و کوردانی بنوغیاز یارمەتی مەلکشایان دا و قاورد تێک شکا لە و رووەوە مەلکشا بەشێک لە ولاتی کرمانی پێشکەش بە سورخاب سەرکۆماری بنوغیاز کرد و لە ئاخری رۆژگاری سەلجوقی داکوردستان بوە جێگەی هێرش و تالان و شەرێکی زۆر خەست و خوێناوی. الکامل دەلێ برێک لە خەلیفەکانی عەبباسی خۆیان لەگەلی کورد نیزیک دەکردەوە تا بە یارمەتی ئەوان خۆیان لە شەڕ و بەلای تورکان بپاریزن.لە زەمانی خەلافەتی ناصر (٥٨١) لە مابەینی تورکان و تورکمان نێوان ناخۆشی زۆر پێک هات و پریشکی بلێسەی ئەو ئاورە شام و دیاربەکر و جزیرە و موسل و شارەزورو خلاط و ئازەربایجانی گرتەوە و دوای دوو سال پێک هاتن و دەستیان دا دەس یەک چونە شەڕی مەسیحی ئەرمەنستان و بین‌النهرین و شام و ئاسیای سەغیر.

# مەغول

مەغول: دوای نیشتە جێ بوونی مەغول لە ئێران قەومی کورد پەنایان بۆ کێو و شاخە کان برد چونکە بە هۆی شەڕی سەلیبی کوردان لە گەڵ مەسیحی دوژمنایەتیان بوو مەغولیش لە گەڵ عیسەوی پەیوەندی دۆستی یان بوو جا بۆیە زۆر لە خۆیان ئەمین نەبوون و بە هیوای ئەوە بوون کە لە دەلاقە یێکەوە تیشکی رۆژی خۆشبەختیان چاو پێ کەوێ هولاکۆ لە کاتی هێرش بردن بۆ سەر بەغدا لە کرماشانەوە تێپەری ئەو دیهاتەی لە سەر رێی بوو بە هیچ جۆرێک نەجاتی نەدەبوو ماڵ و دارایی هەمووی وەبەر تالان دە کەوت و دوای گرتنی بەغدا کوردی شارەزور برێکیان کۆچیان کرد و چوونە مصر و دو عەشیرەی لاوین و بابین کەوتنە الجزیرە باکووری ئەفریقا. گرتنی بەغدا بەدەس هولاکۆوە گەورەترین بەڵابوو بۆ کوردان چونکە رێگە کراوە بۆ سپای مەغول و لە ئازەربایجانەوە هەرکاتێ دەرۆین بۆ بەغداو شام تەواوی خاک و ناوچە کوردە واری دە کەوتەبەر شاڵاوی کوشتار و تالان، لە ساڵی ٦٥٧ هولاکۆ لە ئازەربایجانەوە چوو بۆ وڵاتی حە کاری و هەرچی کورد لە سەررێگەیان بوو بە شمشیر شەق کران و جزیرە و دیاربە کر و میافارقین و ماردینیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و موسڵ ماوەیێک شەڕە شمشیری لە گەڵ کردن بەڵام لە ئاخریدا بە فێل شاریان گرت و بە نێزەی مەرگ ماڵ ومولکیان بە خەڵک بەجێ هێشت.

لە زەمانی الجایتو لە چەمچەماڵ و لە داوێنی کێوی بیستون شارێکیان بە نێوی سولتان‌ئاباد ساز کرد و لە جیاتی شاری (بەهاری) هەمەدان کردیانە پێ تەختی کوردستان و دوای لە بەین چوونی ئێلخانی مەغول دو خانەدانی مەغول کە خزمی یە ک بون یە کێک لەوان فەرمان‌رەوای هۆزی سندوس بوو و ئەوی دیکە سەرۆ کی عێلی جەلایر بوو وڵاتی مەغولیان لەبەینی خۆیاندا بەش کرد لە ساڵی (٧٣٨ ک.م.) کوردستانی ئێران ـ خوزستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی خانەدانی سلدوز و ئەوەی دیکە کەوتە دەست تایفەی جەلایر ـ سەرچاوە: کتێبی دودمان آریائی نوسراوەی سەرلەشکر مظفری زنگەنە لاپەڕەی ١١٤ وکرد تألیفی رشید یاسمی لاپەڕەی ١٩٢ و انسیکلوپداسلام مقالەی کورد ـ الکامل.

# کورد و مەغول

سەر لەشکر موزەفەری زەنگەنە لەکتێبی دودمان ئاریاییدا نوسیویە: تایفە ئاغوزە کە پێش قەرەوەلی سەلجووقیان بوون لەکاتێکی روو بە رۆژئاوا هاتن(وتاش فەراش) یەکێک لە فەرمانرەوایانی غزنەوی بە سی هەزار سوارەوە کە زۆریان کورد بوون پێشیان پێ گرتن بەلاّم فەرماندەی کوردان یەخسیر کرا و کاغەزیان پێنوسی بۆ کوردان کە شەڕ نەکەن و دەس لەشەر کێشانەوەی کوردان بۆ هۆی سەرکەوتنی ئاغوزەکان و لە ساڵی ٢٤٩ روویان کردە مەراغە و وێران و تالاّنیان کرد لە دواییدا روویان کردە هۆزی هازینی و کوشتاری زۆر لە هەر دوولا کرا و چونکە عەشایری کورد لەگەڵ فەرمانرەوای ئازەربایجان یەکیان گرت لەو رووەوە شکستێکی گەورەیان بە ئاغوزەکان هێنا

لە ساڵی ٤٢٠ حکومەتی کوردی رەوادی لە تەورێز دوبارە بەدەستی وەهسودان کوری مەملان پێک هات و تا ساڵی ٤٢٦ درێژەی بوو و الکامل ج ٩ لاپەرەی ١٦٥دا نوسیویە: ئەبولهیجا «ربیب الدولە» خوشکەزای وەهسودانی رەوادی سەرۆک عەشیرەی هەذبانی کە ورمێ و ئەو ناوچەیەی لە دەس دابوو لە ساڵی ٤٣٠ دا لەگەڵ خاڵی چوونە مەیدانی غەز پێشیان پێ گرتن و مێشکیان بە زەویدا پرژاندن و زیانی زۆریان پێ گەیاندن و ئۆردوویێکی دیکەی غەز لە ورمێوە چوون بۆ تالاّنی ناوچەی حەکاری و دەور و بەری موسڵ و کوردەکانی ئەو ولاّتە یەکیان گرت و لە ئابلۆقەیان نان ١٥٠٠ نەفەریان لێ کوشتن کە حەوتیان سەرپەلی غەزبوون و زۆریشیان لێ یەخسیر کرا.

«مەسعودی» نوسیویە: مەلکشای سەلجوقی، بۆ لە بەین بردنی حاکمی کرمان کە شۆرشی ساز کردبوو بیێ بە شا، لە لەشکری کوردان یارمەتی ویست و دوژمنیان راونا و سەرکوتیان کردن حکومەتی فەزلەوەی لوڕستان لە نیوەی سەدەی پێنجەمدا(کۆچی) بناغەی دارێژرا و تاکوو نیوەی سەدەی نۆهەم ئازادی و سەربەخۆیی خۆی راگرت. (سەرچاوە لە مەسعودی و ابن خلکان)

# کورد و تەیموری گورگان

کوردستان وەک زۆر لە ناوچەکانی دیکەی ئێران کەوتە بەر هەڵمەتی لەشکری خوێن خۆری تەیموور لە موزەفەرنامەی شرف‌الدین دوژمنایەتی و بەربەرەکانی کوردان لەگەڵ تەیمور نووسراوە یەکێک لەوان بەربەرەکانی عیزالدین شێر حاکمی حەکاری بوو لە قەلاّی وان کە قەلاّکەی زۆر سەخت و رەوەزێکی حەستەم بوو دەورەی لێ درا و گێچەڵی تێ هالاّندرا و تەیمور فەرمانی‌دا لە هەموو لایێکەوە دەس بەکاربن و پشوو نەدەن و هێرش بەرنە سەر قەلاّی وان جا وەک مێرولە تێی هالاّن وەک لێزمە باران قوڵینگیان لێ‌دان بەردی بناغەیان دەرهێنان کە شاعیر لە بارەی قەلاکەوە دەڵێ:

شاهی کە بە تیغ ملک ایران بگرفت ماه علمش سرلوحە کیوان بگرفت
تاریخ گرفت حصار وان را گر پرستندت بگو کەکی وان بگرفت

شاعیرێکی دیکە دەڵێ:

ز بس کشتە کافکند بر برّ و دشت جهان گفت بس کن کە از حد گذشت

# کوردی رەوادیان

رەوادیان: لە سەدەی چوار و پێنج دا لە ئازەربایجان دوو هۆزی گەورە بە نێو رەوادی (بە شەددەی واو) و رەوادی (بێ شەددەی واو) لە سەدەی هەوەڵی ئیسلامدا لە ئەرمەنستان نیزیکی دوێن نیشتەجێ بوون کە ابن ئەسیر دەڵێ بەرێزترین هۆزی کوردن کە باو و باپیری صلاح‌الدین لە وان بووە بەلاّم رەوداوی بەشەدی واو لە قەومی ازد لە یەمەنەوە کۆچیان کردوە هاتونەتە ئازربایجان ناوچەی کوردنشین لەو رووەوە نژادی خۆیان لە دەس داوە بوونە کورد.

ابومەنسور وەهسودان کوری مەملان بە پادشایی گەیی. بە نوسراوەی کەسرەوی نیزیک ساڵی ٤١٠ (ک.م.) کەمی دوای مردنی بابی.

غەزەکانی لە ئازربایجان نیشتە جێ کرد تاکوو دوژمنەکانی یانی رومی و ئەرمەنی گورجی بە شمشیری ئەوانە تێك شکێنێ بەلاّم دوای بەینێ دەسیان کرد بە تالاّنی خەڵک. دەستەیێکی دیکە لە رەیەوە هاتن و زۆریان بۆ خەڵک هێنا لەو رووەوە ئەمیر وەهسودان لەگەڵ ئەبولهیجا کە خوشکەزای بوو سەرۆکی کوردانی هذبانی دەستیاندا دەس یەک و زۆریان لە غەزان کوشت کە قەتران تەورێزی لەو بارەوە دەڵێ

به جنگ آهنگ او کردند با پیکان بسا سرکشی
بـه مـردی بـازگردانید بـر انـدامشـان پـیکان
کـنون تـا از سـر ایشـان تـو سـایه بـر گـرفتنی
نگه کن تا چه آوردەست گردون بـرسر ایشـان

سەفەری ئەمیر وەهسودان بۆ گەنجە بۆ لای ئەمیرابوالحسن لشکری «دوهەم» لە فەرمان ڕەوایانی شەدادی لە (اران) و (گنجه) بوو کە لەگەڵ ئەمیر وەهسودان کەمێک بەین ناخۆشیان بوو لە دواییدا هۆی ئاشت بونەوەیان پێک هات و ئەمیر وەهسودان چوو بۆ دیداری لەشکری لە قەتران لەو کاتەدا لە گەنجە بوو. ئەمە چەند شێعرێک لەو بارەوە

کنـون گشت دو خسرو به یکدیگـر مـوصول
کنون که گشت دو کوکب به یکـدیگر مـقرون
دو شـــــهریار قـــدیم و دو جـــایگاه قـــدیم
هــمان دو خســرو و مــنصور و سـید مـیمون
«امـــیرابـوالحســـن»و شــهریار«ابـومنصور»
که نصرت آید و احسـان از آن و ایـن بـیرون

# کورد و سەفەوی و عوسمانی[1]

سەر لەشکر موزەفەری زەنگەنە لەکتێبی دوودمانی ئاریایی لە لاپەڕەی ١١٩ نوسیویە شائیسماعیل دەیهەویست لە ئێراندا حکومەتی محەللی نەمێنێ و بەلام عوسمانی بە پێچەوانەی سەفەوی دەیهەویست حکومەتی محەللی و نێو خۆیی لە هەموو جێی ئێران ببێ تاکوو بەر هەڵست لە زۆر و توانایی حکومەتی مەرکەزی بکەن.

بەخشی بەگ حاکمی جزیرەی ابن وعومەر دەیهەویست سوپای ئێرانی لە وێ وەدەرخا و ئەمیر سوزان سەیدبەگ، کەرکوک و هەولێری خستە ژێر دەسەلاتی خۆی سولتان سەلیمی عوسمانی بۆ دڵنەوایی عەشایری کورد ١٧ ئالای حکومەتی دایمی سازکرد و ٥٠٠ خەلات بۆ فەرمانڕەوایان و ٢٥ هەزار دیناری بۆ مەلا ئدریس نارد و پەیمان و بەڵێنیدا سەربەخۆیی و فەرمانڕەوایی ناوچەکانی کورد پارێزراو دەبێ ٢ـ فەرمانڕەوایی لە بابەوە بە کوڕبگا بەو جۆرەی باو بێ لە ناوچەدا ٣ـ کورد و تورک لە شەڕدا یارمەتی یەکتر بدەن ٤ـ لەکاتی هێرشی دوژمن بۆ سەر کورد تورک یارمەتی کوردەکان بکا.

ولاتی دیاربەکر کرابە ١٩ بەش ١١ بەشی وەکو بەشەکانی ئەناتۆلی لە ژێر چاوە دێری تورک

---

١ ـ نوشتهٔ ابن بزاز بدین سان آغاز می‌یافته: «فیروزشاه از فرزندان شیخ ارباب الطریق ابراهیم ادهم قدس سره بود وقتی با لشکر کرد از طرف سنجار خروج کرد...». آنچه به این گمان ما یاوری می‌کند که آن است که در یک نسخهٔ کهن از صفوة الصفا که در دست است در تبارنامهٔ شیخ صفی، فیروزشاه را چنین یاد می‌کند: «الکردی السبحانی پیروز شاه زرین کلاه». غلط و خود دیگر شده از «السنجانی» یا «السنجاری» می‌باشد.
حمدالله مستوفی همزمان شیخ میبوده چنانکه نوشتهٔ او را آوردیم، مردم اردبیل را شافعی و مرید شیخ صفی می‌داند در این نوشته سخنی از کیش خود شیخ نمی‌راند. لیکن پیداست که اگر شیخ هم سنی شافعی نبودی آن را به آشکار آوردی. گذشته از آنکه «پیر شیعی و پیروان سنی» در خور باور کردن نیست.
««سلسله طریقت» شیخ که ابن بزاز در کتاب خود یاد کرده از سلسله‌های بنام سنیان است و برخی از شیخهای آن، از جمله شیخ ابوالنجیب سهروردی و دیگران، از علمای بنام شافعی می‌بوده‌اند. پس بیگمان است که شیخ صفی هم شافعی، یا باری سنی می‌بوده است.
در این جمله‌ها گذشته از آنکه سنی بودن شیخ را آشکار می‌نویسد این کارها که از او یاد می‌کند از «احکام» شافعی می‌باشد. در باب چهارم صفوة الصفا که دربارهٔ «کلمات و تحقیقات» شیخ صفی است حدیثهایی که یادشده همه حدیثهای سنیان است که از زبان انس بن مالک و ابن عمر بوده و از کتابهای صحیح مسلم و صحیح بخاری و احیاءالعلوم غزالی و دیگر کتابهای سنیان آورده شده است. اینها دلیلهایی است که سنی بودن شیخ صفی را رسانیده جای گمان دیگری در آن باره نمی‌گذارد. دهخدا

ئیدارە کرێ و هەشت بەشی لە ئیختیاری فەرمانڕەوایی کوردەکان بێ و هەر بەو جۆرە ناوچەی وان کرا بە ٣٧ بەش و چوار حکومەتی کورد پێک هات: ١ـ حکومەتی حەکاری ٢ـ حکومەتی بتلیس ٣ـ حکومەتی مەحمودی ٤ حکومەتی بنیانیش. ئەولیاچەلەبی بێجگە لەمانە چەند حکومەتی دیکە نێو دەبا و نوسراوە پێک هاتنی ئەم حکومەتانەی کوردستان لەو زەمانەدا بە هۆی هەستی رامیاری و سیاسەتی مەلا ئیدریسی بوو و لە پێشدا کوردستانی عوسمانی ٤٦ فەرمان ڕەوایی کوردی بوو کە زۆربەیان لە زەمانی سولتان سەلیم ئازادێکی بە ئارەزوی خۆیان درایێ کە لە روی یاسا و قانونەوە حکومەتیان بەرێوە دەبرد و لە لایان سولتان سەلیمەوە بە هەریەک لە فەرمان ڕەوایانی کوردستان تەپڵ و ئاڵای تایبەتیان پێدرا کە نیشانەی حکومەتی ئەوان بوو مەلک‌خەلیل ئاخرین پادشای تیرەی سوڵتان سەلاح‌الدین ایوبی یەکێک بوو لەو حاکمانە.

سولتان سەلیم زۆری رێز لە مەلا ئیدریس دەگرت و لە سەفەر دا لەگەڵ خۆی دەبرد چونکە کوردستانی کوێستان ولاتی جودی قرآن و نوح و ئیبراهیم لە پێغەمبەران و جێگەی شێر و پڵنگان بە ئارامی بێ شەڕ و شور دایە دستیان هەرچەند کوردستان لە زەمانی ئاشوری، روم، یونان تا ئەو کاتە لە هیچ رۆژگارێ بە تەواوی نەکەوتۆتە دەس زۆردار و هێرشی دەسەلات دار.

شاتەهماسب لەگەڵ لەشکرێکی زۆر لە ساڵی ٩٣٦ دەوری بەغدای گرت و زولفەقارخان بە دەستی دوو نەفەر لە خزمی خۆی کوژرا و بەغدا کەوتە دەس ئێرانیان. لە پاییزی ساڵی ٩٤٠ کۆچی ئیبراهیم پاشای لەگەڵ سپایێکی زۆردار لە ئیسلامبولەوە هێرشی هێنا و زستان لە حەلب ماوە و دوایی هات تەورێزی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی. شاعەباس لە نەورۆزی ساڵی ٩٩٨ک دا پەیمان نامەی ئاشتیان لە مابەینی ئێران و عوسمانی ئیمزا کرد و لە روی ئەو پەیمانەوە ولاتی ئازەربایجان، شیروان، گورجستان، لوڕستان و شارەزور بوە بەشێک لە خاکی عوسمانی و ئەو بڕیارە ١٣ ساڵ دەوامی بوو.

## سارم خان

سارم کوڕی سەیف‌الدین موکری لە زەمانی ئەودا شا ئیسماعیلی سەفەوی بۆ داگیر کردنی موکوریان چەند جار لەشکری نارد هەمو جارێکیش لە دوای هەڵمەت و شەڕو شورێکی زۆر قزلباشەکان تێ دەشکان و بەرەو پاش دەکشانەوە و لە ساڵی: (٩١٢ک) شا ئیسماعیل لە زستاندا هاتە شاری «خۆی» و لەوێ را بە سەرداری عەبدی‌بەگ و چەند نەفەری دیکە لەشکرو سوپاو قزلباشێکی بێ ئەژماری ناردە شەڕی سارم بەگ و هەر دوو لە شکرپێک وەربوون و پاڵەوانان

ونەبەزانی کورد زەرەر و زیانێکی قورسیان لە لەشکری شادا و قزلباش زانیان بەنی سارم خانیان پێبانادرێ پاشەکشەیان کرد و رێی هەڵاتنیان گرتە بەر و مرۆڤی قارەمانی کورد کەوتنە سەریان زۆر بەی زۆریان بەدەمی شیر لەت و پەت کران و برێکیان دەرباز بوون بەڵام سارم خان دەیزانی شائیسماعیل لە دوژمنایەتی دەس هەڵناگرێ لەگەڵ چەند نەفەر لە میرانـی کـوردستان چـوونە ئاستانەی سوڵتان سولەیمان خـانی عـوسمانی و زۆری رێـزیان لێگـیرا و بـەقەدر و حـورمەت گەرانەوە وڵاتی خۆیان بەڵام زۆری پێ نەچوو کە مردن درگای پێگرت و لە ژیان بێ بەشی کرد.
شەرەفنامە وەرگێراوی هەژار لاپەرەی ٥٣١
تاریخی مەهاباد نوسراوەی سەید محمد صمدی، مشاهیر کُرد لاپەرەی ٣٧٢.

# ئەمیر خانی لەپ زێرین

ئەمیرخان ئاخرین فەرمانرەوای عەشایری برادۆست بوو کە لەگەڵ «شاتەهماسب سەفەوی» زۆر دۆست بوو و شا حکومەتی ورمێ و شنۆی بەو سپارد ئەمیر خان لە شەرێکداکە بۆ مـیر عومەر بەگ ی سۆرانی دەکـرد دەسـتێکی پـەڕی و لە دوای ئـەوەی شـاعەبباس بـووە شـا و ئازەربایجانی لە عوسمانی سەندەوە ئەمیرخان چووە لای و ئەویش زۆر رێزی لێنا و دەستوری دا لەزێڕ دەستی بۆ دروس کەن و بەم هۆیە بە نازناوی (لەپزێڕ) نێوی دەرکرد و شا دژ و قەڵای مەرگەوەر و تەرگەوەر و ورمێ و شنۆی پێ بەخشی و ئەمیرخان کەوتە ئەوبیر و باوەڕەکە لە جێی کۆنە دژ و قەڵاکە لە زەمانی ساسانیاندا دروست کرابوو بەڵام دەستی رۆرژگار تێکی دابوو لە ١٨ کیلومتری باشوری ورمێ قەڵایێکی پتەو و سەقامدار دامەزرێنێ و دوای ئەوەکە دروستی کرد چەند قەڵایچەیشی لە نێودا سازکرد و عەنباری ئاو و ئازوقە و پاسگەی دیدەوانی سازکرد.
و لەوکاتەوە دەستی بەوکارەکرد سەرپەلی قزڵباشەکان و شیعەمەزهەب کەوتنە بەربەرەکانی و لای شا بۆیان تێچاند و پیر بداغ بەگی فەرمانرەوای ئازەربایجانیش بێکار دانەنیشت و ئەویش خەیانەتی بە ئەمیرخان کرد بۆ ئەوەکە شانەهێڵێ قەڵاکەی سازکا،بەڵام خان گوێی نەدانێ و هەر وەستا و کرێکار کاریان لە سەر کرد تا تەواویان کرد هـەر لەوکـاتەدا نـزیکەی بیست هـەزار کەسێک لە عەشایری جەلالی لە زوڵم و زۆری مراد پادشای عوسمانی کۆچیان کرد هاتنە ئێران و شا دەستوری دا دەهەزاریان لە نێو خاکی برادۆست نیشتە جێبن و هەروەها حەسەن خـانی والی هەمەدانی بە لەشکرێکەوە نارد و رای سپارد بۆ لای ئەمیرخان کە جێگە بە جەلالیەکان بدا

لەویٚ بمێنن و ئەمیرخان لەبەر ئەوەکە جێگەی هۆزەکەی خۆی لەنگ نەبیٚ گوێی بە فەرمانی شا نەدا و لەگەڵ قزڵباش بە شەڕهات و زۆری شڕکردن لەبەر ئەوە شا بەسەرکردایەتی ئیعتماد الدولەی وزیر لە شەعبانی ساڵی ١٠١٧ ک.م لەشکرێکی زۆری نارده شەڕی ئەمیرخان و دەوریٚ قەڵایان دا و نیزیک بە چوارمانگ شەڕیان کرد و زۆریان لیٚ کوژرا و هیچ کارێکی گرینگیان پیٚ نەکرا تا سەرچاوەی ئاوی قەڵاکەیان دۆزیەوە و ئاویان لیٚ بڕین بەڵام هەور هات و بارانێکی زور باری و ئەنبارئاوەکانی پڕکردەوە بەڵام سەرکردەی لەشکری ئێران فەرمانی داکە هەموو سوپا و سەربازەکان هەڵمەت بەرن بۆ قەڵاکە یا مردن و کوژراوی یاگرتن و تێک دانی قەڵا ئاخری قزڵباش توانیان بورجێک لە قەڵاکە بگرن و لەوکاتەدا هومێدکەوتە دڵی سەرباز و بەگولەتۆپ قەڵایان داگرت و زۆرێکیان لە قارەمانانی کورد لە بەین برد و لە جەنگی شەڕدا ئیعتمادالدولە مرد و محمدی بێگدلی بوە جیٚنشینی ئەو خان زانی هەتا سەر لەگەڵ ئەو هەمو سوپا و تۆپ و تفەنگەی پیٚ ناکریٚ نامەیێکی بۆ بێگدلی نوسی نەمکوژن تا چاوم بە شا دەکەویٚ قەڵاکە چۆڵ دەکەم فەرماندەی سوپای ئێران پیٚی خۆش بوو و خان هات بوە میوانی لە نێو خێوەتدا میوانداری لیٚ کرا بەڵام دەیانهەویست بە بڕیار و قەولی خۆیان رەفتار نەکەن و لێیان کەوتنە فێڵ خەیاڵیان بوو چەکیان لیٚ بستێنن بیانکوژن خان ئاوداڵ لە ئەلیاس خەلیفە راپەڕی و بە شیر لەت و پەتی کرد و پاڵەوانانی کورد و ئەمیرخانی قارەمان دوایی بە ژیانیان هات. (مشاهیر کورد).

# کورد و نادر

نادر بۆگرتنی تورکومانانی خوارەزم و سزادانیان لەشکرێکی زۆری کۆکردەوە و روی کردە ئەو وڵاتە و سوپا و لەشکرێکی بە برایم خانی براشی سپارد کە بچێتە سەرکوردی قراچوللو لە ناوچەی گرمە خان و سملقان (بجنورد) گێچەڵیان تیٚهاڵێنی و وڵاتەکەیان لیٚبگریٚ و لەکوشتن و تاڵانیان درێغ نەکا و لەم لاشەوە سەرۆک و عەشیرەکان نەجەف سولتان و شکربیگ یارمەتی و کۆمەکیان لەکوردی ناوچە ویست ئەوانیش وەک گورگی باران دیدە لە مەردایەتی دا بیٚ وێنە، هاتنە مەیدانی شەڕ لە لێک دانی شمشیر چەخماخەی ئاور دەباری لەشکری هەردولایان لە ژمارە بەدەر و زۆرتر لە دلۆپەی بارانی پەڵە و زیاتر لە پەڵکی داران بوون و کوردی ناوچەی ئالاداغ وەک پڵینگی نێو زەردان هەڵمەتیان بردە سەربرای نادر، برایم خان و قۆشەنەکەیان شکان

هەلاتن لە ترسان خۆیان خستە قەلای یوزباشی بەلام کوردە دلێرەکان چوار شەو و رۆژ لە دەوری قەلاکەیان دا نیزیک بوو بیروخێنن برایم خان کە زانی دژەکەیان تێك دەدرێ جا لەبەر ئەوە لە تاریکی شەودا خێرا و زوو خۆیان گەیاندە بورجی راز حەوت رۆژ شەر دەوامی بوو کوردەکان شالاویان بە توندی دەس پێ کرد لەشکری نادر خەباتیان کرد خوێنیان دا و خۆیان دابەکوشت بەلام ناهومێدی سەرو دلی گرتن مەیدانی شەریان چۆل کرد و پاشەکشەیان کرد و خەبەری شکانی برایم خان لە دەشتی قبچاق بە نادرگەیی ئەو دەیزانی براکەی مەردی مەیدانی کوردان نیە جا لە بەرئەوە نادر گەراوە بۆ لای برایمخان بەلام زستانێکی زۆر سەخت بوو وشکە بەند و بەستەلەک دنیای وەک بەرد لێ کردبوو.لە رێی شاخی گرماب (کێوی گلیل)وە هاتنە خوارێ و سەربازی پیادە بەفریان دەکوتا و رچەیان دەشکاند زوقم و سیخوار و مژ و بارن رێی پر دەکردەوە بەلام کولیان نەدا هەتا هاتنە ناوچەی جربستان. قوشخان لەوێ دەستوری دا بە شاەقلی بیگ کە نابێ خۆبگری هەتا ناوچەی کوردان شوانلو دەگری و نادر خۆی بە سپایێکی زۆر و زەبەند کە سەر و بنی نەبوو بە تۆپخانەوە هات بۆ شەری کوردانی قراچورولو و کاتێکی خەبەری هاتنی نادر لە ناوچەدا بلاو بۆوە،کوردان هاتن پێشیان پێگرتن و سەنگەریان لێگرتن بەلام نادر تۆپخانەی بوو، تۆپی خستە کارگوللەی تۆپ دەهات وەکو سوججە مار بەلام چەکی کوردان تەنیا شمشێر و نێزە بوو و قەلغان، جا شەری نابەرابەر بوە هۆی ئەوە ناچار چارەیان لەوەدا دی لە نێو ئاوری باروتدا بوەستن و پێویستە تێیقوچێنن تا بمێنن ولە دەرفەتدا دوژمن بە چۆکدابێنن زۆربەی مێژوو نوسان کوتویانە کورد قراچولو دایمە پالەوانانە ژیاون و لە شەردا ئەو پەری مەردایەتی و ئازایەتییان لە خۆ نیشانداوە و بەلگەو نیشان بۆ ئەم مەبەستە پەری مێژووە لە هەلمەت بردنیان لە مەیدانی شەر بۆ رومیان و هێرش بردنیان بۆ هێندوستان و شکانی ئەشرەفی ئەفغان و وەرگرتنەوەی یەخسیرانی سەفەوی لە ئەفغانیان بەدەستی کوردان بوە بێ گومان.

## کەریم خانی زەند

کەریم خانی زەند کوری ئیناق لە تایفەی (لەکی کورد) لە دەوروبەری «مەلایر» نیشتە جێ بوو و لە دوای بابی سەرۆک عەشیرەی زەند بووە و لە (۱۱٦۲ ک. م) خۆی لە برایم خانی برای نادرشا نیزیک کردوە، بەلام کاتێکی برایم خان بەدەستی شاروخی نەوەی نادر کوژرا کەریم خان توانایێکی زۆری لە دلدابوو و لە ئاکامدا بەسەر دوژمنانی خۆی دادا: عەلی مەردان خانی

بەختیاری و محەمەد حوسێن خانی قاجار و ئازاد خانی ئەفغانی و فەتحعەلیخانی ئەفشاری بەزاند و تێکی شکاندن، و زۆر لە خەنیمەکانی کوژران. کەریم خان دوای ئەوە چووە خوزستان و ئەوانەی یاغی بوون وەکوو تایفەی ئاڵی کەسیر و کەعب کە خۆیان بە شێرەکوڵلە دەزانی لە پاش دوو رۆژ بەربەرەکانی بەسەر شۆڕی هاتن کە لێیان ببورێ و لە شکرێکی بەسەرپەلی صادق خانی برای بۆ بەسرە نارد. و ئەویشیان خستە ژێر دەسەلاتی خۆیان و «شیرازی» کردە پێتەختی خۆی و لە ١٣ مانگی سەفەری ساڵی ١١٩٣ گیانی پاکی بەخودای تاک دا، و سی ساڵ و هەشت مانگ و نۆرۆژ پادشایی کرد و پیاوێکی زۆر ئازا و نەبەز بوو، و لە کاتی خۆیدا زۆر بە روحم بوو، لە بیری ئەوەدا بوو کە وڵات ئاوەدان بێ فەقیر و هەژار نەمێنێ و ئەوە لە هەموو کەس روونە کە کەریم خانی زەند لە نێو پادشایانی ئێراندا بە ئاکاری تەرز و کرداری بەرز و شکۆدار ناو بانگی دەرکردووە.

## کورد لە سەدەی سێزدەهەمدا

لە کتێبی تاریخ و جغرافی دارالسلطنته تبریز لاپەرەی ٢١٢ نوسیویە: احمدخان لە هۆزی کوردی دنبلی لە رۆژگاری خۆیدا حاکمێکی نێودار بوو ئەوەندەی لە راست دوژمنان ئازا و نەبەز بوو سەد ئەوەندە دادپەروەر و دادگەر بوو چاوتێر و دڵاوا و مەردو رەندو خێرەومەند بوو وگەلی کورد فەرمانبەری بوون و خۆی و سەڵماس و مەرەند و تەورێز و جار و باریش وڵاتی قراجەداغ فەرمانی ئەویان بەرێوە دەبرد و هەر ساڵ دوازدە هەزار تمەنیان باج بۆکەریم خانی وەکیل دەنارد و چەند مرۆڤی لە خزمەکانی بە نێوی بارمتە لە شیراز بوون و لە شاری خۆی کۆشک و تەلار و دەزگای پادشایی سازکرد و هەمیشە ٥٠٠ نەفەر چەک بە دەست ئاگاداریان لێ دەکرد و ئینسانێکی لێ هاتوو پێکەوتوو و زرینگ و بە هۆش و ئاگا بوو لەگەڵ فەرمانڕەوایانی دەورو بەری وەکو ئیبراهیم خەلیلخان جوانشیر و فەتحعەلیخان ئەفشار بیگلەربیگی ورمێ و احمد خانی موقەدەم بیگلەربیگی مەراغە و سادقخان شقاقی کە هەموویان سەرکردە وبە نێوبانگ بوون بە دۆستایەتی و ئاشتی لەگەڵیان بوو لە حاجی میرزا یوسفی موجتەهید دەگێرنەوە کە رۆژێ باسی دادپەروەری ئەحمەدخانی دەکرد و دەیکوت لە دوای مردنی نەجەفقولیخان خان احمدخان فەرمانی داکە خودادخان جێنشینی بابی بێ و دوای بەینێک یاغی بوو احمد خان بە چل هەزار سەربازی نەبەزەوە هاتە تەورێز چوە دژی تەورێز ئەو چەند وەختە لەشکر لەوێ بون پەری کایێک زوڵم و زۆر لە ناوچەی تەورێز لەکەسێک نەکرا.

ئەحمدخان دوای سی ساڵ حکوومەت لە شاری خۆیە رۆژی یەکشەمە ١۴ ربیع الاول ساڵی ١٢٠٠ بەدەس برازای خۆی کەلبعەلیخان و سلیمان خان کورانی شەهبازخان شەهیدکرا و حوسینقولیخان کوڕی ٢٢ ساڵەی لەجێی بابی بووە حاکمی وڵات و تاریخی خۆی لە لاپەرەی ١٧١دا نوسیویە مومکینە ئەم پیلان گێڕانە و دەستە و بەستەیە لە لایان ئاغا محمد خانی قاجارەوە بووبێ چونکە لەوکاتەداکەوتبوە بیر و باوەری وەدەس هێنانی تاج و تەخت.

# حەمزاغای مەنگوڕ سەدەی ١٣

حکومەتی سابڵاغ «مهاباد» درابوو بە لوتفعەلی میرزا نەدیدەی فەتحعەلی شای مەشهور بە شازادە کە پیاوێکی بە فیز و خۆبە زلزان و رشوەخۆر بوو خەڵکی توشی ئازار و چەرمەسەری دەکرد و بۆماڵیات زۆری بۆ خەڵک بەتایبەت ئاغاکان هێنابوو زنجیر و زیندان و جەریمەشی دەکردن جائەم جار بابێینە سەرباسی حەمزاغای مەنگوڕ کە هاتە شار و دیدەنی لە شازادە کرد و دوای قسەو باس ئیزنی وەرگرت بچێتەوە دێی خۆی، قەبوڵی نەکرد و رازی نەبوو بچێتەوە دێ و کوتی ئەگەر حەمزاغالە وەختی خۆیدا نەگەڕێتەوە تەمێی دەکەم حەمزاغاگوێ نەدایێ و بە بێئیجازە چووە دێی خۆی و شازادە لە مانگی رەمەزاندا بە حکومەتی تەورێزی خەبەرداکە حەمزاغا لە ناوچەدا سەربزێو و یاخییە کەمێ لەدوای ئەمە مامقلیمیرزا شازادە و حەمزاغای ئاشت کردەوە.

بەڵام چەند رۆژێک دوای ئەوە شازادە بە هۆی نەدانی ماڵیات مرۆڤێکی خزمی قادراغای زیندانی کرد حەمزاغا تکای بۆکرد نەجاتی بوو دوای ئەوە عەزیزئاغای فەتتاح کە یەکێک لە دۆستانی حەمزاغا بوو هەر بە هۆی قەرزداری حکومەتەوە زیندانی کرا هەر لەوکاتەشدا حوکمی گرتنی حەمزاغا لە تەورێزەوە هاتبوو هەر چەند نێوان ناخۆشی ئەو لە گەڵ شازادە دانەمابوو.

رۆژێک نیزیک رۆژئاوا حەمزاغا بۆ قەول و قەراردانانی ماڵیاتی خۆی و جێبەجێ کردنی کاری عزیزئاغای فەتتاح دەچێتە دارالحکومە و چونکە میرزاابوالقاسم لەوێ بوو ئەوەی ئەو دیویە و گێراویەتەوە بێ کەم و زیاد لێرە نوسراوە لە وەتاغی خوارێی (هاوکەف) عەمارەتی شازادە لە گەڵ میرزاتقی خان کە میرزاونوسەری بوو بەڵام لە هەمو کاسەیێکدا کەوچک بوو پێکەوە دانشتبوین لە ناکاو دیم ئەوە حەمزاغا لە گەڵ برازایێکی و قلیانچی و نوکەری هاتنە ژورێ و لە بابەت ماڵیاتەوە لە گەڵ میرزاتەقی باسی کرد ئەویش پێی کوت مالیاتی تۆ هەزار تمەنە حەمزاغاکوتی ماڵیاتی ئەسڵی من هەمیشە چوارسەد تمەن بووە میرزاتەقی کوتی ئەی بۆ پارە کە

هەزار تمەنت دا ئەویش لە جوابدا کوتی چوارسەد تمەن مالیات بوە و دوسەد تمەن پیاوەتی و لە گەڵ ئەوەش من بەینێکی زۆر لە شاردا بوم خزمەتم بە حکومەت کردووە هەشتسەد تمەن خەرجم بوە میراز تەقی کوتی: تۆ چ خزمەتێکت بە حکومەت کردوە؟ ئەو قسەی بە جۆرێک کردکە بوە هۆی دڵ ئێشانی حەمزاغا و لەو کاتەدا میرزاتەقی هەستا رۆیی کوتی: دەچمە لای شازادە ئەم قسە و باسەی بۆ دەگێرمەوە با بزانین دەڵێ چی میرزاتەقی رۆیی و زوو هاتەوە لای درگا دانیشت زۆری پێ نەچوو کە دیم فەرڕاش باشی شازادە لە گەڵ یەک نەفەری دیکە کە زنجیرێکی بە دەستەوە بوو هاتنە نێو وەتاغەکە و روی کردە حەمزاغا کوتی ئەم زنجیرە شازادە بۆ تۆی ناردوە دەبێ زیارەتی کەی حەمزەئاغا لە بیستنی ئەم قسە سەرگەرم و تۆڕە بوو بە زمانی تورکی کوتی: «بَن بونی قبلول اِتمم» یانی من قەبولی ناکەم و یەکجار زوو هەستا و دەس بە خەنجەر هەلمەتی بردە سەر فەرڕاش باشی و میرزاتەقی زوو هەلات بۆ تەبەقەی سەرێ خەبەری دا بە شازادە. میرزاابوالقاسم دەڵێ: من خۆم نوسان بە دیوارێکەوە و حەمزاغا دەس‌بەجێ چرای کوژاندنەوە خۆی و برازاکەی دەرپەڕینە دەرێ بەلام لە حەساری دەنگی چەند گوللە هات برازاکەی و قلیانچی تیریان وێ‌کەوتبوو حەمزاغا بە خەنجەر یەکێ لە نۆکەرانی شازادەی دابوو بە زەویدا و ئەوی دیکە هەلاتبوو و تێگەییبوو کە ئەم‌کارە نەخشەی پێشوەوە و شکی تێدانیە درگایان لێ گرتوە وەک هەورە تریشقە زوو روی کردە درگا و سەرباز بە نێزە پێشی پێ گرت نەیێلێ بڕوا حەمزاغا بە دەستێ سەری نێزەی گرت و بە دەستی دیکە سەربازی وەبەر خەنجەر دا و لە پێش ئەوەیدا بچێتە دەرێ هەرای لە برازاکەی کرد و چونکە لە لایەن ئەوەوە جوابی نەبیست روی کردە درگای حەوشەکە بە قۆنداغی تفەنگ وەریگەڕایێ سەربازی دەرکەوانی دا بە عەرزدا و لە گەڵ نۆکەرێکی دەرگایان شکاند و رۆینە دەرێ چونە کوچە چەند نەفەر پیاوی خۆی بە ئەسپەوە راوەستابون و دەستەی خۆی کۆکردەوە و بەدەوری شاردا بە سواری گەران و تەپلی شەریان لێ‌دا و لە ئابلوقەیان نا و شازادە کە رۆژ دەبێتەوە عزیز ئاغا لە زیندان ئازاد دەکا و کوژراوەکان دەداتە دەست مەلایێکی شارکە بیداتەوە بە حەمزاغا ئەویش دەیان باتەوە دێی و چونکە شازادە دەزانێ حەمزاغا دەس هەڵناگرێ و هەتا شیری دەبیرێ و هێزی بڕدەکا بە گژیدا دەچێ و لە هێزی حکومەت سڵ ناکا و ناکشێتەوە لە حکومەتی ئازەربایجان داوای کۆمەکی نیزامی دەکا و محمد حسین خانی بەختیاری و محمد سادق‌خان و رەحیم‌خان چلبیانلو و عەشایر بە کۆمەک شازادەوە دێن لەشکر لە دەوری دێ بەرەنگاری حەمزاغا دەبن بەلام حکومەت ناچار بوو بە شکاوی و هێز نەماوی و بە پاشدا بگەڕێتەوە و لەو رۆژانەدا شێخ عبیدالله شەمزین سەرۆک عەشایر و خەلیفەکانی لە تورکیەی عێراق و ئێران لە دەوری کۆ ببونەوە تاله بارەی گەلاڵەی هەلمەتیان بۆ ئێران راوێژ بکەن لەو کاتەدا خەبەری ناکۆکی حەمزاغای مەنگوڕ لە گەڵ حکومەتی ئازەربایجان بە شێخ گەیی پێی خۆشحاڵ بوو خەلیفەیێکی خۆی بە ناوی «شێخ

کەماڵ» لە سەیدانی دێی «خاڵدار» نارد بۆ لای حەمزاغا و ئەویش هات و شێخ حەمزاغای لەگەڵ
کوڕی خۆی شێخ عبدالقادر کە جوانێکی ۲۳ ساڵە بو ناردنی بۆ ناوچەی مەرگەوەر و تەرگەوەر.
بۆ هێرش بردن عەشایر مەنگوڕ، مامش، پیران،گەورک، زەرزا، فیض‌الەبیگی، دهبکری، هرکی
مەرگەوەر، بیگزاد، تەرگەوەر و... هتد تەیار بوون
بەم جۆرە نۆ هەزار سوار و حەوت هەزار پیادە و دەهەزار نەفەر سیایی لەشکر حازر و ئامادەی
هەڵمەت و هێرش بون لە میاندواوە. بەڵام باس و گفت وگۆ لە بابەت ئەم شەڕە و ئاکام و دەس
هاتی و هۆ و بەڵگەی سەرنەکەوتنی لە زۆر کتێبی گرینگی تاریخی‌دا هاتوە بۆ باسی شێخ عبیداله
پێویستە تەماشاکرێ چونکە لێرەدا باس لە کوشتنی حەمزاغا دەکرێ بە فڕ و فێڵ و پیلان گێڕانی
امیرنظام گەروسی کوژرانی حەمزاغا دوای گەرانەوەی شێخ عبیداله بۆ خاکی عوسمانی و گرتنی
و دور خستنی بۆ حیجاز حەمزاغا لەگەڵ سوارە و عێلی خۆی لە ولاتی عوسمانی ماوە بەلام
ئارامی نەدەگرت و جار و بار لە سنورەوە هەلمەتی دێنا و حکومەتی ئێران لەوەی زۆر پەرۆش
بوو دەیهەویست ئەو گیرو گرفتە نەبێ و هەر جۆرێک بێ لە بەین چێ و ئەمیرنیزامی گەروسی
لەو بیرەدا بوو ئەو گرێیە بە دەستی ئەو بکرێتەوە و خەلات لە شا وەرگرێ و هەر بۆیە دەیزانی
حەمزەئاغا لەگەڵ میرزا قاسمی قاضی زۆر پێکەوە دۆستن میرزا قاسمی بانگ کردە لای خۆی و
کوتی ئەمن دەزانم لە بارەی حەمزاغادا زولم کراوە و پیاوێکی وا زۆر بەکاری حکومەت دێ و
ئێمە گەلێ پێویستمان بەو هەیە. جالەبەر ئەوەی هەڵی خەلەتێنی و فریوی‌دا نامەیێکی بەدەس
خەتی خۆی بۆ دەنوسێ و بەڵێنی و پەیمانی حکومەتی کوردستان و سابلاغ بە حەمزاغا
دەدا.میرزا قاسم نامە دەبا و جوابی دێنێتەوە کە حەمزاغا نوسیبوی ئەگەر وەزیر لە هۆزی قاجار
بوایە باوەرم پێت نەبوو بەلام چون وەک خۆم لە هۆزی عەشایرە ئەگەر دەنوسێ تا رۆح لە
بەدەنی من دایە لەم دنیایە و زیندوم لەگەڵ تۆم و ئاگاداریت لێ دەکەم دێمەوە، و ئەمیر نیزام لە
ئاخری جوابەکەیدا دەنوسێ و لەکاتی پێویست‌دا رۆحم بە قوربانت دەکەم و بە مۆری تایبەتی
خۆی کاغەز مۆر و ئیمزا دەکات و قورئان بۆ حەمزاغا دەبەن و «سوارە»ی برازای کە جوانێک
بوو نەبەز و وریا بە حەمزاغای کوت: ئاغا بە مەسلەحەت و خێر خوازی نازانم کە بچی ئەگەر
چی حاکم لە عەشایر بێ کەسێک کە ئەوەندە نامەردبێ بابی خۆی بکوژێ چۆن جێی باوەڕیە.
حەمزاغا پێی دەلی: وا بیر دەکەمەوە کە دەترسی سوارە دەلێ: ئەمن لێم روونە دەمانکوژن بەلام
لەگەڵت دێم قورئان ماچ دەکا لەگەڵ چەند سواری‌تر دەکەونە رێ زۆرتری سوارەکان لە پشت
کێوی عەلی‌ئاباد (پشت پادگانی ئەمڕۆ) رادەگرن و خۆیان لەگەڵ چەند سوار دەکەونە رێ بۆ
لای باغی شێخی لە باشوری ئەمرۆی مەهاباد دێنە باغی شێخ و چادری سەربازانی حکومەت لە
دورەوە دەبینن سوارە دەلی ئاغا وا باشە نیە ئێمە بچینە ئەوێ دەستور بدە حاکم لە چادری خۆی
بێتە دەرێ و بێتە لای ئێمە تا زۆر لە سوارەکانی خۆمان دورنەکەوتینەوە و لێرە لەگەڵ حاکم

باس وقسەی خۆمان بکەین حەمزاغا دەڵێ ئێمە چۆن دەبێ لەو سەربازە برسییانە بترسێین و راستە و خۆ دەچینە باغ.لە ئەسب دێنە خوارێ حاکم لە پێش‌دا هەموشتی ئامادە و ساز و تەیار کردبوو و دو سوپای نەبەز و بەجەرگی بە تفەنگ و فیشەک و چەکی پێویست و باش و قامک لە سەر پەلەپیتکە حازر کردبوو لە ئەو چادرانەی لای راستی چادری خۆی و لە رێکی ئەو چادری خۆی چادرێکی دیکەی ساز کردبوو کە قوڵکەی تێدا بوو و بەسەربازە کانی کوتبوو هەرکاتێک حەمزاغا هات و من لەگەڵ میهمانەکان چوینە ئەو چادرەوە و دوای بەینێ ئەمن کە هاتمە درێ و چومە ئەو چادرە کە قوڵ کراوە ئێوە چادری حەمزاغا گوللە باران کەن.

لە دوای ئەوە حەمزاغا لە ئەسب دابەزی لەگەڵ هاورێکانی کە سی نەفەربون، حاکم چوو بەرەو پیریان و هەمو چونە چادر و شیرینی و شەربەت خورا دوای بەینێ حاکم و دستە و بەستەی یەک یەک لە چادر هاتنە دەرێ و چونە ئەو چادرەی دیکەوە نێو چاڵ و قوڵکەوە و حەمزاغا و هاودەم و ئاواڵەکانی و سێ نەفەر چایچی و نۆکەر و بەر رەگباری گوللە دران دوایی کە هەموو کوژران یەک نەفەر چوە ژورێ سەری حەمزاغای لێکاتەوە خەلات وەرگرێ بەلام حەمزاغا مابوو و دەستێکی ساغ بوو بە خەنجەر پیاوی حاکمی لەت و پەت کرد جا خۆی رۆحی بۆ بەهەشت چوو دوای ئەو ئەمیرنیزام فەرمان دەدا لاشەی کوژراوەکان کۆ کەنەوە و سەری حەمزاغا لێکەنەوە و دەینێرێ بۆ تاران و شا خەلاتی تایبەت و پارچە شێعریک بۆ ئەمیرنیزام دەنێرێ و حاجی سەییاح لە خاتراتی خۆیدا نوسیویە هەر لەوێ لە خاک و قەبر نراون و لە سالی ١٨٨١ زاینی و شوالی ١٢٩٨ک.م و شەهریوەری ١٢٦٠ هەتاوی.

سەرچاوە: کتێبی تاریخ مەهاباد و منظومە کردی زانای هێژا سید محمد صمدی و کتێبی تاریخ و جغرافی دارالسلطنۀ تبریز لاپەرەی ٤٢٠

# شێخ سەعید

شێخ سەعید کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ محمود خەڵکی پیرانە و لە قارەمانانی مێژووی کوردستانە کە ژیانی خۆی لە ڕێی ئازادی کوردستان بەخت کرد شێخ لە ساڵی ١٨٦٨ زایینی هاتوەتە دنیاوە و هەوەڵی جەوانی خەریکی خوێندنی علومی ئیسلامی بووەو لە دواییدا وەک بابی تەریقەتی نەقشبەندی هەڵبژادوە بۆیە پێی دەڵێن شێخ سەعیدی نەقشبەندی. شێخ پیاوێکی زانا و ئاشنا و بەڵەد لە کاری دین و دنیادا و دڵسۆز و گیانباز بوو لە ڕێی ئازادی کوردستاندا زۆری جەوهەر لە خۆنیشان دا و بوو بەرگری لە زوڵم و زۆری «ئاتاتورک» لە مانگی نوامبری ساڵی ١٩٢٤ ز. لە گەڵ چەند سەد سوار بە نێو گەزان و دیتنی مرید و مەنسوبان لە دیاربەکرەوە دەرکەوت و نزیک چوارمانگ لە شار و دێهات گەڕا بە خەڵکی دەکوت بۆ دەبێ ئێمە کوردان لە ژێر چەکمەی زۆرداری تورک و تاتار بناڵێنین بۆ دەبێ زوڵم و زۆر لێ کراوبین و لە نێو شاخ و تەلان بژین و لە نێو ئەم بەردەلانیشەش وەدەرمان نێن بۆ بیرناکەینەوە کە نەوەی کاوە و ڕۆستەمین دەجا با یەک گرین و هەڵمەت بەرین لەم حاڵەدا ئێمە دەهەزار چەک دارمان هەیە دەبا بڕۆین بە گوڕ و بە تاوکڵی شەڕێ نێڵ دەین وڵاتی خۆ ئازادکەین و لە ڕۆژی سێزدەی فوریە ساڵی ١٩٢٥ ز. ئاوری شەر لە «پیران» کراوە و پێنج هەنگی چەک داری تورکیە لە گەڵ کوردەکان ڕووبەڕوو بوون و ڕۆژی بیست و دوهەمی هەر ئەومانگە سەربازی بریندارایان بردەوە دیاربەکر و قشوونی حکوومەت تەواو تێک شکا و زۆری لە بەین چوو ڕۆژی بیست و شەشی هەر ئەو مانگە شاری دیاربەکر و خارپوت پێوەند و هاتو و چۆیان لە گەڵ یەکترنەماو شاری خارپوت کە وتە دەس پێشمەرگە و لەوکاتەدا تەواوی ناوچە «ئارگانا» و «پالو» و «پیران» و «مأمورة العزیز» و باکوری دیاربەکر کەوتە دەس کوردەکان و بە هۆی هەڵمەتی دلێرانەی لەشکری شێخ حکومەتی تورکیە لە دەولەتانی ئوروپا بە تایبەت لە فەرانسەی یارمەتی ویست و لە لایێکی دیکەوە دە میلیۆن لیرەی بۆ لە بەین بردنی شۆرشی کورد دا بە مەجلیس و بەو جۆرە سێ هەزار سەربازی چەک داری دەولەت هاتنە شەڕی شێخ سەعید و لە پێش دا سوپای تورک لە شارودێهاتی کوردستان خەڵکیان وەبەر شمشیر و خەنجەر دا و هەر جێیەک دەچوون داریان بەسەربەردیەوە نەهێشت و کاولیان دەکردن و لە شەڕی نابەرابەردا شێخ سەعید ئەسیر کرا و لە ڕۆژی بیست و نۆهەمی ئاوریل شێخ لە گەڵ چل و شەش نەفەر لە دۆستانی لە دار دران و دار و نەداریشیان بە تاڵان برا بەڵام نێوی مەردیان بۆ هەمیشە لە سەر ڕووپەڕی مێژوو پڕشنگ دەداتەوە.

# قارەمانانی نەتەوەی کورد لە شەری دوهەمی جیهانی

کتێبی «با این رسوایی چه بخشایشی» نوسراوەی «جاناتان رندل» وەرگێراوی «ئیبراهیم یونسی» لە لاپەڕەی ٢٨دا نووسیویە کورد لەشەڕی پارتیزانیدا ناودار و بە ناو بانگ بوون و زۆرێ لە کوردان لە ئەرتەشی بێگانەدا قارەمانیان لە خۆیان نیشان داوە بۆ وینە سەرهەنگ سیامەند چونکە لە مسکۆ و شەڕی مینسک لە جەنگی جیهانی دوهەمدا لە بەرابەری هەڵمەتی لەشکری نازی دلێری لە خۆی نیشاندا و بە قارەمانی «اتحاد جماهیر شوروی» ناسرا.

یەکێکی دیکە لە قارەمانانی ناسراوی ئەرتەشی سوور «فەریق پوولاد بەگۆف» بووە.

| | |
|---|---|
| به ئازادی ژینی گەلی کورد زمان | له بارزانه چاوەی نیه جێی‌گومان |
| که هەر رۆژ له رۆژێکی پێشتر ئەوان | زیاتر دەکۆشن له بۆ مافمان |
| به خوێنێکی زۆر و شەڕێکی گران | له نێو بارزاناکه ئالان شەکان |

## بنەماڵەی قارەمانی کورد مەلا مستەفای بارزانی

لە مـــیرانـــی ئـــامێد مـــرۆڤیکی خـــاس
لە دەریـــایی عـــیلما هـــەبوو حـــەقشناس

پـــەڕی مێژو نێوی بـــە مـــەسعود ئـــەبات
کە نووری سەعادەت لە بۆی بوو خەڵات

لە داوێـــــن چـــــیایێ، لە زێـــباری مـــان
وەکوو غەوسی بەغدا لە ڕێی دین ژیان[1]

لە پـــاشان نـــەتیجە و نـــەدیدەی ئـــەوان
بە بەرزی، و بە شـانۆ، لە ئـەو خـاکـەمان

لە ئـەو خـانەدانـەی مـەلاییک سـفات
وەبـەر چـاودەکـەوتن فـرشتەی وڵات

## شـــێخ عـــبدالســلامی هـــەوڵ (١١٩٣-١٢٤٢)

هاوچەرخی مەولانا خالدی شارەزووری و
خەلیفەی سەید تەهای نەهری بووە

لە ئـــەو خـــانەوادە یـــەکـێ بـــەختەوەر
لە عـــیلما غـــەزالی لە عـــەدلا عـــومەر

بـــە عـــبدالســـلامی هـــەوڵ نـــاسرا
ئـــەبو مـــوسلمێتر لە کـــورد بـــینرا

لەوێ چـــارەنوسی خـــوداهـــاتە جـێ
بـــە دەســـتوری فـــاخلع بـــە ڕێـدا بـچێ

---

١ ـ مەبەست (شێخ مەسعود) مامۆستا هەژار نوسیویە: شێخانی بـارزان لە بـەرەماڵەی مـیرانـی ئـامێدی بـوون، یەکێکیان بە ناوی (مەسعود) لە میرایەتی وەرز بوە روی کردۆتە بناری چیای زێبار و دەستی لە دنیا بەرداوە و عبادتی کردوە.

لە بـــارزانـــەوە چـــوو لە نـــەهری دەمـــان
بـــە عـــبدالسـلام بـــوو خـــەلافەت دران

لە بـــۆ ســـەربەخۆیی لە بـــۆ مـــافی ژیـــن
لە گـــەڵ شـــێخی نـــەهری دەهـاتن بـە تـین

هـــــەتا مـــافی کـــوردان بسـێنن بـــە بـــیر
لە گەڵ مڵهوڕی کـەن قسـەی خـۆ، بـە شـیر

کوری سەید تەها[1] بوو لە وێ دەم دەهات
بـــە فـــەرمان ڕەوایـــی لە ڕێگـەی خـەبات

لە تــــورکیا، ئــــێران، وەهـــــا ڕاپــــەڕی
وەکوو شێری مەس بوو،لە عەرشەی شەڕی

نـــەبەردانـــی کـــورد بـــوون، پـــڵنگی چـیا
لە نـــێو کـــۆڕی دوژمـــن، دەهـــاتن، پـــیا

بـــــە خـــوێنێکی زۆر و، شـــەڕێکی گـــران
لە نــــێو بـــارزانـــا، درەفشـــن، شـــەکـــان

هـــــەمو پـــــاڵەوان و، هـــــەمووان دلێـــر
هەمو پیاوی جـەنگی، وەک «ئـاوێر» بـوێر

لە بـــۆ، ڕاوی دوژمـــن، دەڕۆیـــن ئـــەوان
لە بـــۆ ســـەربەخۆیی، بـــە مـــەردی ژیـــان

هـەتا، خـاکـی خـۆیان، هـەموو، نـیشتمان
لە نـــاحەز بسـێنن، نـــەدەن پـــێی ئـــەمان

---

١ - شێخ عبیداللە شەمزینی لە سالی ١٢٩٦دا بۆ ئازاد بوونی کورد بەرامبەری عوسمانی و ئێران دەستی کرد بە خەبات و زۆری لە کوردستانی هەردو دەوڵەتی ئازاد کرد بەڵام وەکوو تاریخ نوسیویە لە ئاخریدا ئەسیر کرا و بۆ حیجاز دورخراوە لە وێ وەفاتی کرد.کتێبی «مارتین وان بـروییسن» تـرجـمە «ابـراهـیم یـونسی» لاپەڕەی ۴٦٧ دا نوسیویە: محمد کـوڕی عـبدالسـلام لە شـێخ عـبیداڵەی نـەهری ئـیجازەی تـەریقەتی وەرگرتوە و پێوەندی دۆستانەیان بوە.

# شێخ موحەممەد (۱۹۰۳ـ؟)

بەڵی شێخ محەمەد کوڕی شێخ سەلام[1]
یەکەم مەردی مەیدان بە هێز و بە فام[2]
لە هاوچەرخی خۆیدا بە مەردی ژیان
بە خاوەن شکۆیی، مرۆڤی قارەمان
بەلاّم ماوەیێکی، کە دەس‌گیر کرا
لە بەدلیس کە ماوە، لە حەبسێ خرا
لە مەیدانی شەڕدا، بە مەردی دیان
هەتا هێزی، تیّابوو، لە دوژمنی ئەدان
وەدووریان دەخستۆ، لە نێو بارزان
لە بۆ ماوەیێکی لە موسڵ ژیان
لە کاتێکی رۆحی بەرەو عەرشە چوو
کوڕی خۆشەویستی لە جێی ئەو دەبوو
بەرێبەر هەتاکوو بداکورد نەجات
لەدەس زۆری دوژمن لە رێگەی خەبات

---

۱ ـ شێخ محەممەد پێنج کوڕی بوون: شێخ عبدالسلامی دوهەم، شێخ ئەحمەد، شێخ محەممەد سدیق، شێخ بابۆ و مەلا مستەفا.

۲ ـ شێخ عەبدولسلامی دوهەم لە دژی عوسمانی لە سالاّنی (۱۹۰۷و۱۹۰۸) شۆڕشی کرد و شەڕی کردن بەلاّم لە ئاکامدا لەشکری زۆر و خۆفرۆشان بە گژیدا چوون، شکا و تەنیا خۆی بۆ رزگار کرا. خزم و دۆستی زۆر دیل کران و مەلا مستەفای کەم تەمەن یەکێک بوو لەو یەخسیرانە و شێخ دوای ساڵێک هاتەوە مەیدان و تورکان شکان و ناچار بوون گیراوەکان بەردەن و ئاشتی کەن و وڵات ئارام بۆوە تا ساڵی (۱۹۱۳م) مەحموود شەوکەت وەزیری تورکیا کوژرا و سەفوەت کە لە موسڵ کار بەدەست بوو دۆستی شێخ عەبدالسلام بوو تێوەردرا و زانی بیگرن دەیکوژن هەلاّت پەنای برد بۆ شێخ و ئەویش پەنای دا و شەڕهەڵگیرساوە لە شەڕی نابەرامبەردا شێخ لە کار کەوت چارەی نەما هات بۆ ئێران و «سەید تەهای دوهەم» لە شێخانی نەهری لە زێویەی مەرگەوەڕ نزیک ورمێ و «سمایل ئاغای سمکۆ»ی چاو پێکەوت و پەیمانی دۆستییان بەست. شێخ لە ڕێبازێک مێوانی سۆفی عەبدوڵلاّ ناوێک بوو، مێواندارى نامەرد بۆ پاداش شێخی‌دا دەس تورکان و برایە موسڵ و لەوێ لەگەڵ سێ هاوکاری هەر چوار حوکمی خنکاندنیان درا: شێخ عەبدولسەلام، محەمەد ئاغای هیشتی، عەبدی ئاغای مزوری، عەلی ئاغای مزوری. لە ۱ی کانونی یەکەمی ۱۹۱۴لە دار دران و شێخ ئەحمەدی برای بوو بە جێ‌نشینی. ـ هەژار ـ

# شێخ عبدالسلامی دوهەم

له سالی ١٩١٣ خەباتی دەس پێ کرد و
لەکانونی یەکەمی ١٩١٤م لە سێدارە درا

کوڕی بەرزی شێخی لە نێو پێنج برا
بە عبدالسلامی دوهەم ناسرا

له بۆ مافی قەومی بە ئازادی ژین
له بۆ سوڵح و سازش دەهاتن بە تین

نەبوو مەیلی دوژمن کە گوێ راگرێ
ئەوە بوو بە هۆی وەی کەوا شەڕ کرێ

لە ئەو ساڵە دابوو تفەنگچی دەهات
بە دەستووری شێخی لە ناحەز بدات

لە عوسمانی وەربوو، وەبەر شیری دان
بەڵام لەشکری زۆر لە ناوچەی کران

لەوەێدا بوو، دەورو، بەری شێخ درا
بەلام، دەرفەتێ بوو، لەبۆی رێخرا

بە تەنیا بوو، رۆیی، لە ناوچەی، وڵات
کە بەڵکوو بمێنێ، لە بۆ رێی، خەبات

لەگەورە و چکۆلە، گەلێ عێلی وان
بە دیلیی بران و، لە حەبسێ خران

مەلا مستەفا بوو منالێکی روون
لەگەڵ دایکی یەخسیر، کرابوون و چوون

لە موسڵ بوو زۆرێ لە زیندان کران
بەڵام دەستی حەق بوو کە یاری دەدان

ئەوا شێخێ هاتۆ، لە بۆ تورک و تات
هەتا وانە شڕکا بە شیری خەبات

لە ئازایی، مەردی، مرۆڤی بێنەزیر
سەر و ماڵی دانا لە رێی کوردی ژیر

بەڵێ گۆی نەبەردیی وەپێش خۆی دەدا
بە هێرش دەرۆیسی نەبوو بۆی هەدا

لە هەرلا بە گورجی لە دژمن گەران
بە هۆی وەی بوو راوێژ بە سازش کران

بە بڕیاری دەوڵەت خەبەر زوو دەهات
لە ئاوێری بیستم ئەسیر بوون نەجات

لە جەنگەو لە جەرگەی شەرا شێخ بوو هات
لەبۆ خاکی ئێران کە فکرێ بکات

لە سمکۆی دەزانی لە وێرا خەبەر
بە راوێژ لەگەڵ یەک لە بۆ چارەسەر

دەیانکوت دەبێ بێ تەواوی وڵات
بە بیر و بەشیرن، بە مەنتق، نەجات

کە منداڵی کوردن لە نێو دووکەلان
کە خەڵتانی خوێنن لە، ئاوو، زەلان

بەڵام وایە تەقدیر، لە تەدبیرە جوێن
لە ئاوێری روونە، لە بۆ، لێی دوێن؟

لە ماڵ سۆفی عەولاَ لە شێخی بەرێز
بە حەق ناحەقی کرد ئە ئەو پیاوی دێز

بە، راپۆرتی، سۆفی، کە شێخ دیل کرا
لە موسڵ بوو، زیندان، لە داریش درا

لە بەر وەی بوو مافی خوراوی دەویست
خەبەر مەرگی سێ یار، لەگەڵ خۆی دەبیست

موحەممەد بوو ئاغای بەهێشتی بە ناو
لەگەڵ عەبدی ئاغای مزووری بە تاو

چوارەم عەلی بوو لە ئاغای مزوور
هەبو روحی وانە وەکوو کێوی توور

هەر ئەو ساڵە جەنگی جهانی هەوەڵ
گڕی گرت دەسوتا بە وێ کێو و کەل

# بەرگی دووهەمی شۆرشی بارزان

شێخ ئەحمەدی بارزانی لەکانونی یەکەمی ١٩١٤
بوە جێنشینی شێخ عبدالسلامی برای

لە جێی شێخ سەلام بوو، برای قارەمان
برای نێو برابوو (خولاّی بارزان)

لە شێخ ئەحمەدۆ بوو مرۆڤی باکەماڵ
کە چەن پیاوی جەنگی دەڕوێن بە باڵ

هەموو شێر و بەبری چیای بارزان
بە فەرمانی شێخ بوو دەرۆین ئەوان

وتی ئەی حوسێن کوڕ بە پێنسەد سوار
بڕۆ تۆ بەکۆمەک لە بۆ کارزار

هەتاکوو لە شاخ و چیای هەر سەعات
لە بۆ شۆڕشی کورد بکەن زوو خەبات

لە ئێحسان نووری هەڵۆی ئارارات
بکەن پشتیوانی لە هەر ئان و سات

بە شێخ ئەحمەدی بوو گەلی کورد برا
بە هۆی ئەو بوو شۆڕش ئیدامەی درا

هەوەڵ جەنگ جیهانی لە ئەو سەردەمە
بڵێسەی دەهاتن لە سەر خاکی مە

کە عوسمانی شەق بوو شەقەی تێ‌خرا
عیراقیش بەشێ بوو بە ئینگلیز درا

هەمو خاکی کوردبوو کە دابەش کرا
لەوێ چەندە دەوڵەت بەشی پێ‌برا

لە وێدا بوو ئینگلیس کە کەرکوک و نەوت
لە نێو خاکی کوردا وەبەر دەستی کەوت

لەبەر وەی بوو «ئاوێر»، کە کورد لێ‌گەرێن
نەبن بەرهەڵستی، بە وێدا نەیێن

بە هۆی وەی بوو خاکی، لە کوردان کرا
بە پێشکەش بە قەومی، عەرەب بوو درا
لە بەر وەی بوو نەیهێشت کە شێخی نەمر[1]
لە باشووری، شۆڕش، وەسەر خا بەگڕ
لەبەر وەی بە تۆپ و بە راکێت دەهات
لە باکووری‌دا تا، بسوتێ ولات
هەتا بارزانیش نەمێنێ لەوێ
هەموو ئەو ولاتە وەبەر خۆی کەوێ

# هۆی شەڕ سەپاندنی ئینگلیز بە شێخ ئەحمەد

لە تەشرینی دوهەم ١٩٣١دا[2]
بریتانیا و عەرەب بوو گەڕان
هەتا بەڵگەیی شەڕ وەدەس خەن ئەوان
دەیان کوت لە زۆر جێ مرۆڤی زۆر ولات
لە شێخ ئەحمەدۆ بوو لەوان زاڵە هات
لە ناوچە گەلێ گوند بە دەم با درا
بە فەرمانی ئەو بوو بە تالان برا
گەلێ خەڵکی کوشتن لە ناوچە و لە پەر
لە کاتی دەڕۆین لە مەیدانی شەڕ
لە بزنانە دان و لە باج و لە ماڵ
نیە یارمەتی‌دا حکومەت لە ساڵ
نە پۆلیسی دێلێ نە بنکەی ئەوان
لە شار و لە دێهات نیە جێگەیان
دەبێ ئێمە تۆڵە بسێنین بە شێر
نەیێلین کە شێخ بێ لە وێدا ئەمیر

---

١ ـ مەبەست شێخ مەحموودی نەمرە.

٢ ـ مشاهیر کرد جلد سوم ـ شەرەفنامەی کوردی ـ جنبش ملی کرد«کریس کوچیرا» ترجمە یونسی، مێژووی راپەرینی کورد عەلائەدین سەجادی لاپەڕەی ١٠٩.

دیـان دەوڵـەتی تـورک، لە ئـاسۆر زمـان
لە نـێو خـاکـی خـۆیا وەدەریـا نـەنان

لە سـاڵ نۆسەدابـوو لەگـەڵ سـی و یـەک
کـە پـەنجا هـەزارێ لە وان بـوونە یـەک

لە پـەر تـورکیادا لە نـێو خـاکـی مـاد
دروس کەن حکوومەت بچێ کورد بە باد

دەیـانکوت ئـەوانـە هـەژارن تـەواو
لە سەنجار دەبێ بن، خـودان خـاک و ئـاو

لە بـارزان و ئـەربیل، دەبـێ جـێ گـرن
لە ئـەو ئـاو و خـاکـە، دەبێ بـەش بـەرن

کـە بـەغدا ئـەوەی وت بـە خـەڵکی وڵات
لە بارزان بـوو دەنگـێ، کـە شـێرانـە هـات

مـەحاڵە کـە خـاکـن بـە بێگانە دەیـن
هەموو خوێنی دوژمـن، لە دەریـا دەکـەین

بـە ئـەو هـۆیە ئـاسور، لەگـەڵ بارزان
نەبوو فکری شەڕکا، لە هـیچ کـات و ئـان

نەبوو خـەونی ئینگلیس، بـە دی بێ لەوێ
لە بـــــۆیێ لە لۆلان، دیـــــانۆهەوێ

هەتا شێخ رەشـید بـێ بـە نـەخشەی ئـەوان
لە بـۆ شـەڕ لە هـەر لا لەگـەڵ بـارزان

لە وێدا بـوو ئـینگلیس، هـەلی کـەوتە دەس
بـە شـمشیری لۆلان، رژا خـوێنی خـەس

لە بـارزانـەوە چـوون، مـرۆڤی کـارزان
گـەلێ پـیاوی زانـا، لە بـۆ سـاچیان

بـەڵام شـێخی لۆلان، قـەبوڵی نـەکـرد
لە بۆ شـەڕ لەگـەڵ وان، کـە لەشکـریە بـرد

لە بارزان بـوو شـێخ دی، ئـەوا شـەڕفرۆش
لە لۆلانـەوە دێـن بـە گـوڕە و خـرۆش

هـەتا بـارزانـی لە نـەخشەی جـیهان
بشـــۆنۆ نـــەمێنێ مـــرۆڤێک لەوان

وتـــی مســـتەفا تـۆی بـرای قـارەمان
بـڕۆن فـاعتدوا زوو بـە مـیسلی ئـەوان

مـەلا مسـتەفا بـوو کـە گۆی بـردە دەر
لە قـوللەی شـجاعت، تـەواو کـەوتە سـەر

لە بـارزان بـوو هـاتن، هـەڵۆگش بـە سـان
بـــەهێز و بـــە هـێرش، لە لۆلانــی، دان

گـــەلێ زامـــدار و، گـەلی دێـل کـران
گـەلێ ئـەسلەحەی باش بـە بـارزان دران

دە «ئـــاوێر» دەزانـی لە دەشت و لە بـان
تەنێ، شێخ رەشید بوو، لە جێی خۆ دەمـان

لە لایـیکی دیکـە حکـومەت بـوو هـات
بـە پـیلە و بـە حـیلە لە نـاوچەی وڵات

دروس کـات چـەن دژ کـە پـۆلیس بـەرێ
لە «بـــیلە» ســەری کـورد بــەوان دادڕێ

لەوێ شێخ بوو نەیهیشت کـە پـۆلیس لەوێ
دروس کـــات لانـــەی بـمێنی شـەوێ

ئـــەمانە هــەلێ بــوون لە دەس دەوڵــەتا
هــەتاکــوو بـە شـەڕبێن لەگـەڵ مـیللەتا

## ئاوری شەڕ

لە ٢٦ مایس لە سالی ١٩٣٢م

لە ســـاڵی هــەزار نـۆسەد و ســی و دوو
فـــرۆکـە لە ئینگلیس دەهـات تـاکـو زوو

لەگەڵ هێزی دەوڵەت بڕێ کـوردی جـاش
بە هەر سێ، کە بارزان، بکەن ورد و خـاش

بـە گـوڕ گـڕ دەبـاری لەسـەر مـاڵی وان
دەســوتا گـژ و گـیا هـەموو دەغـڵ و دان

بـــریتانیا و عـــەرەب دەس بـــە هـەم
شـەپۆل بـوو دەهــاتن لە دەریـا و چـەم

هەموو ئەسلەحەی رۆژ گـەلێکی بـە دەست
لە تۆپ و موسەلسەل ئەوەی بێ مـەبەست

هــەتا ســاڵی سـی و چـوار گـەلی قـارەمان
وەکـوو کێوی پۆلاَ لە جێی خـۆ دەمـان

لە بـــرسان دەمـــردن، بـە بـۆم لێدران
لە پـــەڕ، تـــیٚپەڕین و، لە تـــورکیەمان

چوارسەد نەفەر بوون لەگەڵ شێخ بۆچوون
لەوێدا دەمــانۆ عــەجەب مــان و بــوون!

لەوێش هێزی تورکان، وەخۆکەوت لە وان
گـــەلێکی دەکــوشتن، هــەموو پــاڵەوان

گـــەلێکی دەنــاردن، لەبــۆ شــاری دوور
هـــەتاکـــوو نـــەمێنن، لە دەوری ســنوور

کــە فــەرمانی بــوردن، عــراق دایـە وان
گـــەرانـــۆ لەوێـــوە، لەبـــۆ نـیشتمان

لەوێـــدا بـــوو نــاچار، گـەرانـۆ ولاَت
لە ئــەرز و هــەوادا، نــەما رێـی نـەجات

کە هـەشتاد و شـەش کـەس بـە دیـلی بـران
لە ڕۆڵــەی نــەبەز بــوون گــەلی بـارزان

لە مــوصل و لە حــللە لەکـەرکوک ژیـان
نــەخۆشی لەوانــە وەپــێش خـۆی دەدان

ســـــلێمانی دوواجــــی لە وێدا دەمـــان
هــەتاکـوو هـەلێ بـۆ، ڕەهـا بـوون ئـەوان

# ئازادکردنی بارزانی لە زیندان

لە وەخــتێ ســەرۆک بــوو لە دووری ولاَت
وەکـــوو خـــیزی چـــۆمی ســپا دەهــات

بـــە ســـەر بـارزانــا گـەڕان کـێو و کـەن
هەتا خـر کـەنۆ چـەک، لەوێ هـەرچـی هـەن

لە دوی چـــەند ســـاڵی کـــە ئـاوارەمـان
گــەلی شــار و گــوند بــوو کــە کـاول کـران

هــــەتاکـــوو دە ســــاڵی لە دووری ولاَت
هەموو دەس‌بەسەر بوون مرۆڤی ڕێـی خـەبات

سـلێمانی شـاری مـرۆڤی قـارەمان
وەکـوو گـێو و روسـتەم دەهـاتن ئـەوان

هـەتا بـارزانـی سـەرۆکـی نـەبەز
لەوێ دەرکـەوێ زوو بـە هـەڵمەت بـە لەز

لەحەفدەی‌حوزەیران چل‌ودو(١٩٤٢م)لە ساڵ
هیوا و شێخ لەتیف بوون بە رۆح و بە ماڵ

مـەلا مسـتەفایان وەهـا دا نـەجات
نـەبوو کـاوە وەک وان لە رێگـەی خـەبات

لەگـەڵ بـارزانـی دوو بـازی شکـار
لەگـەڵیا دەهـاتن سـیاوەش تـەبار

دە، مـامەند شـیروان و شـێخ مسـتەفا
دو شـێری رەهـا بـوون لەبـۆی بـاوەفا

بـەرەو خـاکـی ئـێران مـرۆڤی قـارەمان
بـە مـێهمانی هـاتن لە تـورجـانێ مـان

لە حـاج، بـابەشێخ بـوو بـە مـێوان لەوێ
گـەلی رێـزی گـیرا، لەوێ چـەن شـەوێ

لەوێ سـێ تـفەنگی لە بـۆی سـاز ئـەکرد
بـە خـۆشی ئـەوانەی لەگـەڵ خـۆی دەبـرد

مـەهاباد بـوو هـیوا و مـەبەستی ئـەوان
بـە قـەدر و لەگـەڵیا دەنـارد چـەن جـەوان

لەوێڕا بـوو رۆیـی مـرۆڤی نـیشتمان
هـەڵۆی نـێو چـیا بـوو چـوو بـارزان

لەوێـرا بـوو ژنـراڵ کـە نـامەی دەچـوو
لەبـۆ چـەندە دەوڵـەت وتـاری هـەبوو

لەبـۆ ئـەمریکاو، لەبـۆ روس و چـین
بـریتانیا و فـەرانسـەی بـە تـین

دراکـاغەزی کـورد بـە هـەر یـەک لەوان
حـوقوقی بـەشەر کـوا لەبـۆ کـوردەکـان

نـــماینده‌یی کـــورد لەبـــۆ هـــەر وڵات
دەڕۆیــی خــەبەرداکــەکــورد دەن نـەجات

هـــەتا مـــیللەتی کـــورد بـبێ سـەربەخۆ
بـــبێ مـــافی ژیــنی لە نـێو خــاکــی خـۆ

## لە دایک بوونی قارەمانی کوردستان

مەلا مستەفای بارزانی (١٩٧٩-١٩٠٣)

لە ســـاڵی هــەزار و نـۆسەد وە ســێ
دیــاکـۆیی دیی بـوو، دیـان رۆژە دێ

مــەلا مســتەفا بـوو ئـەئەو رۆژە هـات
لە دایک بوونی ئەو بۆ گوڵی کرد وڵات

لە ئەو فکرەدا بوو کـە کـوردی جیهان
بــە دنـیا بـناسێ بــە بــەڵگە و بــەیان

لە ئەو فکـرەدا بـوو کـە سـود وەرگـرێ
لە ئـــازموون و زانـین بـەکـاری بـەرێ

بــە تـیزبین و پـێشبین لەبۆ کـار ئـەچو
لە گــەش‌بینی ئــەودا عــەقڵ مــاتەبوو

گەلێ ئارەزووی بوو کەکورد سەرکەوێ
لە لوتکەی تەمەددون سەری دەرکـەوێ

لە بەشداری خەڵکا لەبۆ کـاری چـاک
گەلێ شاد ئەبوو ئەو بە فەرهەنگی پاک

بە پێشمەرگەکانی دەکوت رۆحـی مـن
لەبـــۆ نـیشتمانی تـفەنگ هــەڵگرن

چــرای عـیلم و زانـین بـە دەستێ گـرن
دەســی دیکـە زووبـن لەبۆ شـیر بـەرن

بــەڵام قــارەمانە، کــەسێ فکـرەکـات
بــدا رۆحـی ئـینسان لە مـردن نـەجات

نـــەبوو نـــاتەنی بـــێ، لە پـــەیمانیدا
لەگـــەڵ دوژمـــنی خـــۆی لە ئیمانیدا

لەگـــەڵ دوژمـــنێکی گـــەلی حـــیلەباز
کە پـەیمانشکێن بێ، لەبـۆ گـیر و گـاز

لەگەڵ دوژمنێکی، کـە یـەخسیر ئـەبوو
وەکـــوو بـاب لەگـەڵیا بـەرێدا دەچـوو

دڵ ئـــاوا بـــوو حـــاتەم، گـــەلێ بـینرا
گـەلی مـاڵ و پـارەی، بـە خـەڵکی درا

لەگەڵ هەر مرۆڤێ، لە نێو عـێلی خـۆی
دەهات و دەچوو ئەو، برا بـوو لەبـۆی

لە هەرکوێ کە شـۆڕش لە شـەڕ وەردرا
لەگـــەڵ بـــێزیانا دەبـــوو وەک بـــرا

لە شـــەڕدا بـلیمەت، لە پـیلان و هـەو
موسەددق بوو دەرچوو، لە مەیدانێ ئەو

لە زیـــخی و بـــوێری، دلێـــری زەمـــان
نـــیە رۆح لەبـــەر بـــێ، نـەزیری ئـەوان

نە روستەم نە سوهراب نە ئـەسکەندەرێ
نە تارق کـە کـەشتی، شکـان لەو بـەرێ

لە «تـــەفرەشیان»ۆ دروســـتە بـــەیان
کـــە نـــوسیویە دیـــمان، گـــەلی بـارزان

وەکـــوو ئـــوممەتێکن، لە بـــۆ ژنـــراڵ
دڵ و رۆحی وانـە، لە بـۆی بـوونە مـاڵ

لە قەومی عـەرەبدا مـوحەممەد خـیار
مـــەلا مستەفا بـوو لە نـێو کـورد دیـار

لە عـــیسایی مـــریەم لە دڵ ســـۆزیا
گەلێ دەرسی وەرگرت لە مەکتەب چیا

لە ئـیش و وتـارا، لە زۆر بیری چـاک
لە چاکانی وەرگرت بە روحێکی پـاک

گـەلێ حـەیفە هـەرکەس بلێ نادرە
گـەلێکیش لە نـادر بـە جـورئەت‌ترە
مـەلێ کاوەیێکە لە حـەوشەی جـیهان
دەبـینی رەشـیتر گـەلێکە لەوان
نیە هیچ سەرۆکـی وەکـوو ئـەو نـەبەز
هـەلۆی زاگـرۆسە دەسـوڕێ بـە لەز
گـەلێ کـردەوەی ئـەو بـەیانی دەکات
کە دڵسۆزی گەل بوو لە هەرجێی وڵات
لە بۆ مافی «ئاوێر» لە بۆ عـەدڵ و هـات
بـە شـمشیری پـۆڵا لە دوژمـنیە دات

## گرتنی پاسگای ژاندارمری «شاندە»

لە ئابی ١٩٤٢دا

بـە سـێ بـرنو ژنـرال لە «شـاندە»ی ئـەدا
تـەواو پـاسگاکـەی دەکـرد بێ سـەدا
لەوێـدا بـوو ژانـدارم، کـە زوو لێک درا
هەچی ئەسلەحەی بوو، هـەموی خڕ بـرا
تـفەنگێکی زۆری، لە وێ کـەوتە گـیر
دەنـیشتۆ لە شـانی هـەلۆ بـۆ نـەچیر
لەوێ دەم سەرۆک بوو، کە کاغەزیە چوو
سەرۆکی عەرەب دی کە نـووسراوە زوو
بـزانـە ئـەمن هـەم، لە نـێو بـارزان
نە یـاغیم مـرۆف کـوژ، نـە رێگـر لە وان
ئەمن مافی کـوردم، دەوێ و ژیـنی بـاش
لە نێو خاکی خۆمدا، دەکەم مـن تـەلاش

# گرتنی پاسگای «خیزەرۆک»

لە ئەیلولی ١٩٤٢ دا

لە بـەغدا خـەبەر بـوو، کـە شێری زەمـان
لە دیـلی بـوو، دەرچـوو، چـوو، بـارزان

بـە ئـەو هـۆیە پێنسەد، نـەفەر دەنگ دران
هـەموو پـاڵەوان و، نـەبەز قـارەمان

هـەتاکـوو لە جـەنگەڵ، بڕۆن شاخ و داخ
لە بـارزان و مـەرزۆ، لە پـاڵ و بـاخ

بـڕۆن تـا لە چـەرخـی، زەمـین ئـاسمان
ئـەسیر کـەن بە نـەیرو، دیاکـۆی زەمـان

لە دوای چـەند رۆژێ، خـەبەر بۆ ئـەوان
بـەرەو خـیزەرۆکـۆ، دەڕۆن گشـتیان

سـەرۆک، مستەفا بـوو، لە رۆژی خـەبەر
لە گەڵیا بوو ئەو دەم، فەقەت بیست نـەفەر

لە وان گـێو و گـۆدەرز، دەبـینراو، بـوون
ئەمان چەن سەعاتێ لە پێش دابـوو چـوون

لە وان دە نـەفەر بـوو لە دوور، ئـاگـەدار
لە گەڵ ئەم دەیەی دا، سەرۆک چوونە خوار

لە شـەودا، بـە فـەوری، چـووە پـاسگا
لە لایـێکی گـورەو، لە لایـێ نگـا

هـەموو پـەنجەرەو، دەر، لە نـێو پـازگا
هـەموو تـێک‌شکان، و نـەما دەزگـا

لەوێ سی نەفەر بـوون، هـەمووی بێ‌سەدا
تەواو یەک بە یەک خۆی، بە دەستۆ دەدا

هـەموو دەست و پـێیان لە وێ بـەستران
لە ژووریٚ لە جـێی هـەموو کـڕ کـران

لە شاخۆ بـوو دەنگ هـات کـە ئـامادە بـن
قشـوونی عـەرب دێ، دیـارن کـە چـن

بە پێی خۆی بوو ڕێوی، لە دوورۆ دەهات
لە ناوەند، نزیک بوون، نەما ڕێی نەجات

لە دوو لاوە فیشک، دەهاتن بە تین
لە سەر سنگی وانە، دەیان کرد کەمین

وەکوو پاڵەی چاک، بەرێ دەغل و دان
بە گوللە و بە خەنجەر، عەرەب لێک دران

لە هەر لاوە نەعرە و، گوڕەی پاڵەوان
زەوی ئاوری گرت، لە هەڵمەت ئەوان

لە هەر لاوە گوللە، دەهات و دەچوو
بە چەخماخەی وان، هەوا، سوور ئەبوو

عەجایب دەمانۆ، لە گەرد و غوبار
لە نێو ئاورا.بوون، لە دنیای تار

چ بۆ ئێمە، وازوو، هەموو چەک کراین؟!
کە پاسگا بە خەنجەر، لە پشتی دەداین

لە بەرچی بوو بنکەن، لە بۆمان کرا
بە ئاورپژێن گش، لە کەللەن درا؟

گەلێ لاشە کەوتن، ئەوی دی هەڵات
لە ئەشکەوتی شاخان، دەبوون شرت و مات

لەوێ ئەسلەحەی زۆر، لە تازە و گرنگ
سەرۆک دەستی خستن، کە لێ دان برنگ

کەلاکی ئەوانن، لە ئاو و، قوڕان
بە دەندوکی خەرتەل، لەوێدا خوران

نەبوو تا ببینی، لە مێژوی زەمین
کە وابیست نەفەر بن بڕۆن بۆ کەمین

کەمین کەن لە چەکدار، لە پێنسەد نەفەر
هەموو پیاوی جەنگی، هەمووی شێری نەر

هەموو چەک بەدەست و،موسەلسەل لە شان
هەموو کۆک و ئازا، نەیان بوو وچان

بریتانیا بوو، فڕۆکەی دەهات
بە بۆمبای دەسوتان، تەواوی وڵات

بە راکێتی شەق، بوو، هەموو کێو و شاخ
نەما رۆح لە بەر بێ، لە نێو کۆل و زاخ

نەما ئاژەڵێکی، لەوێدا بژی
بە شاڵاوی ئاور، دەبوونە رەژی

نەما باڵدار و، نەما مەل لەوێ
بە زامۆ دەڕۆین، هەتاکوو شەوێ

قشونیش دەهاتن، وەکوو بەرگی دار
بە نێو کێو و شاخا، لە دەشت و نسار

لە تورک و لە تات و، گەلێ خۆفرۆش
دەهاتن لە هەر لا، بە هوریا و خرۆش

هەتا ریشەیی کورد، لە نێو بارزان
نەمێنێ لە بن بێ، بە شمشیری وان

تەماشا جەسووری، هەڵۆی بارزان
لە گژ بەبر و خەرتەل، دەچوو بێ ئەمان

لە گەڵ وەی لە کورەی زەمین و زەمان
نەبوو یارمەتی دەن، گەلی بارزان

دە «ئاوێر» دەزانی لە بۆ رێی نەجات
نەبوو کومەکی کەن، لە هاوسێ وڵات

سەرۆک بارزانی، یەکەم قارەمان
لە کام مێژوایە، نەزیری ئەوان

## حیزبی هیوا

لە ساڵی ١٩٤١ی زایینی دامەزرا

لە نۆسەد چل و یەک، گەلێ پیاوی ژیر
لە بۆوەی کە حیزبێ، دروسکەن بە بیر

بە راوێژی زانا، (هیوا) دانرا
بە حیزبی هیوا بوو، هەموویان برا

لە کەرکوک بناغەی «هیوا» دارژا
بەڵام شاخ و بەرگی لە زۆر جێ هژا

لە نێو شار و دێهات، بەرەو پیری چوون
لە بەغدا پەلێکی، گوڵی، گەشیە بوون

لە نێو خاکی کوردان لە شاخ و قەدی
گەلێ بۆڵ و میوەت، بە پەل یۆ دەدی

لە بەغدا پەلی ئەو، بووە داری بەر
لە ژێر سێبەری بوون، گەلێ با هونەر

لە نێو کارمەند و، لە نێو ئەفسەران
گەلێ ڕەونەقی کرد، لە هەرکات و ئان

کە ئەو «خیزەروکی» دەکرد ورد و پرد
لە دنیا بوو ژەنراڵ کە وا نێوی کرد

ئەوە بوو بە هۆی وە کە حیزبی هیوا
لە گەڵ دار و دەستەی، بلێ دێم ئەوا

گەلێ ئێمە ئەفسەر، هەموو دەس بە چەک
ئەوا دێینە بارزان هەموو بینە یەک

لە بۆ خزمەتی تۆ، سەرۆک، بارزان
سەرۆکی بە جەرگ و نەبەز، قارەمان

تەواو ئەمر و نەهییت لە بۆمە ڕەوا
مەلا مستەفا تۆی بە حەق پێشەوا

بە ئەڵماسی فکر و قەڵەم، بەڵگە نون
ئەتۆ ڕۆحی کوردی بە مایسطرون

لە بۆیێ بزیوو، بلیمەت، کەلان
لە تێبین و زانا، دەچوون گشتیان

هەتا کوو ببینن، گەلی کارزان
یەکەم پیاوی مێژو، سەرۆک بارزان

هەتاکوو لە گەڵیا، بە دڵ تێ کەون
بە فەرمانی ئەو بن هەموو ڕێکەون

لە هەر لاوە خەڵکی بە هێرش دەهات
لە بۆ پشتیوانی، سەرۆکی وڵات

لە وێدا بوو نوری، سەعی، کەوتە بیر
لە حیزبی هیوا بن گەلێ پیاوی ژیر

بـە نـاوجی بـە بـاشی لە بەینی ئەوان
بـڕون بـۆ قسـە و بـاس، لە بۆ بـارزان

## سێ ئەفسەری هیوا

لەوان سـێ نـەفەر هـات، بە شـان و شکۆ
هەموویان بـە هـۆش و، هـەموو وەک هـەڵۆ
ئەوان سەید عەزیز بوون و، سەرهەنگ ئەمین
لەگـەڵ عـیززەت عـبدالعـزیزی ئـەمین
بـەگـەیلانیزادە، دەنـازیی وڵات
نـەبو غـەفڵەتی بـێ، لەکـار و خـەبات
لەگـەڵ بـارزانـی، لە بـارزان ئـەوان
لە بـۆ بـەخت و هـاتی گەلی،کـورد دوان
وەخـڕ بـوون بـە راوێـژ، هـەموو کـارزان
دەیـانویست لە بـەغدا، بـڕێ مـافەکـان
لە وێـدا بـوو داوخـواز بـڕێکی کـرا
لە دوای مـۆر و ئـیمزا بـە دەوڵـەت درا
هـەموو نـاوچەیی کـورد، بـەکەرکوکەوە
سـلێمانی ئـەربیل، دهـۆک پـێکەوە
بـە مـەڵبەندی کـوردان بـناسرێ هـەمان
وەزیـرێکی کـوردیش بـبێ بـۆ ئـەمان
لەکـۆڕی وەزیـران، لە بـۆ هـەر وەزیـر
مـوعاون لەکـوردان، یـەکێ بێ، بە بیر
لە ئـابووری، فـەرهەنگ، لەگـوند و لە شـار
بـە سـەربەستی خـۆیان، بکـەن کـار و بـار
ئـە ئـەم داوخـوازەکـە «ئـاوێر» کـرا
بـە دوو دەوڵـەت، ئینگلیس، عـیراقیش درا

# دەنگی شێرانەی ژنراڵ

لە سەر دوندی ئەستێرە، دەنگێ دەهات
دەبا یەک گرن کورد لە رێگەی خەبات
سەرۆک بارزانە کە وا دەنگی دێ
لە دنیا وتاری ئەوە دێتە گوێ
دەڵێ مافی کوردان لە چوار دەوڵەتا
دەبێ زوو بە دەس خەین، لە هەر دەرفەتا
بە سەر زاگرۆسا بوو، مەوجی دەهات
دە شۆڕشکە ئەی کورد، هەتا بن نەجات
وەکوو شێرە نەعرەی سەرۆک بارزان
لە بەر وەی وەپێش خا لە بۆ کورد ژیان
هەوێنی وتاری گەلی هانەدا.
هەتاکوو ژیانی، گرنگ دەس ئەدا
هەتا نیشتمانن لە چنگ دوژمنان
دەرێنن گەلی لاو، بە چالاکیان
بە دڵسۆزی ئەوبوو کە خەملێ وڵات
لە خەو راپەڕی کورد کە خۆی‌دا نەجات
لە ئەوکات و ساتە گەلێ بوونە یەک
مرۆڤ و، لاوی کوردان دەهاتن بە چەک
لەوێ پێکی هێنا لە لێزانی کورد
لە بۆ راو و تەگبیر بە بیرێکی ورد
لەوێدا بوو داواکرا سەربەخۆ
بژی میللەتی کورد لە نێو خاکی خۆ
بە ئەو هۆیە دەوڵەت نەهاتەکەوان
بە بڕنو و موسەلسەل بوو هاتن ئەمان
سەرۆک و سەران بوو، لەوێ لێبڕان
کە وا مافی کوردان، بسێنن لەوان

وەکوو شێری بێشە، بە هەڵمەت دەچوون
لە ئاسۆیی دوژمن لە شەڕ، وەر، دەبوون
بە تانک و بە تۆپ و بە خومپارە تیر
لەگژ یەک دەهاتن پڵینگ و نەچیر
بە دایم نەچیرن، لە بۆ قەومی ماد
ئەوەی بێتە مەیدان، لە بۆ کورد نژاد

## چوار ئەفسەری دیکە

بە ئەو هۆیە دەوڵەت،کە زانی هیوا
هومێدیکە بۆ کورد، نیە شک لەوا
حکوومەت بوو ویستی بە دۆس بارزان
بناسرێ کە ناردی چوار ئەفسەران
لە بۆکۆکی ناردن، لە بۆ بارزان
کە خۆشناو و میرحاج لەوان بوون ئەمان
هەتا ئاشتی کەن نەکەن باسی ماف
لەوەی خۆ وەدەوور خەن هەتاکێوی قاف
بەلاّم هەر دوو یەعقوب، لەیسی زەمان
لە بۆ مافی کوردان دەچەوسان ئەوان
دوو چابک سەواری وەک ئەفراسیاب
لە نێو رۆحی وانا هەبوو تین و تاب
دوو شێری نەبەز بوون لە شاخ و چیا
لە دوی بارزانی دەبوون دڵنیا
فواد عارفیش بوو یەکەم پاڵەوان
مەجیدی عەلی بوو هەڵۆی بەردەلاّن

# چەند مرۆڤی فیداکار بۆ سەرۆک بارزانی

ئە، ئەو ئەفسەرانەی لە بۆ حەقی کورد
لە مەیدانی شەڕدا، لە سەریان، ئەبورد
یەکەم، مەردی مەیدان، جەلالی ئەمین
لەگەڵ نووری شیروان، دەروێن بە تین
لە زانکۆی ئورووپا، هونەرمەند بوون
وەکوو رۆستمی زاڵ، لە بۆ شەڕ دەچون
هەتاکو لە دوژمن، بدەن بێ‌وچان
نەیێڵن شەڕی وان، لە حەوشەی زەمان
بە شمشێری لێیدا، بوو عەبدالکریم
لە بەعس و ستادی، لە دوژمن غەنیم
دەبینرا بە زاهیر، یەکایەک جەوان
بەلاّم بوون لە فکرا، ئەرستوی زەمان
هەمو رۆحی پۆلا لەگەڵ هەستیان
لە جەبهەی شەڕا بو، لە سەر دەستیان
سەلاح هاتە مەیدان، لە بۆ نیشتمان
سەلاحێکی دیکە، لە کوردی زەمان
لە بۆ میر حاجیش، لە نەخشە و بەیان
ئەرەستو دەبوو بێ، بە شاگرد ئەوان
بە زاهیر جەوان و، بە دڵ ئاگەدار
فەلەک کوانێ دیوتە، مرۆڤی وا بەکار؟
لەگەڵ وانە عەبدول، حەکیمی بە سام
پڵینگی چیابوو لە بەر دەستی رام
گەلێ ئەفسەری دی، وەکوو باز ئەچوون
هەتا دوژمنی ماد، بکەن تەفر و توون
لە زانکۆی هونەردا، هونەرپیشە بوون
لە دوی بارزانی، وەک «ئاوێر» دەچوون

# چەند مرۆڤ لە حیزبی هیوا چوون بۆ بارزان

بــە نێو کۆڕی ئازاد ئەوان نێو بران
هــەموو کــار و باری بە راوێژ کران

لە حــیزبی هــیواوە لە بــەغداوە چوو
محەممەدکە ئەفسەر لە ئەو کۆڕە بوو

مەجید ئەفسەرێ بوو گەلێ خۆش زمان
بە مـەنتق دەروێـی لە نەخشەی زەمـان

بــە لولەی تفەنگیایا ئەجەل دێتە دەر
بــە گــوێی دوژمـنیدا دەداتن خەبەر

کــە وا مــیللەتی کورد پڵینگی چیان
لە بــۆ راوی نــاحەز دەسوڕێن ئەوان

لە بۆ سینگی دوژمن، هەموو بەبر و شێر
هەموو هەن تەهەمتەن هەموو هەن دلێر

هەڵۆن و دەسوڕێن، لە سەر ئاو و قاد
هــەتا ماری ببڕن لە نێو خاکی ماد

بە داسی بە جەرگی، دەدرون ئەوان
دڕو داڵــی خــۆرتی لە نــێو نیشتمان

دەبــینی کــە دوژمــن لە ســەرڕا تلار
دەبـــیتۆ دەبـێتە بــەشی کــرم و مــار

دە «ئاوێر» بنوسە ئەوەی راستە خۆت
هــەتا رەحــمەتی حەق بنێرن لە بۆت

# شەڕی نەهلە

۱۲ی ئەیلولی ۱۹۴۵

زەعیم مستەفا خۆی، لە روی نـەخشەوە
لە داوێـــنی عــەقرە، چــوە پــێشەوە
لەگەڵ چل نەفەردا وەکوو شێری مەست
دەچوو شاخ و داخی لە دوژمن دەبەست
لە وێـدا بـوو نـاحەز دەمـاو دەم بـەیان
فــرۆکـە و تـەیارەی، لە روی ئـاسمان
دەهـاتن بـە شـاخا بـە سـەر بـەرد و دار
بە بۆمبا دەسوڕان وەکـوو گـورگی هـار
بە دویا قشون هات بە تۆپ و بە تـانگ
لە تەپکە، کەکەوتن بـوە تـۆز و قـانگ
لە وێــدا لە دەوڵــەت هــەمو رێ بـڕان
لە بــــوێ عــــەشایر لە هــاواری وان
دەهاتن لە سـورچـی بـە سـێ‌سەد نـەفەر
بە شێر و پڵینگ بوو دەیـان بـرد زەفـەر
رەئیسی عـەشایر وەکـوو شـێخ جـەلال
وەکـوو پیرە عـەولاّ مـەجید و کـەماڵ
لە زێباری «شەوکەت» لە رێگـەی خـەتا
بـــە بـڕنو دەهــاتن بـەگـژ مـیللەتا
لە زێباری «مەحموود» کە دی عێلی وان
عــەشایر گــەلێکی لە گــەڵ دەوڵــەتان
لە ئـەو وەخـتە دابـوو سـەری وەرگـەڕا
بە جێی هێشت سـەرۆکـی لە نـێو ئـاورا
لەوێ مەردی مێژو بە نـەخشە و بـە بـیر
بەرەو شاخی پیرس دەچـوو بـۆ نـەچیر
زیــانی حکــومەت لە کـوژراوی وان
لەگــەڵ ئــەسلەحەیدا گــەلێکە بــەیان

## شەری هەودیان و مەزنە

لە ٢ی ئەیلولی ١٩٤٥

لە نێو هەودیانا هەوەڵ، ژنراڵ
لەگەڵیا بوو پەنجا نەفەر بەبری زاڵ

لەوێ دەم لە وێ بوو پڵینگێکی سوور
محەممەد بوو ئاغا لە سەر مێرگە سوور

لە ئەو رۆژەدابوو، دوو هەنگ بوو دەهات
هەتا مەزنە بگرن لە جەرگەی وڵات

لە ناکاو لە نێو غار پڵینگ دەرپەڕی
محەممەد بوو لاشەی دەخست وەک مەڕی

لە تۆپ و موسەلسەل لە فیشەنگ بە لاش
بە تاڵان دەیان برد بە زۆر و تەلاش

## کۆمەگی ئینگلیس بە عێراق

لەگەڵ ئەئەوە ئینگلیس بەکۆمەک دەهات
لە بۆ شاری بەغدا لە هەر ئان و سات

فرۆکە و تەیارەی بە بۆمب لێی ئەدان
هەتا خاکی بارزان هەموو گڕ دران

بە بۆمبا دەسووتا هەموو کێو و شاخ
نەماگیان لەبەر بێ لە نێو راغ و باغ

هەموو دین بە چاوو بەگوێ بیستمان
لە نێو دوکەلابوون گەلێکیش نەمان

دەسووتا و دەبرژا منالی ئەوان
دەبووگش بەکولەی تەنوو ئاشەوان

بەلام تۆ تەماشاکە مێژوی جەنگ
لە بەر چی بۆ سەربازی تەیموری لەنگ

وەکوو شێر دەهاتن دەچوون بۆ نەچیر
لە سەر دوندی شاخ و لە نێو چاڵ و بیر

لە بەر وەی گەرم بوو هەموو پشتیان
بە هێزی قشون و، سپای گشتیان
هەموو، تێ گەین بوون بە عەقڵ و خەیاڵ
کە بێ کەس کوژی وان شتێکە مەحاڵ
هەموو تێ گەیی بوون کە کۆمەک دەبێ
لە سەد لاوە دوژمن وەبەر حەملە دێ
ئەوە فەرقی زۆرە لە گەڵ رابەرێ
نیە کەس کە لەشکر بە دویدا بەرێ
گەلێ جاری وابوو بە چەن دەوڵەتێ
دەیاندا لە بارزان بە چەن هەڵمەتێ
دەجا لێرەدا بی قەزاوەت کرێ
بە مقیاسی مەنتق بەری دابرێ
بە فکرێکی ورد و لە دەوری مەبەس
لە بۆ زێرشناسان، مەبەس دێتە دەس
دەجا لێرە روونە کە بەینی ئەوان
وەکوو بەینی عەرزە هەتا ئاسمان
دە «ئاوێر» بزانە سەرۆک بارزان
بە هێز و بە تین لە ئەستێرە دان
چ ئەستێرە ئەستیرەیی پیاوەتی
بە جەرگی، دلێری، شەرەف شیاوەتی
چ ئەستێرە ئەستێرەیی وا ژیا
لە دلسۆزی ئەو بوون هەموو دڵنیا
بە جەوهەر بوو هێژا گەلێ چاکەکار
گەلێ گەردی لابرد لە سەر لێو هەژار
سەرۆکێ بوو دڵسۆز لە بۆ عەدڵ و داد
بە ئازادی ژینی گەلی قەومی ماد
سەرۆک بارزانی بە هۆش و بە تین
گەلی کوردی ناسان بە کورەی زەمین
ئەوە رۆحی فەرهەنگ لە رێگەی خەبات
بە پرشەنگی فکری گەشۆ بوو ولات

زمـــانم بــڕن گـەرکوو تـەشبیهی کـەم
بـە نـادر بـە تیمور هـەتاکـوو کـە هـەم

نـەدەی نسبەتی تـۆ لە هـیچ کـات و سـات
رۆمـی بـە ئـاسەف لە ڕێگـەی خـەبات

دە «ئـــاوێر» تـەماشا سـەرۆک بـارزان
کە ئەسکەندەرێ بـوو لە عـەرسەی جـیهان

تـــەواو زاگـــرۆس و تـەواو ئـاراڕات
بـە بارزانـی شادن، کـە دەیکـات خـەبات

## شەرفرۆشی ئینگلیس بە بارزانی
لە سالی ١٩٤٥ دا

لە سـەربازی دەولـەت، چـل و دو هـەزار
لە گـەڵ خـۆفرۆشان، لە کـوردی هـەژار

کە «رانتین» بوو سەرپەل لە بـۆ گش ئـەوان
بـــە هـــێرش دەهـــاتن لە بـۆ بـارزان

لە بـارزان و دۆسـتی هـەتا پـێنج هـەزار
وەکـوو ئـەژدەها بـوون لە بـۆ کـارزار

لە ســـەر مـێرگەسوور و لە نـێو بـارزان
لە عـــەقرە و لە زاخـۆ ڕەوانـدز ئـەمان

ئـەوان لەشکـرێ بـوون لە گـەڵ خـۆفروش
هـەموو تـێکشکان و نـەیان مـابوو هـۆش

لەوێ نـــۆ فـــرۆکـــە لە ئـەرزی دران
لە نـــێو ئـاورابـوون دەسـوتان ئـەوان

گـەلێکیش لە بـێ‌سیم لە تـۆپ و تـفەنگ
لە فیشەک هـەزاران هـەموو هـاتە چـەنگ

بـــریتانیا بـــوو فـــرۆکـــەی دەهـات
بـە پـۆل بـوو دەسوڕان لە نـاوچەی وڵات

بـــە بـۆمبا و راکـێت لە ئـەرزی دەدان
لە نـێو خـاکـی خـۆمان بـرا لێک بـڕان

گــڕو دووکــەڵیش بــوو لە نێو مــاڵ و بــاغ
لە نـــێویا دەســـــووتا مـــــناڵانی ســـــاغ
بــەڵێ هــەشت هــەزاری لە ســەربازی واڕ
لە ئـــابلۆقە دابـــوون، و دەرفــەت نـــەمان
نــزیک بـــوو ئــەسیر بــن بــە دەس بــارزان
خــەیانەت لە کــوردۆ لەوێ خــۆی نــوان
ئـەوانـەی کـە دۆس بـوون لە گـەڵ بارزان
لە پشـــتۆ بــە خــەنجەر، لە قــوڵی دەدان
بە دەستوری ئینگلیس لە کـورد وەرگـەڕان
خـــەیانەت بـــوو شـــمشیر لە ژنـــراڵ دران
لە هــــەر لاوە هــێرش کــرا ســەر ئــەوان
لە دۆڵ و لە شـــاخ و، لە دەشت ئـــاسمان
کــە دیـتی لە شــار و لە دێــهات و بــاغ
لە دەشت و تـــەلانا، نـــەما جـێی ســاغ
پــەڵەی هــەور و ئــەستێرە گشتی بە تێن
بـــە تـێکڕا هــەموو بــوو بــە ئــاورپژێن
بـــە فــەوری بــزوتن لەوێ ڕەد دەبـــوون
دەنا گش دەسووتان وە ک «ئاوێر» ئەچوون

## شەڕی هەرن

لە ئەیلولی ١٩٤٥

عــــــەشایر لە زێـــــبار و بـــــادینیان
کە، پێنسەد نەفەر بوون، لە چەکداری وان
بە بێ سیم بوو دەدوان لە هەر کات و سات
لە گـەڵ ئـەو سپایەی، لە بـەغداوە هـات
هـــــەتاکـــوو لە پشـــتۆ، پــیرس دابــڕن
بــە تـۆپ و مـوسەلسەل، هـەموی دادڕن
ئــە ئــەو هـێزە گشتی، لە گـوندی بـەرن
لە بــۆیێ بـــوو بــارزان هــەموو داگــرن

لە بــۆ بــارزانــی خــەتەر بــینرا
لە بــوێ بــوو ژنــراڵ دەهـات بوی بـرا

زەعــیم مســتەفا بــوو بـە هـۆش و بزان
لە سەر دوندی پیرس دەهـات بـۆ ئـەوان

بە نـەخشە بـە حـەفتا، نـەفەر دەوری دان
بەڵام تۆپی (عززەت عـەزیز) نـەی گـەیان

لە ناکاو خەبەر هات، کـە مـەوجی سپان
دەڕۆن تاکو پیرس، وەدەس خەن ئـەوان

قوای دەوڵەتی بوو وەکوو خیز و خـۆڵ
دەهــاتن لە دەشت و، لە شــاخ و دۆڵ

لە تــاریخێ پــرسە کــە عـزەت عـەزیز
لە بەرچـی بـوو گـوللەی نـەهاتن بـە ریـز

## شەری کێوی پیرس

لە ٢٥یٚ ئەیلولدا لە سالی ١٩٤٥

لە ساڵی چلوپێنج (١٩٤٥)گڕی شەڕ دەهات
هــەتا بــارزانــی لە نـێو خـۆی بـخات

لە گــەڵ بـارزانــی هــەبوو شــەست نـەفەر
هـەموو مـەردی جـەنگی هـەمووی بـاهونەر

لە پـیرس وەســەر کــەوت ژنــراڵ شــەوێ
هــەتا کــێوی ســەنگەر، وەدەســتی کــەوێ

لە فــەرهادی چــاتر دەبـوو شـاخەوان
لەوێ ســەنگەری گــرت لە نـێو بـەردەلان

هــەموی کـردە سـەنگەر تـەواو شـاخ و دەر
بـــە فـەرهادی نسـبەت مـەدە وا هـونەرا!

بــە ســەر تـیشە شـاخا دەچـوو وەک هـەڵۆ
نــەچێری دەگـــرتن بـە چـنگاڵی خـۆ

لە هـــەر لاوە هـــێرش لە بــۆ کـێو کـرا
هـــەموو زەرد و بـــەردی لە ئـاور خـرا
بـــــڵێسەی دەســـووڕا لە دۆڵ و خــــڕا
هـــەتا شـــەو بـــە بـڕنو لە یـەکـتر درا
لە لای چەپ بوو (سورچی) بە سێسەد نەفەر
لە ڕاست (دوسەکی) بوو هەموو پیاوی شـەڕ
کە پێنسەد نـەفەر بـوون بـە شـالاو دەهـات
هـەتاکـوو بـرای خـۆی لە خـوێن وەربـدات
بـــە هـــێرش دەهـــاتن لە بـــاشوورەوە
وەکــوو مــەوجی تـاویش لە باکـوورەوە
سپای دەوڵـەتی بـوون بـە تـۆپ و بـە تـانگ
فــرۆکــە لە گــەڵیان هــەوا بـبوە قـانگ
لە نـــاکـاو فـرۆکـە، بـە بـۆمبا و تـیر
هـــەمووی دادەگـــرتن بـیان کـا ئـەسیر
ئـــەوا چـــل نـــەفەر هـات لە زێـباریان
دەچــــوون یـــارمەتی دەن گـەلی بـارزان
لە ســەر ڕا بـە بـۆمب و لە عـەرزۆ بـە شیر
گـــــەلی بـــارزانـــی لەوێ کـــەوتە گــیر
مـــــوهاجر لەوێ دەم، لە گـــــەڵ ژنـــراڵ
کـە سـی و پێنج هـەزاری تـەواو و کـەماڵ
بـە جـۆرێ دەهـاتن وەکـوو شـیری مـەست
بـڕێ تـۆپ و تـانکیان شکـاندن بـە دەست
لە تـــاریکی شـــەودا ســەرۆك لێـیدان
بـــە بـــڕنو و مـــوسەلسەل لە داگــیرکەران
هــەتاگــەینە چـۆمی وەکـوو مـەوجی ئـاو
دەهـــاتن لە «مـــەزنی» پـــەرینۆ تـەواو
هــەر ئـەو شـەو بـە فـەوری تـەواوی وڵات
لە گـەڵ شێخی گـەورە هـەموو خـڕ دەهـات

لەوێــدا بــوو دەس پــێکرا گــورج و گــۆڵ
بــــڕۆن پــیر و مــنداڵ لە دەشت و لە دۆڵ
بــڕۆن کــۆچەری کــورد بــەرەو کێلەشین
بــــەرەو خــــاکــی ئـێران لەوێــدا بــژین
لە بەر وەی کـە کۆچەر لە گـەڵ کـۆچ و بـار
نــــەکــــوژرێ لە رێــدا فــەقیر و هــەژار
لە گــــەڵ چــەن کــەسێکی نــەبەز پــاڵەوان
بــە دوی هــۆزی دابــوو سەرۆک بـارزان
لە «ئــــاوێر»ی بــیستم کــە گــەینە ســنوور
لە بــۆ وان بــوو ئـێران بـە شاخێ لە نـوور

## هاتنی مەلا مستەفای بارزانی بۆ ئێران

لە ساڵی ١٠/١٠/١٩٤٥

لە دەی بــوو لە دەیــدا لە رێــی کـێلەشین
گــــەلی بــارزانــی دەهــاتن بــە چــین
کە چەکدار و بـێ‌چەک مـرۆڤی بـارزان
کــە سـی‌وپێنج هــەزارێ دەهـاتن ئـەوان
لە بەر وەی بوو تـانک و سپای بـێ‌ئەمان
فــرۆکــە و مـوسەلسەل لە بـارزانـی دان
لە بــەر وەی بـوو هـاتن لە ئـێران زەمـین
هەتا هەڵکەوێ هەل، لە بـۆ مـاف و ژیـن
مــەهاباده بــەرچــاو، کـەوا هـۆزی وان
بڕۆن گش لە گـەڵ شـێخ بـە رۆح و گـیان
لەوێ ڕابــوو ژنـراڵ بـە فـەوری دەچـوو
کــە بــەرپرسی سـوڤیەت، ببینێ دەبـوو
ئەویش پێیدەکوت بـاش، ئـەتۆ زوو بـڕۆ
دەمــــێکی لە بــەر چــاو مــەمێنە ئــەتۆ

لە میراوێـی سـەردەشت، هـەلی بـردەسەر
لە شـاری شـنۆ مـا، لە پـاش ئـەو سـەفەر
لە نۆسەد چل و شش لە یەک بیست و دو
لە سابلاغ بوو جەژنی کە «ئـاوێر» ئـەچوو
لەکـــاتێ مـــەهاباد لە بـــۆ پــێشەوا
بــووە مــەرکەزی کــورد لە بــارەی دوا
لە ئــەو کــاتە دابــوو سەرۆک بـارزان
لە لای پـــێشەواوە زیــــافەت کـــران
ستێرەی هونەر بوو لە سـەر شـان و دۆش
لە ئـەو مـەحفیلەیدا دەبـینرا بـە هـۆش
لە دوایـی گـەڕانـۆ شـنۆ بـۆ خـەبات
هەتاکوو بـە رەسـمی دەمـی دیکـە هـات
لەکـوردی عـێراقـا مـرۆڤی ئـاگـەدار
لە مەزبەت وەخر بـوون بـە راوێـژ و کـار
رەشـــید و دلێـــر و نـــەبەز قـارەمان
لە سـەر خـێڵ و عـێل و لە لاو و لە خـان
لە زانـــــا و دانــــا لە هـــۆشیار وان
لە بـۆ رەهـبەرن هـات وتـارێکی جـوان
یەکێ شێخ لەتیف بوو لە ئەو کـوڕە بـوو
لە بـــۆ پــێشەوا بــوو پــەیامی دەچــوو
لە بـــۆ پــێشەوا بــوو خــیتابی ئـەوان
کە جێی ریزە بۆ کورد سـەرۆک بـارزان
هــیوامــان بـە تـۆیە،کـە قـەدری ئەوان
لە بەر چاوی تۆ بێ، لە هەرجـێ و زەمـان
ئــەویش بــوو بـە هـۆیێ لە ئـاخر زسـان
کـــەوا پــێشەوا دای پــەیامێ بــە وان
کـــە ژنـــرالــی هــێژا مــەلا مسـتەفا
دەبــێ بــێتە ســابلاغ، بــە روحـێ سـەفا
لە وەخـتێکی دا هــات، مـەلا و قـازیان
کـومەیتە هـەموو چـوون بـە پێشوازیـان

ئەویش زوو بە فەوری، لەوێ دابەزی
بە رێز و سپاس و، لەگەڵیان لەزی
لە دەم چەم مەهاباد بە رێز بینرا
مەراسم بە شادی وتار خوێندرا
لەوێ دەس لە نێو دەس، برای یەک نرا
لە سالۆنی فەرهەنگ، سەلام وێژرا
لەوێ پێشەوا هات بەرێز و سەفا
لە بۆ دیدەن و دید مەلا مستەفا
لە سالۆنی قازی سەرۆک خۆی دەچوو
بەرێز پێشەوای دی، کە خێرخوازی بوو
لە ئەو کاتە ژنراڵ چووە لای ئەوان
لە بۆ میللەتی کورد لەگەڵ یەک دوان
دە «ئاوێر» تەماشا تەواو شوێنی وان
دەمێنێ لە رووپەڕ کتێبی زەمان

## بیر و باوەڕی مەلا مستەفای بارزانی لە مەهاباد

لە کاتێکی ژنراڵ، مهاباد ئەچوو
بە ئەو هۆ مهاباد، لەگوڵ پڕ دەبوو
لە نێو کۆڕی خەڵکا بەرێز بارزان
لە سەحبانی چاتر دەکردن بەیان
وتی لەو دەمەیدا، بەکۆڕی نەبەز
برای خانەخوێمن کە میوانم ئەز
لەگەڵ عێل و هاوڕێم، لە هەر ئان و سات
شەریکم لەگەڵتان لە رێگەی خەبات
دەبێ سەربەخۆ بین، بە ئازادی ژین
لە بۆ جەوری دوژمن بە زۆر هەڵمژین؟
لە بەر وەی کە ئازاد، وەسەربەس ببین
تەواوی تەمەن بووم لە نێو شەڕ بەتین

لە بەر سەربڵێندی گەلی کورد زمان
لەگۆ ملهوریێ بووم لە هەرکات و ئان

سەرۆک بارزانی وتاریی بوو روون
لە بۆ ئەو کەسانەی «و هُم مُهتدون»

بە ئامۆژگاری بەکردە و بەیان
لە ئامانجی خۆی بوو بە خەڵکی گەیان

ئەگەر خزمەتی گەل گەلێ سەختە لات
خەیانەت نەکردن لە ئاسانە رات

ئەگەر کاری کاوە لە بۆت ناکرێ
مەبە هارپاک و لە کوردی گەڕێ

مەکە تۆ خەیانەت بە ئەولادی خۆت
هەتا لەعنەتی زۆر نەنێرن لە بۆت

نەتیجەی خەیانەت دەبێ نەسلی تۆ
بە دیلێکی دوژمن لە نێو خاکی خۆ

قەڵەم جەوهەری کوا لە بۆ بارزان؟
بنووسێ سفاتی بکاتن بەیان

## شەری قارەوای سەقز

سپای سەقز بوو بە ئاورپژێن
بە مانۆر دەهاتن پڵینگی کەمین

هەتا کورد بترسێ بە رۆح و گیان
لە جەبهەی هەڵێن و بڵێن ئەی ئەمان

لە نێو قارەوادا، وەکوو غول گوران
لە ناکاو بوو بارزان ئەجەل هەڵقولان

بەرەو قارەوا بوو لە چەکداری وان
لەگردێ بەرەو شار کەمین بوو خزان

ئەوان بارزانین بەرەو پێشی شار
بەرەو تانک و تۆپی دەروین تەیار

لە نێو گوللەباران بە حەملەی دەچوون
سپەهبود لەوێدا هورو، وڕ دەبوون
بە رەگباری بڕنو لە لەشکریە دان
هەتا بیست نەفەریان بە فەوری گوژان
گەلێ زەخمیان بوو چلیشیان ئەسیر
ئەوی دی گەڕانۆ نەکا کەونە گیر
بەرەو رووی مەهاباد، ئەسیران دەهات
لە سەوقاتی میوان، بە بۆنەی خەبات
کە دیتی سپەهبود، جەوانێ دەچێ
لە گەڵ گوللە تۆپا، دەبێ جێبەجێ
کە هەر کوێ هەدەف بوو، لە بۆ گوللە تۆپ
کەنارەی دەگرتن لە قوڵکە و لە دۆپ
گوتی گەر ئەمن بم خودان سەدهەزار
لە بارزانی سەرباز، لە بۆ کارزار
جە خاوەرمیانەم دەگرت گش بە وان
کە شەمس و قەمەر بن لە بۆم یەسجدان
دە بیبینە «ئاوێر»، کە کوردانی مەرد
چلۆن دێنە مەیدان، لە رۆژی نەبەرد
دە «ئاوێر» تەماشا کە رۆحم فیدات
چ هۆزێ لە دنیا وەها شەڕ دەکات

## هاتنی ئەرتەشی ئێران بۆ مەهاباد

لە ١٣٢٥/٩/٢٦ ـ ١٧ی کانوونی هەوەڵی ١٩٤٦

لە ئەو ساڵ لەشکر لە ئێران زەمین
لە بۆ کانێ وەربوو دەگیرا بە تین

لەوێ رابــــوو هــــاتن لە بــــیست و دوا
لە بــــرهانێ رەد بــــوون، لەکــــاتی زوا
مــــەهاباد لە بــــیست و شــەشی ئــازەرا
ســــپایێ بــوو گــرتی هــەموو لێک درا
ســــپاییێکی وابــــوو کــە هــێرش‌یەکــرد
هەچی تۆپ و تانگ بوو لە بۆ خۆی دەبرد
لە نۆسەد چل و شەش،کە چەک دانرا
مــــــهابادی بــــینرا لە نــــێو ئــــاورا

## چەک دانەنانی بارزانی

١٧ی کانوونی هەوەلی ١٩٤٦

بــــە یــــەک رۆژ لە پــێشاگــەلی بــارزان
لە دەوری ســــەقز بــوون گــەڕانــۆ ئــەوان
لە بــــۆکــــان و بــورهان دەبــوو رێ بــڕن
هــــەتا لە مــــەهاباد هــــەموو یــەکگــرن
بــــەلام بــــارزانــــی چــــەکــی دانــەنان
بــە جــێی هــێشت مــەهاباد هــەڵۆی ئــاسمان
بــە نــێو بــەفر و یــەخدا بــەرەو خــۆرپەڕ
بــەرەو شــاری نــەغدە و شــنۆ و شــاخ و بــەڕ
ژن و پــــــیاوی پــــیر و، مــــنالان و لاو
بــە ســەغڵەت دەرۆیــن بــە بێ تین و بــاو
لە ســەرباز و ئــەفسەر لە شــاپور و خــۆی
لە چــەن شــاری دیکــە دەهــاتن لە بــۆی
لە بــۆ شــەڕ لەگــەڵیان لە هــەرکــات و ئــان
لەگــەڵ ئــەرتەشا بــووگــەلێ نــەخشەزان
لە چــەکــداری خــەڵکی لە ئــاغا و خــان
عــــەشایر دەهــــاتن لە هــەر لا بــە ســان

لە مـــەڵبەند و دەشت و لە لاپـــاڵ و بـاغ
بـە خـۆمپارە گـوللە، هـەموی بـوو بـوداغ
قـــیام ئـــەفسەرانـــی خـوراسـان رەوان
دەنووسێ کـە هـەشت بـوون مـرۆڤی بـارزان
دەنـــووسێ عـــەشایر لە سـنگانێ بـوون
وەکوو شێری جەنگەڵ بە هەڵمەت دەچوون
عـەشایر بـوو چـەکـدار لە هـەر لاوە هـات
هـــەتا بـــارزانـــی لە خـوێن وەر بـدات
هـــەتا ریشـەکـەن کـەن گـەلی بـارزان
نـــەهێڵن بـــمێنێ یـــەکـــێکیش لەوان
بەڵام هەشت هەڵۆ بوون دەبوون لول و خوار
هـــەتا لێ کـــەنۆ سـەر لە لاشـەی سـوار
هـــەڵۆی بـــارزانـــن وەهـــا تـــیژباڵ
بە چنگ ناحەزی خۆ دەخەن گشت لە چاڵ
شکـــــانی لە ســـنگان هـــەلاتن لەوێ
بـــەڵام بـــارزانـــی گـــەڕانـۆ شـەوێ
لە تـــۆپ و مـــوسەلسەل تـفنگێکی زۆر
وەچنگ وانە کـەوتن لە هـەر نـەوع و جـۆر
دەجـا تـێکە «ئـاوێر» مـەی لەعـلی نـاب
هـەتا لێـوێ تـەڕ کـەم لە جـامی شـەڕاب
کـە بـەڵگو دەمـێکی لە کـورەی زەمـین
بـــبینم وڵاتـــم بـــە ئـــازادی ژیـــن

## چوونی سەرۆک بارزانی بۆ تاران

لە ۱۹۴۶/۱۲/۲۱ و گەڕانەوەی لە تاران لە ۱۹۴۷/۱/۲۹
«هـمایون»، «غـەفاری» دەنـێرێ کـە زوو
لە گـەڵ بـارزانـی بکـەن دوو بـە دوو

وت و وێــژ و بــاسی لە ئــاشتی و ژیــان
کــە ئــەو بــێتە تــاران، لەگــەڵمان بــران

بە هۆی وەی بوو ژنراڵ، لەگەڵیان دەچوو
هــەتاکــوو لەگــەڵ شــا، ببێ رووبەرو

لە بــــۆ چــــارەیی کــار، دەبــوو ژنــراڵ
لە تــاران لەگــەڵ شا، لە ئەوکاتی ساڵ

وت و وێـــــژ لە بــەیناکــە دەس پــێکرا
هــــەموو ئــەو مــەبەستە لە مــێژوو خـــرا

بـــــەڵینی دەدا شــا، کــە خــاک و زەوی
بە ئێوەی دەدەم مــن، ئەگــەر رێ کــەوی

وتی چەک بە دەوڵــەت بــدە مــەردی کــار
بڕۆن زیــندەگــی کــەن، بــە خــۆشی لە شــار

چــەکــی دابــنێن و، لە شــۆڕش گــەڕێن
لە ئـــــەلوەند و دەوری هــــەموو دامــڕێن

ئەمیش داو و تــەپکەی کــە دی کــەوتە بیر
وتــــی بــاشە شــێخیش، بــزانــێ ئــەمیر

لە داویـــــی نــەکــەوتن، گــەڕانــۆ وڵات
لە بۆ گــەل بــەریوەن، کــە کــورد بێ‌نەجات

گــەڕانــۆ لە تــاران، لە مــزگەوتی سوور
هــەموو خڕ ببونۆ لە سەر خــاکــی طــور

لە دووی باس و خواسێ لە مزگەوتی سوور
دەڕۆین بەرەو یەخ لە خــوێنا بــوو ســوور

بــەڵام چــون نــەمابوو، لەوێ فکــری مــان
دەڕۆیــین بــە ســەغڵەت بــەرەو نــیشتمان

ئــەتۆ دیت کــە رازی نــەبوو مــەردی هــەرد
لە ژێــر بــاری نــاحەق، بچێ شــیرەمەرد

وتــی یــا بــە مــەردی، لە ســەر ئــاسمان
قــەدەم لێ دەدەم مــن، وەیــاکــوو نــەمان

ئــەگــەر مــردنم بێ، بــە مــەردی لە بۆم
بـــە وەی ســـەربڵیندم نــە رابــەر لە رۆم

بــە هــۆی وەی نــەیاندا بــە نـان و زەمـین
نشـانەی دلێـری، چـەکـی مـان و ژیـن
بــە دەسـتوری شـابوو کــە شـەڕ گـژ درا
بـــە بـارانـی گـوللەی زەوی لێک بـرا
وتـم ئـەی مـەگـەس تـۆو شکـاری هـەڵۆ؟
لە بــەر بـای شــەمالاً دەبـی رەنــجەڕۆ
لە ژێـــر بـــاڵی سـیمرغ لە نـێو بـارزان
لە ژێـر پـێ دەمـێنن، ئـەوەی ئـەژدەهان
گـــەلێ شـێر و بــەبر و پـڵینگی کـەلان
دەڕۆیـــن لە وێـــدا بکـــەن راوی وان
بــەلاّم چـاوی وان و، دڵ و مـەغزی سـەر
بـــە چــنگاڵی بـازی ئـەوێ هـاتەدەر
فـــەرەیدون و کـــاوەن لە نـێو بـارزان
نـەکـا فکـری خـاوت، لە بـۆ راوی وان
نەکەی ئەی مـەگـەس روو لە بۆ نێو چیا
لە بـۆ جـەنگی روسـتەم، دەبـی رووسیا
نەکەی فکـری واکـەی کـە بگـری بـە راو
ئـەتۆ شـێری مـەستی بـە تـۆر و بە داو
نــەکــەی رو لە لانـەی گـەلی بـەبر و شێر
رەگ و ئـێسک و پـیستت دەبێتن بـە لێـر
مــەڕ و رێــوی بـۆ سـەر تـەلی بـارزان
نــەکـا هـۆشی خـاوت لە بۆ خـوێنی وان
ئەگـەر دوژمـنی بێ، لە چـەرخـی فـەلەک
بــە نـیزەی لە ئـەرزی دەدا تـاک و تـەک

## بڕیاری همایونی و بارزانی لە سندوس

نیوەی هەوەڵی شوبات ١٩٤٧

هـــمایونی تـیمسار و ســەرهەنگ غــەفار
بـــە گــورجـی دەڕۆیــن بـنووسن قــەرار

لە سـندوس بـوو دیـتن لە ژنـراڵ کـرا
هـەتا زوو بـڕۆن زووکـە وەعـدەی درا
وەفـایان بـە پـەیمان دەکـرد و دەچـوون
لە نـێو خـاکـی زەرزا، شـنۆ وەر دەبـوون
لە سـەر خـەتی پـێشو لە نـەغەدە دەمـان
تـفەنگچی بـوو سـوهراب و گـیوی زەمـان
لە نـێو گـوندی مـوانـا، سەرۆک بـارزان
قسەی کـرد لەگـەڵیان، لەگـەڵ ئـێل و خـان
کـە مـیهمانین ئـێمە، لە ئـەم شوێنە مـاین
هـەتاکـو بـەهاریٚ لە نـێو ئـێوە دایـن
هـەموویان بـە خـۆشی، دەیـانکوت بـەڵێ
لە سـەر چـاوی ئـێمەی لە هـەر مـەنزڵێ
بـەڵام خـۆفرۆش و قـوای دەوڵـەتی
دەچـوونە شـەڕی وان لە بـێ‌هیممەتی
کە «پەسیان نەجەف» بوو لەویٚ بووی خەبەر
دەنـوسێ لە بـەر وەی، بـمێنێ ئـەسەر
بـە دەسـتوری دەوڵـەت عـەشایر بـران
لە هـەر لاوە بـۆ شـەڕ، هەمو دەنگ دران
لەوێ یـازدە گـوردان، پیادە و دوو هـەنگ
سەوارەی لە دەوری، هەموو وەک نەهەنگ
بـە نـیروی هـەوایـیش سـەراسەر وڵات
دەسـوتا بـە رەگـبار، نـەما رێـی هـەڵات
شەڕی وان لەگـەڵ کـورد ئـەبەم جـورە بـوو
هـەتا وەک فـنیقی لە بـەین چـن هـەموو
هـەتا ریشـەکـەن کـەن، گـەلی قـارەمان
گـەلی تـۆپ و تـانگیش، تـەنی دەورەیـان
وەکـوو شێر و بەبر و پـڵنگ بـوون ئـەوان
لە بـۆ خـوێن و رۆحـی سـەرۆک بـارزان

لە نێو کێو و شاخا وەکوو گورگی کۆک
دەڕۆین وەدەس خەن لەوێدا سەرۆک
بەلاّم لەو دەرونا، دەیانگوت خودا
نەکا تووشی ئەو بین لە ئەم شوێنەدا
لە بۆ روستەمی زالّ خودایە نەبین
ئەسیری کەمەندی کەنەفتی بژین

# شەڕی نەلّۆس

لە «ئازار»ێ دابوو شەڕێکی کرا
لە نالّۆس بوو دیمان کەلاک لێ خرا
تفەنگچی لە بارزان دەبوون سی نەفەر
کە هەشت ئەفسەری گرت لە دەولّەت بەشەڕ
لە زابت بوو حەفدە هەموو دیل کران
شتومەک گەلێ بوو بە تالاّن بران
لە سەربازی سیسەد نەفەر بوو لە وان
هەلاّتن ئەسیر بوون لە نێو تۆڕی مان
لە خۆمپارە و تۆپ لە ئەسبابی شەڕ
لە دەولّەت بوو گیرا لە شاخ و لە دەر
لە وێدا بوو سەرگورد «کەلاّشی» بە تیر
لە سینگی درابوو ئەجەل بوو ئەمیر
لەوان هەلّقولّی زوو سپای بێ ژمار
وەکوو خیز و خولّ و وەکوو مور و مار
لە نێو وانەدابوو گەلێ خۆفرۆش
دەهاتن بە نەعرە و بە گوڕە و خورۆش
لە ناکاو بوو بارزان بە چەک دەوری دان
لە نێو جەغزی کوردان دەمانۆ ئەوان

وەکوو شێری بیشە بە هەڵمەت دەچوون
لە وەیدابوو دوژمن لە دوی چارە بوون
لەوێ سەر پەلی وان «خودادوست» بە شیر
لە بۆ شەڕ دەهات و کرا دەستگیر

## شەڕی ناوچەی مەرگەوەڕ
١٩٤٧/٣/٢٥

دەڕۆین لە سندوس، بەرەو غەربە بوون
بەرەو چارەنووسی، خودا بوو دەچوون
لە نێو دایرەی تۆپ، مرۆڤان ئەمان
سەراسەر زەوی سوور، بە خوێنی جەوان
بە نێو کاتوشادا، ئەجەل بوو دەهات
دەسوڕا لەوێدا لە دوی ذی حەیات
فرۆکەی بە راکیت، لە وانی دەدا
کە بومبئەفگەنیش بوو، نەبوو بۆی هەدا
زەمین و هەوا بوو بە ئاورپژین
بە ئاور زەمین بوو، کە بەفری مژین
بلێسەی گلولەی، لە هەر لاوە هات
زبانەی دەکێشا دەسووتا وڵات
ئەوا شینە دووکەڵ دەبینرا لە دوور
فرۆکەی بوو سوتا لە کێو مێرگەسوور
لەوێ گێژەڵووکە و، تەپ و تۆزی کرد
لەتی باڵەکانی دەهێنا و دەبرد
دە «ئاوێر» ببینە، زەوی گش تەنوور
شەماڵ دەی شەکێنێ لەسەر گۆشتیسوور
ئەوا دێتە گوێ دەنگ بە گریان و شین
لە لاشەی زوخاڵ و دڵی پڕ ئەوین

لە نـــێو بـــووری ســینا، لە مــەڵبەن وڵات
فــڕۆکــە و تــەیارەی وەکـــوو بـازە هـات

بـــە بـۆمبا و راکـێت، وەهــا لێــی دەدان
هـــەتاکـــو نـــەمێنێ گـــەلی بــــارزان

بـە مــەوجی هــەوادا، دەهــات ئـاگـری
بــــــڵێسەی دەبـــینرا لەوێـــدا بــــری

بــە چــەخماخە لێـدان، لە هــەور و هــەوا
دەڕۆیــن بــە ســەغڵەت، لە نــیوەی شـەوا

لە ئــــەرز و هــەواوە پــریشکەی دەچـــوو
هــەمو بـومب و بــاروت، بە ئـاور دەبـوو

بـــە بـــڕیاری شــــا و بــە یـاسایی ئــەو
لە بــارزان دەبــوو دەن بــە رۆژ و بــە شـەو

عەجەب فکروهۆشێ؟!کە چۆن شێری مەست
بـە شــاڵاوی رێـوی و چــەقەڵ دێتە دەست

گەلی کورد بە خـەنجەر بـە سـەرنێزە چـوون
لە بـۆ راوی نــاحەز لە هــەر کـوێ کـە بـوون

لەوان بـــوو ئـــەسیر و گــەلێ کــوشتەدان
بــــریندار دەکـــــەوتن لە شــــاخ و تــەلان

ســـــەرۆک بـــــارزانــی، کــە دەورەی درا
وەکــــوو روســـــتەمی زاڵ لە شـــەڕ بـینرا

وەکوو شێر بوو نەعرەی لە نێو تۆپ و تانگ
دەهـــاتن دەسـۆڕان لە نـێو تـوزو قــانگ

لە نێو چەکی بە دەستی، وەکوو خیز و خۆڵ
ئەسیر بوو (جیهانبان) لە نـێو مێرگ و مـۆڵ

لەوێـــدابــوو دوژمــن لە هــەرلا هــەڵات
دەڕۆیـــن لەوێڕاکــە خــۆ دەن نــەجات

لەوێ بـــارزانـــی لە نـــێو وانــــە هــەر
وەکـــوو ئــەژدەهایێ، دەبـــوو حــەملەوەر

دەرۆیـــی پـــڵینگێ لە بـــۆ گـــیرودار
نـــەبوو بســـڵەمیتۆ لە شـــەڕ جـــاروبار
لەوێـــدا جـــەهەننەم، بـــە تـــۆپ هـــەڵکرا
هـــەمو شـــاخ و داخـــی، لە ئـــاور خـــرا
لە هـــەرلاوە حـــەملە بـــە روســـتەم کـــرا
بـــەڵام جـــەغزی دوژمـــن بـــە شـــیری بـــرا
لەوێ حـــەوت شـــەهیدن هـــەبوو قـــارەمان
فـــریشتەی بـــەهەشتن لەوێ جـــاودان
مـــرۆڤی مـــەرگەوەڕ بـــوو لەگـەڵ دەشتەیێڵ
لەبۆ یـارمەتی کـورد، دەهـات عـێڵ و خـێڵ

## ڕۆینی شێخ ئەحمەدی بارزانی بۆ نێو کلیلە بەفرەکان

ڕۆژی ١٩٤٧/٤/١٠

کە شێخ دیتی تیمساح، لە مەرگ و نەمان
ئـــەوا زاری کـــردۆ، لە بـــۆ عـــێلی وان
لە نـــێو گـوللەباران، لە چـڵپاو و خـوێن
دەڕۆیـــن بـــە بـێ‌وەی بزانـن لەکـوێن
کە دی چـەن هـەزاران، لە پـیر و مـناڵ
لە نـــێو زاری مـــەرگی چـــیا دانـــە لاڵ
ئەوەیش بوو بە هۆی وە، لە بۆ مانی وان
ئـــەوان گشت بـــەرێتۆ لە بـــۆ بـــارزان
وتـــی قـــەقنەسم مـــن ئـــەوا بـاڵی خـۆم
لە ئاور دەدەم بۆت کە هـاوخوێنی تـۆم
لە تـــۆم کـــردوی دنـــیا لە نـــێو ئـــاورا
لە بـــۆ مـــافی ئـــێوە دەســـوتێم بـــرا

لە تـۆم مـن لە بـەفرا، لە نـێو بـەردەڵان
لەکـانی خـولاییش نـیه بـۆم ئـەمان

لە لاپاڵی کورتەک، لە هەرکات و ئان
دەسـوتێ مـناڵن بـە بـومباردومان

لە لاپـاڵی قـەندیل لە شـاخی وڵات
لە یـەخچاڵی بـەفرا دەبـینم بـرات

لەویش گوللە تۆپن بە گڕ دێنە خـوار
خـودا مـافی مـن بـۆ چیایە و ژوار

لە نـێو شـاخەکـان سنووری عێراق
پـەراوێـز تـەواوی بـە یـەخ ببوە تـاق

گـەلێ گـەورەتر بـوو، لە دیـوار چـین
کـلیله سـەهوڵ و بـەفر چـین بـە چـین

کە تاق لێ درابوو بە رێـز چـەن تـەبەق
وەکـوو ئـاسمان بـوو، بـوڵندی رەبـەق

مـەحاڵیشه «ئـاوێر»، بـە شـەڕ تێکیدا
مەگـەر قـەهری ئـەڵلا لە جـێ لێکـیدا

دەجا شێخی بـارزان نـەخۆش و سـەغیر
چـلۆن رەد دەکـاتن خـودای بـێنەزیر

لە بـۆ پـردی گـادەر هـەموو بـارزان
لە هـەر لاوە رۆیـن خـودایـا ئـەمان

## رۆینی شێخ ئەحمەد بۆ عیراق و ژنراڵ بۆ روسیه

لەگـادەر بـوو عـێل وگـەلی بـارزان
بـە دو قـۆڵی دابـەش دەبـوون گش ئـەوان

لەوێـدا وەخـڕبوون هـەموو پسیاوی پـیر
بـە نـاوبانگ و نـاودار مـرۆڤانی ژیـر

بــــە راوێـــژ و تـــەکـــبیر ســەرۆکـانی وان
ئـــەوەی بـــاشە بـــڕیار لە ســـەر وەی دران
بـــــە بـــڕیاری شـــێخ و گـــەلی دێ لەوان
لەگـــەڵ دەولـــەتا بـــن دەبـــێ بـــۆ ژیـــان
لە بـــەر وەی کـــە مـــنداڵ لەگـەڵ پـیر و ژن
نـــەدەن گـــیان لە بـــرسا لە هـــەرجێی بـن
ئەوانەی کەخۆیان بە دەستۆ دەدا(١٩٤٧/٥/٦)[1]
بـــە نـــاحەق لە حـــەبسی خـــران بـێسەدا
نزیک شەش سەدێ بوون وەکـوو گێو و تـوس
کـــە ژنـــراڵ ســـەرۆک بـــوو دەرۆین کـە روس
بکـــاکـــۆمەکـــی خـــۆی بـەکـوردی ولات
نـەبێ خـاکـی وانـە لە دەس تـورک و تـات

# ڕێی چارە

مـــــەلا مســـــتەفا بـــو لە ســـێ ئـاگـرا
دەبو یەک پەسن کـا نـەما جێی هـەرا
دەبـــو رابـــوەستی لە بـەر دەس نـەیار
لە ژێر دەستی ئەودا زەلیـل بـێ و هـەژار
وە یـاکـوو دەبێ بێ لە مـەیدانـی شـەڕ
نـــەمێنێ کـــەسێکی لە دەریـا و بـەڕ
کە سێ دەوڵەتان وان بە تۆپ و بە هەنگ
زریـلی و فـرۆکـە لە مـەیدانـی جـەنگ

١ ـ شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا و بارزانییەکان و هاوکارەکانیان گەینە سەر چۆمی گادەر پارێزەر و قـەرەوڵی حکومەتی عێراق بە نێوی عەلی حەجاری پێی داگرتبوو بە شێخ ئەحمەدی دەکوت دەبێ تۆ و مەلا مستەفا لە پێشدا لە پردی گادەر بپەڕنەوە و ئەویش دەیکوت مەلا مستەفا دوای خەڵکەکە و ئەسلەحە بە دەستەکانەوە دێ ئەویش لە پردەکە دەپەڕێتەوە ئاخری ئیجازە بە شێخ داو ئەوان بە پیر و ژن و منداڵەوە ڕۆین بۆ عێراق و لە ١٥ی نیسان‌دا لە ساڵی ١٩٤٧دا مەلا مستەفا لە شێخ ئەحمەد و خانەوادە و دۆستانی خوداحافیزی کرد و لەگەڵ (٥٦٠) مرۆڤی قارەمان بەرەو روسیەی شورەوی رۆیین.

لە نـــێو گـــوللەباران، بـمێنێ و ژیـان
لە دەســدا بــە گــوللەی گـەلی دوژمـنان

لە ئـەو کـاتە دیـتی کـە دەس هـاتی شـەڕ
لە گەڵ چـەندە دەوڵـەت هـەیە بێ‌سەمەر

سـەبارەت بـە وانـە دەچـوو تـاکـو روس
لە گەڵ شەش سەدێکی وەکوو گیو و توس

دەڕۆیـن لە گــەڵیا هــەتاکــوو ئـەرەس
گەلی بەبر و شێر و پڵینگ بـوون بـە لەس

بە نەخشە دەڕۆیـن، بـە نـەخشەی دەرون
وەکوو ئەژدەها بوون، کە مارپێچ ئەبوون

لە کــوێدا دەبـــینی وەهـــا ڕێـبڕین
وەهــا ڕاپــەڕین و وەکـوو شێر گـوڕین

کەژ و کێو و سـەحرا لە چـەکـداری وان
وەکـوو مـەوجی دەریـا جـمین و جـمان

وەکـوو تـەرزە گـوللە لە سـەرڕا دەهـات
دەســوتا وڵات و دەبــاری دومــات[1]

ســەرۆک جــەنگیانی ئـوروپا هــەژان
لە مـارپێچی شـەڕیا، سـەران سـام ئـەمان

ســیاسەت مــەداران، لە کـورەی جـیهان
لە دەرچــوونی ئــەودا، هــەمو واقـەمان

وەکوو مەوجی دەریا، سێ دەوڵەت بەکار
ســەرۆک بـارزانـی چـلۆن بـوو قـوتار؟

لە حەوشەی جیهانا کە پسپۆری جـەنگ
دەیان بیست لە سەروان دەباری فشـەنگ

هــەمو وڕ دەمـانۆ لە مـەردی و خـەبات
دەیانگوت بە باڵیش بـڕۆن کـوا نـەجات؟

چ جــەنگ ئــاوەرانــن مـرۆڤی بـارزان!
کە تەیمور بوو دەیکوت لەوێ ئەل‌ئەمان

---

١ - بەڵا و موسیبەت.

سـیاسەت مـەداری گـەلی رۆژهـەلات
لە نەخشەی شەڕی وان دەبوو فکری مات
کـەسانی دلێـرن لە مـەیدانـی جـەنگ
دیان بارزانین، هـەموو، وەک نـەهەنگ

## پرسیار

بـەلام بـا بـپرسم هـەتا شـورەوی
لە بـەرچی بۆ ژنـراڵ هـەلۆ بـوو رەوی
لە بەر وەی بوو مافی گەلی کوردی ویست
بەلام گەردی باروت لە سەریان ئـەنیشت
لە بـەروەی بـمێنێ هـەتا هـەڵکەوێ
بـە دەرفـەت لە دوژمـن بـدا سـەرکەوێ
لەبەر وەی کە کوردیش نەبێ دیلی کـەس
پەل وپۆی بوو تاکـوو لەتـی کـا قـەفەس
سەبارەت بەوەی بوو کە کورد بوون ئەوان
دەیانویست بە کـوردی بـژین لەو جـیهان
لەبـەر وەی، لەبـۆ حـەق، لە ئـابلوقەمان
نـەبوو بـێجگە رۆیـین ئـەبەد چـارەیان
لەبـەروەی نـەبەز بـوو لە بـۆ نـیشتمان
دەکـۆشی بـە خـۆشی بـژی هـاوزمان
لەبـەروەی بـە هـێرش لە چـەن دەوڵـەتێ
فرۆکە و قشون هـات لە هـەر لاو خـەتێ
هەتا مـیللەتی کـورد لە نـێو خـاکـی خـۆ
لە نـێو خـوێنی وەردا بـڵێ پـێی بـڕۆ
لەبـەرچـی ئـەوانـە وەهـا خـوێن مـژن
لە بـۆ مـیللەتی مـاد دژن هـەم گـژن
لە بەر وەی دەیان دی زەمینی کـە نـەوت
وەکوو ئاوی دەریا بە جۆش سەرئەکەوت

دەیـانویست لەوێـدا ئـەوەی وەرگـرن
تـەلا و زێـوی مـادیش بـە بـەر خـۆ بـرن
لەبـەروەی کـە کـوردان نـەبێ هـەستیان
نـەبێ نـەوتی کـەرکوک لە ژێـر دەستیان
لەبەروەی زەوی خـاک لە رادەی بـەدەر
لە کـــوردی بســـێنن بـبێ دەربـەدەر
لە بەروەی بۆ کوردان کـە پـەل‌پەل کـران
گـەلێ لاشـەیی وان لە دەجـلەی خـران
لە بەروەی بە خـوێنی گـەلی کـورد مـژین
لە کـاخێکی نـمرود بـە شـادی بـژین
سـەبارەت بـە وەی بـوو حـقوقی بـەشەر
نەیان دی کە بۆ کوردی بێ بـۆی ئـەسەر
دەیان ویست نـەمێنێ ئـەبەد کـورد زمـان
هـەتا نـاوی کـوردیش نـەبیسن ئـەوان
بـەوەی نـەسلی مـادە دەیـانکوت ئـەوان
هـەمو تـورکی کـێوین لە کـێو و چـیان
هـەژاریش لە زانـای عـەرەب نـەقڵە کـا
بە سوێن و بـە قـورئان ئـەوەی شـەقڵە کـا
بـە حـەق کـورد نـژادی عـەمر عـامرن
عـەجەم نـین ئـەوانـە بـەڵام تیکەڵن

## قاسم و کودەتا (١٩٥٨)

لە ئەم کات و سـاڵە لە پـەنجا و هـەشت
بـە پیلانی قـاسم رژا خـوێن لە تـەشت
مەلک فەیسەڵی دوو، کـە کـوژرا لەوێ
لە جێی وی بوو قاسم بـە رابـەر خـەوێ

لە ئــــوکتوبری ســــاڵاْ گــەلی بــارزان
گــەڕانۆ عێراق و لە بـەغدا بـوو، مـان
لە مــەسکۆ گــەڕانـۆ سـەراسـەر وڵات
کرا جـەژن و شـادی، درابـوو خـەڵات
فرودگایی بـەغدا، لەگـوڵدا بـوو سـوور
لە بــەر بـارزانــی ئـەوێ بـوو بـە تـوور
لە بەغدا سەرۆک بوو، قسە و باسی زاف
لەگەڵ قاسما بـوو لە بـۆ کـوردی مـاف
وتــــی مــــافی ئـێوە دەکـەم وانگــا
کــــە وا ســــازمانی مــیلەل تــێبگا
دەبــێ مـافی کـوردان بـە خـۆیان درێ
لە هــیچ لاوە نـابێ، کـە خـورتی کـرێ
لەکاتێکی قـاسم، لە رێ چـەپ دەبـوو
بــە پــەیمان و قــەولی نــەبوو ئـابرو
ئــەوە بــوو بــە هــۆ تــا عــەشایر دڵ
لە مەیدانی شەڕ بن، لە نێو خـوێن و گـڵ
کوردی کورد لە قاسم، دڵی پڕ لە خوێن
هەمو سەقر و بازن، لە شەڕ یـا کـە دێـن
هــەڵوی بــارزانــی، لە شـاخی سـەرێ
دەبوو لول کە جەرگی هەمو لێک بەرێ
هــەتاکــوو لە داگــیرکەری وەرگـرێ
هەمو مـافی کـوردان، بـە دەسـتی درێ
لە بۆ شەڕ لە بەغدا دەچـوو عـەسکەری
گـەڵای پـاییزی بـوو، هـەموو داوەری
لەوێدا بـوو قـاسم، کـە ئـیحساسی کـرد
لە مـەیدانـی شـەڕدا، دەبـێ ورد و پـرد
لە ئەو فکرەدابـوو لە هـەر ئـان و کـات
لە شەڕ دور کەوێتۆ بدا خـۆی نـەجات

بــەڵان قـاسمن دی لە شـیست و یـەکـا
لە یەک غەفڵەتا بـوو سـەری هـەڵتەکـا

# بارزانی و قاسم

بــــە بـــازوی بـارزان، لە قــاسم درا
لەوێڕا بـوو بـێتین، لە قـودرەت خـرا
بە هۆی وی بوۆخاوەن، پلە و ئەفسەران
لە بــەعسی لە قـاسم، هـەمو وەرگـەران
کە مەئموری مەرگیش، لەگەڵیان دەهات
لە ناکاو قروی گرت، لە خاکا بوو مات
لەوێ دەم بوو عارف، سەرۆکـی وڵات
سەرۆکی وەزیران، حەسەن بەکرە هات

# حەسەن بەکر

حەسەن بەکـری بـەعسی، بـە یـەک کـودەتا
هــەڵی کــەند عــارف، نــەبوو بــۆی خـەتا
ســەرۆکــی وەزیـر بـوو سـەدام ئـەو دەمـە
هـــەتا ئـــێستە دنـــیا، لەوی پـــڕ تـــەمە
حـــەسەن بـەکـر هـەیبوو دوان و وتـار
لەگـــەڵ بـــارزانـــی نـــەبێ گـــیرودار
لەوێـــدا بـــۆ ســـازان، وت وێـــژی وان
بــە خــەڵکی عـێراقـی، (بەکـر) راگـەیان
تــەواو خــەڵکی کــورد و، زمــانی ئــەوان
بـــە رەســـمی دەنــاسم، نــیە جـێی گــومان

بــە قــانون ئــەساسی، حــەقی کــورد لە جــێ
دەنــاسم بــەوانــی، دەدەم هــەرچــی بــێ

مــــوعاون لە کــوردان، یــە کــێ هــوشیار
لەبـــۆ رابـــەری گـــەل، کـــراوە دیــار

ئــەوەی خــاکــی کوردە لە زۆر لێخــوراو
دەبـــێ بـــیدەنۆ بـــەو، زوڵـــم لێ کــراو

کـــمیسیون دروس بـــێ لە بــۆ جــووتیار
بـــەوی رابگـــەن تـــا بـــبێ زانــیار

بـــە زانکـــۆ و زانــا، بــبێ کشت و کــاڵ
بــە زانستی «ئــاوێر»، لە هــەر کــاتی ساڵ

لە مـــادەی دوایـــە کـــە کــوردی وڵات
هەموو وەک عەرەب وان، لە ژین و خەبات

لە شـــالیار و پـــێشکار وەزیــر و وەکــیل
ســەرۆک نــاوچە بــابن، لە کــوردی ئــەسیل

لە مـــادەی ســێ‌یایە، گــەلی کــورد زمــان
دەبێ وەک عــەرەب بێ بــەش و مــافی وان

لە زانست و فــەرهەنگ، پــەرەی پــێبدەن
ئــەوەی زۆر بــە نــرخــە، لە ژێــر چــاپی خــەن

دەبـــێ شــان لە شــانی فــەلەکــدا زمــان
زمـــانی گـــەلی کــورد، لە مــادن ئــەوان

لەوێــدا (بــە کــر) بــوو گــەلێ جار و بــار
بـــە بـــاشی قـــەبوڵی دەکــردن بــە زار

وتــاری بــڕی مــاف، بــە هــۆی زۆر خــەبات
لە پەخشی تلویزیون، حەسەن (بەکــر)ە هــات

گـــوتی قـــەولنامە، کـــە ئـــیمزا کــرا
گەلی کورد، عــەرەب هــەن بــە ئــەو هــۆ بــرا

دە «ئـــاوێر» دەزانـــی دەبــوو رێک خــرێ
دەبـــوو ســـەرشماری لە کــەرکوک کــرێ

کــە کــەرکوکی کــوردان بــە خـۆیان درێ
هـــەتا ســـەربەخۆیی تـــەواو ســـەرگرێ
بـــەڵام ســـەرشماری بــە رســتە و زمــان
نەبوو قەت عەمەل بێ، لە حـەوشەی جـیهان
ســەرۆک بــارزانــی، بـە هـیچ جـۆر نـەبوو
لە کەرکوک گوزەشت کا لەبەر دەرچـێ زوو
لە ئــاکــامی کــاراگــەلێ تــورک و تــات
سیا و سوور بوو سازان، نـەبێ کـورد نـەجات
قـــەرار ئـەلجزایــر لە لای شــا و ســەددام
گـــری دا ولاتـــن عـــەجایب دەمـــام
بــە دەســتوری ســەددام لە شار و لە گوند
تـەواو مـاڵی کـوردەان دەبـوو، جـێگە کـوند
هـــەموو کـــانیاوی بــتون رێــژ ئــە کــرد
تـــەواو کـــوردەکـــانی لەوێ لادەبــرد
لە بـــاشوور عـــێراقــی دەکــردن تـەواو
دەبــوون وەک ئـەسیری بـە بـێ نـان و ئـاو
لە بەر وەی بوو «ئاوێر» کە کورد چەن ولات
نــەبن کـومەکـی یـەک لە رێگـەی نـەجات
ســـــنووری بــــە پـــانی دەکـــیلومتر
لە «ئــاوێر»ی ســەندن لە بــۆ، کـوندی خـر

## عارف

لە بــەغدا بـوو هـەللا، کـە قـاسم کـوژان
لەوێـدا بـوو عـارف لە جـێی ئـەو خـزان
بە زاهیر بـۆ مـافی گـەلی کـوردی ویست
قسـەی ژنــراڵــی بــە بــاشی دەبـیست

لەوێدا بوو پێ هات حەقی کورد بدا
بەڵام زەهری لێوی نیشانی دەدا

کەواگش وتاری، دەهۆ بوو پلان
خرابتر لە قاسم، لە چەنگیزخان

لە سوریە بەغدا، بە بریار وان
سپای هەردوو دەوڵەت دەهاتن بە سان

هەتاکوو بە هەر دوو لەکورد خەن قران
تکەی خوێن بباریّ، لە شمشیری وان

سپای بەعسی هەردوو، بەگورجی دەهات
هەتا خاکی کوردان وەژێر چۆکی خات

بە تۆپی لە سەحرا، بە موشەک تەلان
گڕی دا ولاتن، هەمو دەغڵ و دان

هەموو چەرمی بەبر و پلینگی لە بەر
لەگەڵ بارزانی دەهاتن بەشەر

لە جەبهەی شەڕابوو چەرم دادڕان
لە ژێریا بوو رێوی، هەڵاتن ئەوان

لە بویێ بوو سەرباز لە دو دەوڵەتان
لە موسڵ بەرەوژوور، نەهاتن ئەوان

نەیان بوو نەترسی لەکوێ بارزان
نەما هێز لە دڵیان لە قودرەت خران

بە هۆی وەی لەکوچە و لە ماڵ و لە بان
لە نێو باغ و مەزرا، لە سەحرا و تەلان

لە هەرکوێ دەیان دی مرۆڤی بارزان
گەلەی بەبر و شێر بوون لە بەر چاو ئەوان

لە بن هەر لقی دار، پڵینگێکە دیار
لە بۆ چاوەدێری دەکا راو و شکار

دەجا پرسە «ئاوێر» ئەمەی قارەمان
چیە هۆی شکانن لە حەوشەی زەمان

گەلی ئێمە کوردان هەموو بەش خوراو
گەلی چاو لە دەست و لە زیندان خراو

دە «ئاوێر» بزانن، نەیاری، دژی
لەگەڵ خۆ، بوە، هۆ، کە کورد وابژی

## ژنراڵ بارزانی و شورەوی و ئەمریکا

کە بڕیاری روس و عێراق بەسترا
لە تاریخی نوسیم ئەلیرەش خرا

بە دەستووری ژنراڵ کە «سامی» بوو چوو
لەگەڵ «کاسگینا» لە کورد باسی بوو

بەڵێ «کاسگین» بوو، لە بۆ مافی وان
لەگەڵ رێبەرانی، عێراق بووی بەیان

بەلاّم بوو وتاری، خەلاف و بەتاڵ
لەوێ ناهومید بوو، تەواوا ژنراڵ

بە روسی بوو زانا بە روسی دەگوت
لە بەر ئەو لە ئێمەی مەدەن زرم و کوت

کە شا، زانی باکوور، وە باشووری ئەو
بە دەس روسە سوری دەبوو هوشی رەو

لە بویێ بوو وا زوو بە فکری بگا
کە ژنراڵ ببینێ وە دۆستی بکا

بە هۆی ئەئوەبوو وا، کە نیکسون و شا
لەگەڵ یەک؛ وەکۆ بوون؛ قەڵەم بوو سیا

قەبوڵیان دەکرد و بە هۆی وەکرا
هەتا شازدە ملیۆن، بەکۆمەک برا

لە لایان سیاوە لە بۆ ژنراڵ
گەلێ کۆمەکی چوو نەبێ ژینی تاڵ

لە دوی چەند رۆژێ، لە لای شاوە بوو
لە هەر جۆرە کۆمەک بە لێشاو ئەچوو

بـــەلاّم بـــارزانـــی، نـــەبوو دڵـنیا
لە شــاو و لە ســاواک ئـەوەندەی ژیـا
لە ژنــراڵـی وابــوو، ئـەوەی ئـەمریکا
کە کۆمەک دەنێرێ، بـە رەمـزی دەکـا
ئـیشارەی بـە نـاسین بـە رەسـمی تیا
لە بـــۆیێ بـــوو ژنـــراڵ لەوی دڵـنیا
ئـە ئـاوایـە «ئـاوێر» دروسـتی بـەیان
هـەمویشی دەمـێنێ لە مـێژوی جـیهان

# شاڵاوی عێراق و کۆمەکی ئێران بە کورد

لە وەختی سپایی عـەرەب گش دەهـات
وەکوو مەوجی دەریا لە هەرکات و سات
ســـەران خــر دەبـۆنۆ لەگـەڵ ژنــراڵ
هـەتاکـوو بـە راوێـژ بکـەن بـاسی حـاڵ
لە نـێو گـێژەڵووکەی، سیاسەت بۆ مـان
تەواو میللەتی کـورد لە چـەرخـی زەمـان
لەوێـدا بـوو ژنـراڵ بـە بـیری هـەمان
دەیـانویست لە ئـێران قشـونی کـەلان
لە بەروەی کە «شا» بوو، بە فکـری نـەوی
لە خــاکــی عــێراقـا نـەبێ مـل قـەوی
دەسی کرد بە کۆمەک نەبوو بۆی وچـان
لە جـەبهەی شـەرێدا نـەبوو بۆی ئـەمان
دەری مـــەرزی کــردۆ دەری رێـوبان
هــــەتا بـــێنە ئـێران، پـەناگـر لە وان
مـوهممات دەرۆیـی بـەکـامیۆن بـە ریـز
بـە شــاخا دەرۆیـین هـەموو سینەخیز
بە زیدی هەوایی بە موشەک دەچوون
لەگەڵ زیدی تانگ لە سەنگەر دەبوون
فـرۆکـەی عـێراقـی لە تـرسی ئـەمان
لە دور بـومبی داویشت لەوێـدا نـەمان

کەفەی کوردەکان بوو لە هەرکات و سات
دەبینرا کە قورسە بە بۆنەی خەبات
بەڵێ کۆمەکی «شا» بە سێلاو دەهات
نزیک بوو کە خۆیشی لە ئاور بخات
لە بەر وەی کە «ئاوێر» لە ئێران زەمین
دەبوو مافی بدرێ لە بۆ مان و ژین
لە ترسی ئەوەی بوو کە رازی دەبوو
بە ئیمزای ئەوەی واکەرێ کەوتبوو

## کۆبونەوەی سەرانی ئوپێک (١٩٧٥)

لە بەر کونفرانسی سەرانی ئوپێک
سەران خڕ ببونۆ، گەلێ رێک و پێک
لە شار الجزایر، لە ساڵی ئەوا
کە لێرەی دەنوسم دورست و رەوا
لەوێدا بوو فرسەت لە بۆ شا و سەددام
سەرانی سێ دەوڵەت کە وان بوون بە سام
بومەدیەن و سادات، حوسێنیش لە گەڵ
بە گیان تێدە کۆشین نەمینێ جەدەڵ
لە ئێوارە پێلان، هەتا بەربەیان
سەددام بوو وتاری لە گەڵ (شا) بەیان
دوو شەو بوو نەخەوتن، هەتا رۆژ ئەوان
لە بۆ سەرکوتی کورد، هەبوو باسیان
شەوی دوو بومەدیەن، لە مەجلس دەبوو
گرێکانی کردۆ، لە نێو گفت و گۆ
لەوێدا بوو کاغەز، کە ئیمزا کرا
هەموو داوخوازی، لەوێ نووسرا
لەوێ چوار مەبەس بوو، لە تاییی درا
یەکی مەرزی ئاوی، لەوێ بینرا

یەکێ مەرزی خاک، و یەکی قفڵی وان
یەکێکیش نەیێلن، خەتەر بۆ هەمان
لەوێ شا بوو شێری بە فەوری دەبەست
هەچی تۆپ و تانگ بۆ هەموی خستە دەست
ئەوەی ئەسلەحەی بوو هەموی بردەوە
لە نێو خاکی ئێران هەموی کردەوە
فڕۆکەی سەددام بوو، بە فەوری دەهات
بە رەگباری ئەو بوو دەلەرزی وڵات
گەلێ ئەفسەر ئێران لە بۆ وێ دەچوون
هەتاکوو بە ژنراڵ بڵێن راست و روون
ئەگەر بێتو شەڕکەی بزانە ئەتۆ
لەگەڵ ئێمە شەڕتە لە هەر دەشت و کۆ
لەگەڵ چەند دەوڵەت ئەگەر شەڕ بکەی
بە راستی بە نەفعت نیە ئەو سکەی
ئەتۆ کاغەزێکت بەڕێ کردە رێ
کە بەڵکو کیسینجێر بزانێت و بێ
نەبوو کۆمەکیی لە بەر چی نەهات؟
نەبوو یارمەتی‌دا لە رێگەی خەبات
دە «ئاوێر» تەماشا، قەوی روی زەمین
وەکوو عەنکوبوتن، لە بۆ داوتەنین
نەبوو داڵێ بینم دەمێ لەو قەفەس
زوڵم لێ کراون هەموو بێ‌نەفەس
بەڵێ داڵ و خەرتەڵ قەفەس تێک دەدەن
بە سەر ئاسمانا پەڕی لێک دەدەن
لە بەر چی لە دنیا سەراسەر جیهان
بە قانون نەگیرا قەوی پاڵەوان
لە بەر وەی بە پەنجەی، لەتۆ پەت یەکا
بە شمشیری پێنوس بە چەپ خەتیەکا

لە کـــوێ چـــاوەدێری، حـــقوقی کــرا؟
بـــە زۆر لێ کـــراوان، حـقوق کـوا درا؟

ئـەوە بـوو بـە هـوێ وە، کـە ئاوارەکـان
لە نـێو خـاکـی ئێران بـە کـۆچەریە، مـان

بـــە پـــیلانی شـــا بـــوو، لە ژنـــراڵ درا
بـــە دەســتی خـودا شـــا، لە سـێلاو خـرا

نـــیە شک لەوەیـــداکـــە «ئـاوێر»، بـرا
بــە شــمشیری غـەیبی، لە سـنگ شـا درا

## خوو و خەسڵەتی ژنراڵ مستەفا بارزانی

بـە مـەردی و نـەبەردی، بە چـاکـی ژیـا
لە ئـــــەرزا نـــەبینرا نـــموونەی تـــیا

گـــەلێ ســـەربلێند و، گـــەلێ پـایەبەرز
بـە ژیـر و بـە بـیری، دەرۆیـی لە ئـەرز

لە ئـاکـاری چـاکـە هـەبوو بـێ نـەزیر
گـــەلێ لاگـــری بـــوو، مـرۆڤانی ژیـر

تـــەواوی وجـودی، هـەمو تـار و پـۆی
لە دۆستی و ئەوین بوو، لە بۆ خەڵک و خۆی

هـــەمیشە پـەیامی، لە بـۆ سـوڵح ئـەچوو
لە بـــۆ دڵـــنیای و شکـۆی خـەڵکە بـوو

لە بۆ عیلم و سـەنعەت، لە بۆکشت وکـاڵ
بە خەڵک دەکوت زوو، برۆن بۆی بـە بـاڵ

بـــە دەست و دڵـــی واز، پـەزیرایـی بـوو
لە بۆ دوست و دوژمـن، ئـەوەی وا دەچـوو

هـــەمو گـــیانی پـولاً، لەکـڵ هـاتەدەر
بـــوێر و جـوامـێر، لە مـەیدانـی شـەڕ

بە جـەرگ و شـەهامەت، سکـەندەر بە بیر
بـە دیـن و عـەدالەت، عـومەر بـوو ئـەمیر

پـەری مێژونوسی و، خـەتی ری لە خـاک
کە ئەو عومری خوی کرد فدای خاکی پاک
خـەیاڵ کـوا دەگـاتێ و یـا بـیر و هـۆش
کە شەستساڵ لە شاخان بە حرس و بـە جۆش
بـە دوی مـافی کوردا لە چـەرخـی زەمـان
لەگـــەڵ نـــاحەزی بـــێشەڕ و مـــلملان
حســــــــابیکە «ئــــاوێر» بـــنوسە رەوان
بـــرێ کـارەکـانی لە ســەفحەی جــیهان
گـــەلێ مـــیژونوس و، گـەلێ پـیاوی ژیـر
گـــەلێ پـیاوی زانـا، گـەلێکیش بـە بـیر
زمـــان و قـــەڵەمیان، بـە رسـتە و بـەیان
لە ئـاکـاری چـاکـەی، ورِ و، واق ئـەمان
ئـەوەکـوردی نـاسان بە خـەڵکی جیهان
کــــە وا مـــیللەتێکن ســــەخی قـارەمان
ئـــەوان مـــیللەتێکن لە پـــێنج دەوڵـەتان
لە بـــۆ مـــافی خـۆیان لە حـەولان ئـەوان
کـــــواکـــــامە مـــێژوو نـــیشانی دەدا
کـەوا یـەک نـەفەر بێ وەها جـان فـیدا
ئـــەی «ئـــاوێر» دەبـینی لە روح المـعان
بـــە بأس و شـــجاعت ئـەوان نـێو بـران

# وتاری بارزانی

ســەرۆک بـارزانـی لە نـێو هـۆز و پـەل
لە نێو باسی خۆیدا ئەمەی گـوت بـەگـەل
بە تانگ و بە تـۆپ و، بـە بـۆمبا دەهـات
نـە یـاری گـەلی کـورد، کـەگـرِ دا ولاّت
بەلاّم قـەت نـەبووا، لە حـەوشەی زەمـان
لە سەر ئێمە خورتی، بە چەک کەن ئەوان

دەجا باشە ئێمەش، ئەوەی چەندە ساڵ
بە خوێنی گەلی لاو، بە ژینێکی تاڵ

بە دەستن کە هێنا، لە دەستی نەدەین
بە پارە و بە ماشین، بە هەستی نەدەین

بە هۆش و بە زانست دەبێ بەرکەوین
قەڵەم رێبەرن بێ هەتا سەرکەوین

دەبێ هەرچی زانین لە هەرکوێ و کات
بوترێ بە هەر پەل لە ناوچەی وڵات

هەتاکوو لە دوژمن هەموو راپەڕین
بە شمشیری پولاٚ زگی دادڕین

لە وەختی شەڕێدا ئەوەی بێتە روو
بە رادیۆ بڵێن و بنوسن هەموو

بە رۆژنامەگۆڤار، لەگوند و لە شار
بڵاوی کەنۆ گش، مرۆڤی ئاگەدار

لە حیزبی هیوادا، لە هەر قوڵی وان
دەبێ پێوەنی بێ، لەگەڵتان بە ئان

دەبێ ئەو کەسەی دێ لە بۆ کار و بار
ئەمین بیتۆ چرچیل لە بیرو وتار

دەبێ هەیئەتێ بن، فیدای عێل و گەل
هەتاکوو نەمێنین، لە نێو ئاو و زەل

دەبا بێنە لامان ئەوانەی بران
بە بەش کردنی کار شەریک بن ئەوان

ئەوەی ئەفسەریشە، سیاسەتمەدار
دەبێ بێتە هەیئەت، لە بۆ نەخشی کار

بە دڵسۆزی کوردی دەناسم کەسێ
لەگەڵ هەیئەتی مەو، هیوا هەڵدەسێ

ئەمەیش میللەتێکین لە بۆ ژینی باش
لە بۆ سەربەخۆیی دەکەینۆ تەلاش

گەلێ رونە بۆ من، کە داگیرکەران
لە بۆ زوڵم و زۆرن، لە نێو نیشتمان

دەبینم کە دەوڵەت، بە تۆپ و تانگ
زەوی و زاری «ئاوێر» دەکاتن بە قانگ

لە بەرەوەی کە تۆڵەی، بسێنین لە وان
بە نەخشەی زەکاوەت بدەین دەوریان
لە مەیدانی شەڕداکە باز و هەڵوین
بە راوێژ و تەکبیر دەبێ زوو بڕۆین
دەبێ ئێمە «ئاوێر» بە بازوی قەوین
بە دەرفەت بە زویی، لە وان سەرکەوین
کە پسپوری کوردان لە بەغدا دوان
لە بۆ مافی ئێمە سەلامم لەوان

# خێلی بارزانی

گەلی بارزانی لە بارزان ژیان
وەکوو یەک رەشیدن هەموو قارەمان
لە شادی و لە خۆشی، لە تاڵی ژیان
شەریکن لەگەڵ یەک، لە هەرکات و ئان
دەبینم کە ئاڵا لە دەس بارزان
شەکەی دێ بژی کوردگەلی قارەمان
گەلێکیش بوێرن، گەلێکیش بەکار
لە مەیدانی ژینا، بەکەڵک و وقار
هەمو دوڕەکەون و، لە وەعدەی درۆ
بە هەرکەس خراب بوو دەیانگوت بڕۆ
نە پیلان و داوە، نە پەیمان شکان
دیاردەی ئەوانە هەموو وەک بران
هەمویان تفەنگچی، هەموو گورج و گۆڵ
هەمو چوست و چالاک، هەڵۆی شاخ و دۆڵ
نەبەرد و نەبەز هەن بەگیان و بە دڵ
لە بۆ چاوی دوژمن، هەموو تیر و چڵ
بە تین و بە گوڕ دێن، هەتاکو نەیار
لە شاخی نەهێڵن، لە گوند و لە شار

وەکوو بەبری زەردان، بە هەیبەت دەچن
لە ئۆردویی دوژمن، هەموو، وەر دەبن
برای کالەموبین، لە نێو بارزان
لە تەفسیری فەتحا، نیازن ئەمان
ئەمانەن بلیمەت، بە نەسل و نژاد
هەموو زولفەقارن، لە بۆ عەدل و داد
لەگەڵ زۆڵە کوردی، کە هەن دەس بە شیر
پڵینگن لە شاخا، دەیان کەن نەچیر
بە تیر و کەوان و کەمەند و مەتاڵ
گەلێ دوژمن کورد، دەکەن گێژ و لاڵ
گڕی شۆڕشی کورد، بە هێزی ئەوان
دە «ئاوێر» ببینە، لە ئەرز، ئاسمان

## سێ بازوی قەوی

لەگەڵ بارزانی سێ بازوی قەوی
دەبینرا لە بۆێ تەم و مژ رەوی
یەکێ باز و ئەفسەر، سیاسەتمەدار
لە سەرهەنگ و سەرگورد، گەلێکیش بەکار
یەکی خوێندەواریش، لە زانکۆی جیهان
لەوێڕا دەهاتن، لە بۆ بارزان
ئەوی دیکە پەنجەی، هەڵۆی نێو چیا
لە بۆ راوی ناحەز، دەسوڕا تیا
لە هەر کوێ کە دەیدی کە تێی رۆ دەهات
سەری لێ دەخستن، لە دەجلە و فورات
تەواو ساز و سامان، بەوان چاکرا
کە ئەو چەندە قودرەت لەگەڵ یەک خرا

دەبێ دەس لە نێو دەس هەمو یەک گرین
لە بۆ سەربەخۆیی لە بەرچی سڕین؟
لە مێژویی ماد و ئەوەیش بوو بە هۆ
لە کورەی زەمینا نەبین سەربە خۆ
دە «ئاوێر» لە گەڵ گەل ئەتۆ رێکەوە
لە نێو رۆحی وانا ئەتۆ جێکەوە

# بەرنامەی هەیئەتی ئازادی

هەوەڵین بەرنامە ١٩٤٥/٢/١٢ بەجێ هات

هەوەڵ کاری وانە لە ئەو گەرمەدا
ئە بەمجۆرە نووسرا، لە بەرنامەدا

عەشایر هەموویان، دەبێ یەک گرن
لە ناکۆکی دوری، کەن و رابرن

ئەوەی خاکی کوردە، هەمو خاکی ماد
لە بەعسی بسێنین، لە فیرعەون و عاد

بە ئاشتی و بە سازش، ئەگەر بێنە پێش
ئەبەد ئێمە ناکەین، دڵی وانە ریش

ئەوەی سەربەخۆیی، لە خوێن و سەری
بجۆشێ دەبێ بێ، جەسوور و جەری

لەگەڵ دەوڵەتانا، دەبێ رێکەوین
لە بۆ مافی خۆمان، دەبێ نەسرەوین

بە لێهاتویی خۆن لەگەڵ بێ‌رەزا
لە وان سەر فرێدەین، بە شیری خەزا

بەگۆڤار لە دنیا، دەبێ رێکی خەین
کە دەس یارمەتیمان، وەدەس یەک بدەین

بە سامانی «ئاوێر»، دەبێ خووگرین
هەتاکێوی پولاً، لە بن هەڵدڕین

# روخاندنی خانوی کوردان لە ناوچەی نەوتاوی

لە فەوریە (١٩٧٣) ئەرتەش، بە تۆپ لێی‌دەدا
لە سەنجار و دەورەی، لە خوێن وەریەدا

هەزاران یەزیدی، لەگوندی قەرە
تەواو خەڵکی دێیان، لە خاک کرد قەرە

هــەمویان وەدەرنــان، نــە مـولّک و نـە مـالّ
بــە دەسیان نـەهێشتن، مـەگـەر عـومری تـالّ
لە قـــازانبـــلاٌغیش، ئـــەوان دەرکـــران
عـــەرەب هـــاتە جـــێیان، لەوێ دابـــران
لە بـــۆ دەشــتی عـەقرەیش، ئـەوا، نـۆبە هـات
لە بـــۆ چـــەند گـــوندێ، لە نــاوچەی ولاٌت
لە نـــێو شـــیرکەتی نــەوت تــەواو کــاریگەر
ئـەوەی کـورد بـوو گشـتی، لە کـار کـردە دەر
هــەتا نــەوتی کــەرکوک، تــەواو قـوتی دەن
لە کـــوردی بسـێنن، تــەواو زەوتــی کــەن
لە زامـــار و شـــێخان، لە خـــود خــانەقین
ئـــەوەی کــورد لە وانــە، ژیــان و دەژیــن
لە مــــوسلّ و دەهـــۆک وەدوورۆ خـــران
لە کـــەرکوک و ســـەنجار هـــەموو رادران
بــە مــەئموری دەولّــەت، تـەواو کـۆ کـران
وە کـــوو تـــویکلّی دار، هـــەموو فـڕ دران
لە نـــێو مـــالّی خـــۆیان، لە مــەزرا و بــاغ
وەدەریــان دەنــان گش، بــە زەبــری چـوماغ
ئـــەوەی بـــارزانـــی، نــەبوو بـۆی قــەبولّ
نـــەبوو ئـانێ روحـــی، نــەبێ بـۆی مــەلول
ئـەوە بــوو کـە مـولّک و زەوی و زاری مـاد
لەوەی کـــورد بـــوو سـێنرا نــەما هـیچ قــاد
عـــەرەبیان دەهــێنا، بــە خــۆشی و بـە زۆر
لەســەر خـاکـی کـوردان دەبـوون لاش خـۆر
لە مــوسلّ و لە نــاوچەی ئـەوەی کـورد بـوو
لە دەســـتی بـــەعسدا، زەلیــل بــوو هــەموو
گــەلێ خــاکـــی «ئــاوێر»، درا بـەو عـەڕەب
دەیـان سـەن لە کـوردان، بـە قـەهر و غـەزەب

خـــەیانەت بــە بــارزانـــی لە بــەغدا ســەران
لە بــۆ گــیانی بــارزانـــی بــە نــەخشە گــەران
بـــە مـــین چــەندە مــیزەر سـپی چــەندرا
لەســـــەر چــــەن مــــەلایێ بـــەفێڵ دانــرا
لەبــۆ حــاجی عــومران بــە زاهـیر دەچـوون
لەبــۆ ســولح و ســازش بــەڵام حـوقە بـوون
لەوێ ســـوئی قــەسد بــوو بــە ژنــرال کــرا
کـــــەوا چــــەن مــــەلایێ لەوێ بـــینرا
لەگـــەڵ بـــارزانـــی لەکـــاتی بـــەیان
مـــەلا بـــوون تـــەقینۆ زغـــاڵێکی مــان
بــەڵام دەســتی غــەیبی وەپێش گـوللە هـات
کـــە ژنـــراڵـی دا ئــەو لە مــردن نــەجات
دوهـــەمیان لە شــازدەی ژوئـیە (١٩٧٢) دا
لە وێش لوتـــفی اللـــە بـــە ســەریا گــەڕا

## ڕۆینی تاریخی ژنراڵ بارزانی بۆ روسیە شورەوی

لە مــانگ خــاکــەلێوە، لە بــۆ دەشــتە بـێڵ
لە ڕۆژ بـیست و هــەشتا، دەهــاتن بــە خـێڵ
لە ســـێی خـــاکـــەلێوە، لە نــێو هــەرکیان
گـــڕی دابـــوو ژنــراڵ لە دەوڵــەت دیــان
لە مـــانگی گـــولانا هـــەوەڵ ڕۆژی ئــەو
بەرە و خـواکـورک بـوون، دەڕۆیـن بـە شـەو
هــەوەڵ ڕۆژی ئــەو بــوو، لە نــێو دوکــەلاّ
لە نـــێو ئـــاورا بـــوون شـــەڕارەی بــەلاّ
لە وێڕا دەڕۆیـــــــن، بـــەرەو ئـــارگۆش
بــەرەو شـاخەکـانی، بە نـەخشە و بـە هـۆش

بــــەدەن بـــوو لە پـــولاّ لە ئـــەلماس دڵ
ســـــەری نـــاحەزی وان، دەبـــینرا لە گـــڵ

گـــــــەلێکی دەبـــینم، لە نـــێو بـــارزان
لە گـــودەرز و رۆســـــتەم پـــڵینگی زەمـــان

لە نـــــاوچەی مـــــزوری دەمـــــانەو گـــەلێ
هــەتا مــانگی جــۆزەرد لەوێ بــوون چەلێ

لە ئــاخر بــوو رۆیــن لە ســەر رێــی ئــەوان
بـــــووە مــــەنجەنیقی بــــە بــــۆمباردومان

لە ئـــەو مــانگە دابــوو بــە نــێزەی ئــەوان
چکــەی خــوێن دەباری لە حــەوت ئــاسمان

گــەلێ بــەبر و شــێر و گــەلێ فــیل ئــەچوون
بــە شــمشێری بــارزان هــەمو لەت دەبــوون

بەڵێ مــانگی جــۆزەرد دوهــەم رۆژی مــانگ
لە (ئـــاسن گـــەرا)دا لە نــێو تــۆز و قــانگ

شکـــاری دەکـــردن لە بـــەبر و پــڵنگ
نــەما هــێزی دوژمــن لە مــەیدانــی جــەنگ

مــــرۆڤی بـــارزانـــی بــە لولەی تــفەنگ
گــەلێ دوژمــنی خست هــەموو وەک پڵەنگ

لە چــەک داری نــاحەز تــلاوتل دەکــەوت
گــەلی خــۆ فــرۆشان لە بن بــەرد ئــەخەوت

ســـــەرۆک بـــارزانـــی بــە زاتــەو دەچــوو
لە نـــێو جــەغزی دوژمــن پــڵنگێکی بــوو

بــە ســەر (ئـاسپی رێـزا) لە ســەر تـیشەلاّن
لە نـــــێو گـــوللەباران دەڕۆیـــن ئـــەوان

بــە نــێو بــەردەلاّنا تــفەنگ چــی دەهــات
هــــــەتا ئـــاوری دەن تـــەواوی وڵات

دەهـــات ئـــەو بــە مــەرزا لە ژێ گــریەدا
لە بــۆ شــۆڕەوی چـــوو لە رێگـــریەدا

دەڕۆیــــی بـــە مـــەرزا لە ئـێران زەمـین
لە نـــێو تــاشە بـــەردا دەکــەوتە کــەمین

دەهــاتن لە نـــێو شـــەر بـــە نـێو ئـاورا
هـــــەتا ئـــەو دەقـــیقەی لە ئـــاراز درا

لەوی تـــــێ پەڕیبون لە چـــۆلگەی وڵات
بـــە بـرسی دەهــاتن لە زۆر سـات و کـات

لە بـــــۆ چـــەند ڕۆژێ لە تـــورکیەمان
لە بـــەر ئــاوری شــەڕ نـەما جـێی ژیـان

لە بـــەروەی بـــوو هـاتن لە ئـێران زەمـین
پشـــوو دەن دەمـێکی بـڕۆن چین بە چین

بـــەرەو تـــەرگەوەڕ بـوون لەوێـدا نـەمان
لەوێ رابـــوو ڕۆیـــی نـــەچیری ئـــەوان

لە حەوتی هەر ئەو مانگ(بلەچوک)ئەچوون
لە ئـــەو گـــۆڕەپانەی گـەلێ مـاندووبوون

لە سـیروی نـزیک بـوون بوە نـەعرە بـانگ
گـــڕ و گــولله هــاتن بـە رەگـباری تـانگ

لە نـاوچە و لە شـاخا تـەپ و تـۆزە هـات
لە وێـــــدا بـــە گـــولله دەســـوتا وڵات

بـــە یـــاری خـــودا بـــوو لەوێ بـارزان
شکـــا دوژمـــــنی ئـــەو لە شـاخ و تـەلان

لەوێ ئـــاوری شـــەر کـــەمێ نــیشتەوە
بـە نـێو تـیرە شـاخا، دەچـوون ئەو شـەوە

هەر ئەو مـانگە نـۆ بـوو، لە نـاوچەی شکـاک
بـەرەنگاری ئـەو بـوون زرێـلی بـوو پـاک

لە چـەک داری دوژمـن، تـفەنگی لە شـان
وەکـــوو مـەوجی پـۆڵا، دەهــاتن ئـەوان

لەوێ بـــارزانـــی بـە نـەعرەی دەچـوون
سـەفی دوژمـنانی بـە شـیر شـەق دەبـوون

دەبـــینرا کـــە دوژمـــن شـــەقارەی دەبـــەست
لە ســـــەر زگک دەڕۆیـــن لە تـــرسا بـــە دەست
هـــەر ئـــەو مـانگە دەی بـوو لە نێو بـاڵەکـان
لە نـــێو گـــوندی (دڵـزی) دەبـینران ئـــەوان
بــــــە چـــــنگاڵی پـــــۆلاّ لە نــــاحەزیەدان
ســـەدی لەشکـــرێ بـــوو هەموی تێکشکان
لە سێزدەی هـەر ئـەو مـانگ لەدێ (هـولران)
ســـــەرۆک بـــارزانـــی لە نـــەخشەی گـــەڕان
هـــەتاکـــوو لە دەرفـــەت بـــڕێ جـــار و بـــار
بـــە هـــەڵمەت لە نـــاحەز بـدا مـــەردی کـــار
لە پازدەی هەر ئـەو مـانگ لە دەڕەی قـەتوور
بە سەر بەرزی رەد بوون، لە نێو مـار و مـوور
ئەوا خۆی نزیک کرد، لە (ماکۆ) و (سـوسۆز)
لە (داش‌خشـلی) یـا بـووی، و چـانی بـە سۆز
لە شازدەی هەر ئەو مانگ، بە رەو دێـی(کـلیت)
لە شـــــەڕدا بـــــوو نـــاحەز گـــەلێ بـبوەلیت
لەهەژدەی هـەر ئـەو مـانگ لە کـوێستانی جـوان
دەیــــان دی گـــــولاڵەی گـــــەشی لێ روان
لە بیستی هەر ئەو مانگ، بەرەو جـادە چـوون
لە جـــادەی دە (مـاکـۆ)، شـەوێ رەد دەبـوون
بــــەرەو دێــــی عــەیاری، دەرۆیــن بــەیان
هـــەتا گـەینە دوو دێ کـە چۆل بـوون ئـەوان
گــــــەلێ نــان و پــێ‌خور لەوێ کــەوتە گــیر
بـــەلاّم لەو ســـەعاتەی دەهـــات دەنگـــی تـــیر
لە ئـــەو کـــاتە چـــەک‌دار هـەڵۆی بـەرزە فـڕ
بـــە کـێو دا دەرۆیـــن لە نـێو بـەرد و چـڕ
عـــــەشایر بــــە زاهـــیر لە هـــەر لا دەهـــات
هـــــەتا بـــــارزانـــی بـــــە بـــڕنوو بـــخات

بـــــەڵام بـــاتنی وان لەگـــەڵ بـــارزان
نـە بـوو قـەت زەرەر دەن لە عـێلی ئـەوان
لە ئـــەو جـادە وادێ لە خـۆی بـۆ شـمال
دەهـــاتن فـــڕۆکـەی حکـومەت بـۆ زاڵ
لە ئـەو جـادە مـاشێن وەکـوو خیز ئـەهات
لە ســـــەربازی پـــڕبوون تـــەواوی وڵات
دەهـــاتن بـــە ســەربازکـە دەوری گـرن
بـــە چـین چـینی وانـەکـە بـەوری گـرن
لە هـــەرلا ئـەجەل بـوو لە لولەی تـفەنگ
لە لولەی مـــوسەلسەل دەهـــاتن بـە دەنگ
لە هـەرلا وە دەت دی کـە ئـەرتەش دەهات
بـە خـۆمپارە و تـۆپ لە هـەر ئان و سات
لە ئـــەو کـاتە ژەنـراڵ بـە هـاوڕێ کـەیان
وەکـــوو شـێر لە شـــەڕدا بـدەن خـۆ نـیشان
ئـــــــەمە چـــارەنووسە لە بـــۆ بـــارزان
لە بـــۆ مـیللەتی کـورد نـیە جـێی گـومان
شـــەڕی ئـــێمە کـوردان لە ئـێران زەمـین
لەگـــەڵ دەوڵـەتایە لەگـەڵ شـا بـەکـین
لەوێـدا بـوو دابـەش دەبـوون گش ئـەوان
هـەموو شـێری مـەست و هـەموو قـارەمان
ســـەعید عـــومەرە وا بـــە رۆح و گـــیان
دەڕۆیـــی لە پشت سـەر سـەرۆک بـارزان
بـە (مـەل‌میر) ئـەکـوترا کـە رۆستەم ئـەتۆی
لەکـاتێ لە بـۆ شـەڕ ئـەگـەر بـێی بڕۆی
لەوێ دەس بـــە شـەڕ بـوون لەوێ راپـەڕان
هـــەمو گـــیو و گـــودەرز لەوێ بـــینران
لە هـــەر لاوە گـــوللە، بـروسکەی دەهـات
پـــریشکەی دەکـــەوتن دەســـووتا وڵات

لە زەردە پـــەڕابـــوو، کــە شــەڕبوو تــەواو
بـــەڵام مـــابوو دژوار پـــەڕینۆ لە ئـــاو

لە ســەر چــۆمی مـاکـۆ، یەکـەم پـرد لەوێ
لە دەس دوژمـــنا بـــوو بـە ڕۆژ و شـەوێ

لە مـــاکـــۆوە وشـتر، قـەتارەی دەهـات
هـــەتا رزق و رۆزی، بـــە لەشکـر بگـات

بـــەڵام (مسـتو مـیروز) بـە لولەی تـفەنگ
گـــەلێ وشـتری خست لە جـادە و پـلەنگ

مـوسەلسەل بـە (مـامەند) نـەبوو بۆی هـەدا
گـــــەلێ کـــامیۆنی، بـــە زەویـــا دەدا

ئـەوە پـێشی گـرتن، بـە کـامیۆن و تـانگ
کـە کـامیۆن دەسـوتا، لە نێو تـۆز و قـانگ

بـــە هـــێرش دەڕۆیـــن، لە کـــامیۆن درا
شکســـتێکی گـــەورە، لە ئـــەرتەش خـــرا

لە ئـــاکـــامی کـارا، پـردی خستە گـیر
لە ئـەو پـردە ڕەد بـوو، بـە شـمشێر و تـیر

مـــەلا مسـتەفا مـا، گـەلێ چـەک لە دەور
بە تـانگ دەوری پڕ بوو، کـە گـیرا بـە فـەور

لە گـــەڵیان مـــرۆڤی زرنگ بـــوو تـەواو
بـــوارێ بـــەڵد بـــوو پـــەڕینۆ لە ئـاو

لە ســەربازی دەوڵــەت، لە ئـەرتەش بـە سـان
ســەراسـیمە مـابوون، کـە چ بکـەن ئـەمان

دەبـــاری لە وێـــدا، ســەری بـەبر و شـێر
نــە تـوس مـا نـە سوهراب، نـە پیاوی دلێر

لە کـــۆسپ و لە گـێژیی، نــە بـوو دەنگـیان
کـــە بگـــرن تـفەنگ و بکـەن جـەنگیان

بـە سـەرپردی (شـوط) و لە نـێو چـۆم و ئـاو
لە ڕۆژ بـــیست و ســـێ‌دا، پـەڕینۆ تــەواو

سـلێمان و ئـەسعەد، دوو شـێری قـەوی
لە ژەنـراڵـێ ون بـوون، لە نـێو ئـەو زەوی
لەوێ را بـەرەو شـاخ، بەرەو گـرد ئـەچوون
لەویـدا بـوو، ون بـوو، کـە پـەیدا دەبوون
لەوێـدا سـەرۆک بـوو، گـەلێ شـادمان
لە وەی دیـتی ئـەسعەد، سـلێمانی مـان
لە چـۆمی پـەڕێنۆ بـەڵام چـوار نـەفەر
لە چـەک داری مسـتۆ نـە بـوو هـیچ ئـەسەر
بـە دەسـتور ژەنـراڵ، لە (سـوهان) ئـەمان
هـەتاکـوو لە وانـە، بـزانـن نـیشان
لە ئـەو رۆژی دوایـی، کـە هـاتن ئـەوان
لە گـوم بـوونی خـۆیان، دەیـان کـرد بـەیان
لە بـیست و چـواری ئـە ئـەو مـانگە روون
بـەرەو چـۆم ئـەراز بـوو هـەمویان دەچـوون
لە پـەنجا و دوو رۆژ، شـەڕی بـێ وچـان
نـەبوو قـەت بـناڵێ، لە دەس ئـاسمان
دەبـینرا کـە شـەش سـەد نـەفەر قـارەمان
هـەموو گـەینە ئـاراز، لە چـۆمیان دەدان
لە ئـەو بـەر بـوو پـاسگا، بریقەی دەهـات
لە بـۆ وان بـوو روبـار بـە ئـاوی حـەیات
لە نۆسەد چل و حـەوت لە حـەفدەی جـولای
لە ئـارازی رەد بـوون بـە یـاری خـولای
لە رۆژی دوهـەم دا سـەرۆک بـارزان
لە گـەڵ چـەن مـرۆڤی پـەڕینۆ ئـەمان
هەموو شێری مەس بوون هەموو یەک بە یەک
لەوێدا دەبـینران هـەموو دەس بـە چـەک
گـەیین بـەو بـەهەشتەی هـیوای مـانی وان
لکـابوو بـەوێوە، نـەبوو جـێی گـومان

رەتاو و شەکەت بوون دەیان ویست لەوێ
پشوو دەن وچانێ لەوێ بن هەوێ
بەلام لەو بەهەشتە وەکوو یەک نەبوون
نە ئازادیی بوو نە داد و نە چوون
لە بۆ نەخجەوان بوو کە ژەنرالْ بران
لە نێو ئوردوگادا ئەوی دی دەمان
نەیان بوو ئیجازە بڕۆن یەک زەمان
ئەبەو جۆرە «ئاوێر» لەوێدا ژیان
لە رۆژ دوازدەدا بۆ سەرۆک بارزان
دەچوو تا ببینی چلۆنن ئەوان
لە لێ پرسراوی دەویست تا ئەوان
ببن بۆ پەناگر بە دلْ سۆزیان
هەتاکوو بە چل رۆژ ئە ئاوا ژیان
لە پاشان هەمۆیان لە لاچین خران
لە جمهوری سوڤیەت لە نێو ئەرمەنی
دەڕۆین لە لاچین دەمێ بوون غەنی
لە بۆ شاری شوش بوو کە ژنرالْ برا
لەگەل چەندە هاوڕێ کە بوون وەک برا
مەلا مستەفا بوو لە ئەم سات و کات
دەچوو تا لە ماکۆ کە دیداریٚ کات
لەگەلْ سەرکۆمارا کە بوو ئەو ئەمیر
بە نێو (باقروف) بوو بە هۆش و بە بیر
بە شانازی ژنرالْ گەلێ بانگ کران
لە بۆ کاخی حاکم لەوێ سەف دران
بە سەر بەرزی میوان حەماس ئافەرین
کە رێبازی وابڕ زەوی قەت نەدین
ئەمیر (باقرۆف) بوو کە پیالەی شەراب
بە ئەو هۆیە نۆشی، بە ئاب و بە تاب

بـــەلاّم بـــارزانـــی مـــەیی ئـەرخـــەوان
لە لێـــوی نـــەدان و لە ســـــەرمیزی مـــان

لەویّ دەم دوان و وتـــــــی ئــــەی ئــــەمیر
ئـــەمن مـــەستی شـــادیم مـرۆڤی مـەرد و ژیـر

ئـــەگـــەر چـــاوە دێـــری بکـــەی تـــۆ لەوان
ئــــەوانـــەی لەگـــەڵ مـــەن، لە جـــەنگاوەران

نـــەبن وان لە ســـەغڵەت لەگـــوند و لە شـــار
بـــەوی مـــن دەنـــازم دەبـــم پـێی خـــومار

بـــەوەی مـــــن دەنــــازم کـــەلاس دانـــریّ
لە عـــیلم و لە ســـــەنعەت بـــە وان یـــاد دریّ

لە دەریـــــــا و هـــــەوادا لە بـــۆ مـــانمان
هـــەڵۆ بن نـەهەنگ بـن لە حـەوشەی جیهان

لە تکـــنیکی شـــــەڕدا بـــبن ئـــاگـــەدار
وەکـــوو ئــــەژدها بـــن لە بـــۆ کـــارزار

کـــەلاسێکی وابـــیّ لە هـــەر شـــوێنەوە
لەگـــەل فـــەننی ئـەورۆ و هـــونەر بـێنەوە

فـــنونی شـــــەڕم مــــن لە بـــۆیێ دەویّ
هــەتاکـــو حـــقوقم بـــە شـــەڕ دەس کـــەویّ

حـــەقیقەت ئـەوایـە بـە هـەر رەمزی جـەنگ
نـــیازن بـــە فـــێر بـــوون، هـــەیە بـــیّدرنگ

ئـــەوی شـــەڕ نـــەکـــاتن، لە بـــۆ مـافی خۆی
مـــــرۆڤی گـــــەنیوە گـــــەلێکیش لە بـــــۆی

بـە رۆح و بـە دڵ مـن، وەرەز هـەم لە جـەنگ
بـــەلاّم حـــەق خـــوراوم کـــەوا دێـــمە دەنگ

لە ئـــامانجی مـــــن دا دەبـــیّ ریّ خـــریّ
لە بـــۆ کـــورد حـــقوقی، بـــەشەر جـــیّ گـــریّ

ئـــــەمن ئـــــارەزومە، کـــــرێکار و بـــــار
بـــە زانست و هـــۆشی مـــرۆڤی ئـــاگـــەدار

تـــەواو شـــی کـــرێتۆ، هـــەلاجی کـری
هـــەتا ئـــاوری شـــەڕ، تـــەواو دامـــرێ

بـــە هـــۆی فکـــری ژنـــراڵ لەوێ کـــونفرانس
بـــە بـــاشی دوروس بـــوو لە وێدا بـــوو شـــانس

لەوێ مـــیللەتی کـــورد، لە هـــەرکـــوێی جیهان
ئـــەوانـــەی لەوێ بـــوون لەوێ بـــینران

بـــە هـــۆی پـــایەبەرزی، لە بـــۆ حـــازران
لە بـــاکـــۆ بـــە کـــوردی وتـــاری گـــەیان

لە وێـــدا بـــوو ئـــەحسەن بـــە رۆح و گـــیان
لە بـــۆ بـــارزانـــی، دەکـــوترا عـــەیان

لە ئـــەوکـــۆڕەدا بـــوو ســـەرۆک بـــارزان
بـــەلێ پـــرسراوی لەوێ نـــاسران

بـــە دەســـتوری ئـــەو بـــوو، هـــەلێ رێ خـــرا
بـــە کـــوردی گـــۆڤارێ لە چـــاپی درا

لە ئـــیسگاو (مـــەنەرگە) لە بـــاکـــۆ وەهـــات
سەدا و دەنگی کوردی، لە چەن کـات و سـات

کـــەلاس دانـــرا بـــوو هـــەتاکـــورد زمـــان
لە دانـــیشکدەی جـــەنگ، بـــخوێنن ئـــەوان

مـــرۆڤی کـــورد لە عـــیلم و لە ســـەنعەت گـــەلێ
دەیـــان خـــوێند، بـــە باشی ئـــەوە بـــوو هـــەلێ

لەوێـــدا بـــوو ژنـــراڵ بـــە عـــەقل و بـــە بـــیر
گـــەلێ کـــاری کـــردن، بـــە هـــێزتر لە شـــیر

بـــەلام (بـــاقرۆف) بـــوو، لەگـــەڵ کـــورد نـــەیار
لە نـــێو چـــاوی ئـــەودا، هـــەموو بـــوو دیـــار

بـــە دەســـتوری ئـــەو بـــوو کـــە کوردی ولات
لە یـــەخچالی ئـــەودا، دەبـــوون وشک و مـــات

ئـــەوەیش هـــۆیێتر بـــوو کـــە دورۆ خـــران
لە ئـــاسیای مـــیانە، بـــە کـــەشتی بـــران

بــــەڵێ هـــۆی دیکـــە، گــەلێ ریشــەدار
لە پـــەرتووکی (ئـــاسۆ) دەبـــینی دیـــار
بــەلاّم ئــاه و ســەد ئاه لەوێش کورد زمـان
بـــە زەهـــری زمـــانی لە ژەنــراڵــی دان
ئـــەوە بـوو بــە هــۆی وەی بـلاّوۆکــران
لە دەریـــای ســـۆڤیەت، وە دووروۆ خـــران
بـــلاّویان دەکـــردن، لە شـــار و دیـــار
دەبـــوو کـــاسبی کـــەن، لە بـۆ نــانی زار
لە نـــێو چــەن جــزیرە و لە دێــهات و شـار
نــە بـوو یــەک ببینن، لەوێ جـار و بـار
لە دەریـــــــاچەیێکا لە (ئـــوراڵ) ئـــەمان
لە نـــێو شـــاری (چـمبای)، لەوێــدا ژیـان
لە دوی ژزف (یـوسف) کـە مـرد ئـەو زەمـان
لە بـــۆ لای کـــرملین گـــەڕانـــەو ئـەوان
لەکـــاتێکی چـــەرخـــی فـەلەک لێـیەدا
(خـــرۆشچۆف) بـوو حـاکـم لە ئـەو جێیەدا
هـــەلێ بـــو لە وێـــدا لە بـــۆ ژنـــراڵ
کـە نـوسی لە بـوو ئـەو، گەلێ عـەرز و حـاڵ
لە بـەر چـی لە دنـیا لە چـەن مـەملەکەت
لە بـۆ ئـیرە هــاتم، لە چـەن شـوێن و خـەت
دەبـێ دەوڵــەتی تـۆ لە هــەرکوێی جیهان
بســـێنێ حـــەقی کـورد، لە زۆر مـــڵهوڕان
ئـەوەی زوڵـمی لێچـوو، گەلی کـورد زمـان
لە نـێو تـولی تـاریخ، هــەمووی کـرد بەیان
بــە دووی نــامەکــانا، (خـرۆشچۆف) لە وان
پـەزیرایـی کـردن، لە یـەک کـات و ئـان
(خـــرۆشچۆف) بـەڕێزەو کـە دیـداری کـرد
لە گـــــەڵ ژنـــرالاّ بـــە فکـــرێکی ورد

لە بارزانی پرسی، مەبەستی هەموو
هەتا وان بناسێ بە گوفتاری زوو

لە جوابی (خرۆشچۆف)، سەرۆک بارزان
بە کورتی و رەوانی، ئەمەی کرد بەیان

لە ژێر گوللە باران بە نێو ئاورێ
لە بوێیکە هاتووین، کە دەستن گرێ

هەتا میللەتی کورد، وەکوو دەوڵەتێ
لە نێو خاکی خۆیان، ببن قودرەتێ

نژاد ئاریایە، گەلی کورد زمان
نژادی بە ناون، لە حەوشەی جیهان

لە نێو ئاریادا گەلی کوردە ماد
بەڵام تەخت و تاجن، هەمووی چوو بە باد

گەلێ روستەمی زاڵ لە نێو خاکمان
دەبینرا لە دوژمن نەبوو باکمان

کەریم خانی زەند و، سەلاحی شەهیر
لە ئەییوبیانا، هەبوون کەم نەزیر

بەڵام میللەتی کورد، لە ئەم کات و ئان
زولم لێ کراون، لە نێو نیشتمان

لە بەر وەی لە جەنگی جیهانی بەرێ
لەت و پەت بوو خاکی، نەما بوون دەرێ

لە پەیمانی لۆزان، زەوی کورد برا
لە نێو چەن حکومەت، هەمووی بەش کرا

لە بۆ کورد کە خاوەن زەمینن هەموو
نەیاندا بە خۆیان، بە قەد تاڵە موو

لە بەر وەی بسێنم، حەقی کورد لەوان
لە شەڕبووم بە دایم لەگەڵ دەوڵەتان

لەگەڵ ئاریامێهر، لەگەڵ تورک و تات
وە هەر دەوڵەتێکی کە یاری دەدات

بــە بــاج نــەوتی کــەرکوک، بە ئینگلیز درا
لە بــۆیی فــرۆکــەی بە پــۆل ڕیــز درا
وەکــوو هــەور ئــەبینرا، فــڕۆکــەی بەواد
لە بــارینی بــۆمبا، لە ســەر خــاکــی مــاد
بــە تــانگ و بــە تــۆپ، موسەلسەل زەمان
وەکوو مەوجی دەریـا، تفەنگ چـی ئەوان
دەهــاتن لە هــەر لا، کــە گــڕ دەن ولآت
نــەمێنێ گــەلی کــورد، لە بــۆ ڕێــی خەبات
لە گــەڵ گش ئــەوانــە، بــە تــەنیا تــفەنگ
لە شەڕ بووم لە شەڕدام، لە عەرز و لە پەنگ
بــە روونــی دەبــینرێ، بــە تــەنیا تــفەنگ
لە گەڵ چەندە دەوڵەت، گەلێ سەختە جەنگ
بــە ســۆڤیەت گــەلێکە، هــیوا و ویستمان
لە کــورەی زەمــین دا، لە بــۆ نــیشتمان
لە بــۆیێکە هــاتووین، کــە کــورد ئــاریان
بــە بــازوویی هــیممەت بــدەی یــاریان
لەوێــدا بــوو ژنــراڵ فــەسیح و رەوان
ئــەوەی مــافی کــوردە هــەمووی کــرد بەیان
لە ئەو کاتە (خــرۆشچۆف) وتــی قــەول ئەدەم
لە بــۆ مــافی ئــێوە، گــەلێ حــەول ئــەدەم
دەزانــی ئــەی «ئــاویر» تــەواو بــوونی وان
لە بــۆ ســەربەخۆیی گــەلی کــورد ژیــان

**ژنراڵ بارزانی ١٩٠٣ میلادی و (١٢٨٠ هـش) هاتە دنـیاوە و لە مانگی رەشەمە ١٣٥٧ هەتاوی و مارس ١٩٧٩) رۆحی بـەرەو عەرشی خودا رۆیی و ئەم شێعرانەم رۆژی کفن و دفنی ویستم بیخوێنمەوە بەڵام بە هۆی زۆری خەڵک و شلووقی داخەکەم**

## جۆر نەبوو

شـــنۆ شــاری عــەزیزانــم چــیە ســێڵاوی مــیوانت؟
چــیە نـاڵەی مـەلایک دێ لە ئـاسمان و دەر و بـانت؟

چیە ئەورۆکـە هـەرکـوردێ لە هـەر جـێیەکی دنـیادا
هەموو یەک جێ هوروژمی دا وەکو مەوجێ لە دەریادا؟

چیە ئەورۆکە قەومی کورد لە ژێر هەورێکی زۆر تـاڵا؟
چیە شـاخ و دەر و دەشـتن کـە تـاری رەش لەوێ ئـاڵا؟

شنۆ سێڵاوی مـاشێن دێ هـەموو رەش پۆشە بـەو ئـاڵا
بـە نـێو دەشت و تـەلی تـەمدا ئـە ئـەم رۆژانـە لەم سـاڵا

شنۆ خاکت جەواهـیرە هـەموو ئـەڵماس و دوڕ و زێـڕە
ســـەرۆکـــی قـارەمانی کـورد کـە هـاتوە ئـاخری ئـێرە

شنۆ ئەورۆکـە سـەربەرزی وەکـوو جـودی لە قـوڕئانا
کە مـیوانـە سـەرۆکـی کـورد لە خـاکـی تـۆ لە ئـێرانـا

بەخێر بـێ قـارەمانی کـورد بـە خـێرێی رۆحـی ئـینسانی
هەموو قەوم و گەلی کوردی بە قـوربانت سـەر و گـیانی

کوانـێ کـامە مـێژوویە یـەکـێ وەک تـۆ لە نـێو پـۆیدا
کە شێست ساڵی چڕوسا بێ لە رێی مـافی گـەلی خـۆیدا

بە نەخشە و شێرە رەزمەندەی لە شاخ و داخـی ئـاراڕات
لە هەڵدێر و لە ئەشکەوتا نەبووی لەو رێگەدا قەت مـات

ئەوە قـەندیلە دەنگـی دێ دەڵـێ نـەم دی ئـەبەد کـاکـە
رەشـــید و قـــارەمانێکی وەکـــوو بـارزانـی لەم خـاکـە

لە نێو کێو و چیاکانی ئەوێستادا شەکا ئالاّ
بە بازوی کاویانی تۆ بە پیرۆزی لە شەست سالاّ

لە مێژوودا لە وەختێدا خەباتت دوژمنی رادان
کە شای ئەهریمەنی ئێران نە تاجی ما نە تاجی مان

ئەوا «ئاویر» دەنالێنێ بە سۆزی دڵ بریندارى
لە بۆ پەروازی رۆحی تو بەرەو گوڵزاری یەک جاری

لە مەرزی خاکی کوردستان پەری لەو دەورە راوەستان
هەتاکوو بێن لە گەڵ رۆحت رەوانەی کەن لە بۆ رزوان

سپاسی گەل لە بۆ تۆیە کە میللەت تۆ تەکانت‌دا
بە شۆڕش رەمزی ئازادی بە دنیا تۆ نیشانت دا

لە بارزانۆیە دەنگێ دێ دەڵێ ئەی خاکی کوردستان
ئەوا شاباڵی پێش مەرگم بریقەی دێ لە خوزستان

ئەوە بارزانە دەنگی دێ دەڵێ دنیا بزانن داد
ئەمە کوردین ئەمە مەردین نژادی ئاریا و ماد

# بنەماڵەی قازی مەحەممەد

# دامەزرانی حکومەتی خودمختاری کوردستان لە مەهاباد

لە لایان پیشەوای بەرێز قاضی محمّد دوهەمی رێبەندانی ١٣٢٤ هـ‌ش.

کـە جـەنگی جـیهانی دوهـەم هـەڵکرا
بـە دوایـدا بـوو فـاشیست لە ئـاور خـرا
ئـە ئـەو مـلهوڕانـەی دەیـان ویست گـەلان
لە ژێر دەستی خـۆ خـەن ئـەسیر بـن بـەلان
تەواو تێک شکـان و لە یـەک بـوون بـڵاو
بـە هـۆی وەی رچـەم دی کـراوۆ تـەواو
هــەتا زۆر گــەلانی جــهان پـیا بـڕۆن
بـبینن کـە خـۆیان تـەواو سـەربەخۆن
لە ئـەو کـاتەدا بـوو کـە کـوردی وڵات
لە زوڵـمی رەزاشـا دەبـوون گشـتی مـات
جـل و بـەرگی کـوردی کـە قـاچاخ کـرا
بــە ئــەمنیە گشــتی شــڕی لێ بـرا
هەموو خەڵکی دێهات کە مەئموور ئەهات
بـە نـێزەی دەیـان وت کـە رشـوەی بـدات
لە ئـەو فکـرە دابـوون کـە وا کـورد زمـان
هـەمووی خـاشە بـڕکەن نـەیێڵن ئـەوان
لە بۆ کوردی ئەوڕۆ کە زەحـحاکـی بـوون
کە وەیسی بوو مـەئمور مـەهاباد ئـەچوون
بـە خـومپارە و تـۆپ بـە لولەی تـفەنگ
ئـەسیری درابـوو بـە کـوردی نـەهەنگ
کــەدی پــێشەوایــی بـەڕێزن وڵات
لە دەس پـەهلەوی بـوو گـەلی زاڵـە هـات
لە ئـەو کـاتە دیـتی کـە چـەرخـی زەمـان
هــەلێکە لە بـۆ کـورد نـیە جـێیگومان
بـە هـۆش و زەکـاوەت هـەبوو ئـاگـەدار
لە مـەغزی خـەڵکدا چـیە و ئـەهلی شـار

بــــە بـــاشی بــوو زانــا مـــەهابادی هـــەن
وەکوو شێری جـەنگەڵ بـە رۆح و بـە تـەن
وەکـوو بـەبری شـاخان بـە هـەڵمەت دەڕۆن
بــە پــەنجە لە نــاحەز دەدەن مــۆر و مــۆن
لە هـــەر قـــوژبنێکی مـــەهابادە سـام[1]
دڵـــی وانـــە ئـــەڵماس، رواڵـــەت بـــە سـام
فـــەرەیدون و کـــاوە و رەهـــامن ئـــەوان
فـــەریبورز و تـــوسن نـــیە جـێی گـومان
لە نــێو وانــە رۆســتەم لەگــەڵ گــیوی دان
لە وێــــدایـــە گـــودەرز کـــوڕی نـــیشتمان
لە ئـەوکـاتە دابــوو کـە کـورد راپـەڕین
لە بـــۆ ســـەربەخۆیی بـــە ئـــازادی ژیـــن
گـــەلێ بـوو هـومێد و گـەلێ بـوو هـیوا
بـــە قـــازی مـــحمّد لە بـــۆ پـــێشەوا
دیـاکـۆیێ دی بــوو کـە کـورد دانـەجات
بـــە مـــەردی دەبـینرا لە رێگـــەی خـــەبات
بـە شـەوقی دەخست زوو گـەلی نـەوجەوان
لە بـــۆ ســـەربەخۆیی بـــە نـوتق و بـــەیان
لە جـــــەنگ ئـــاوەران و کـــوڕی قـــارەمان
رەشـــید و دلێـــر و هـــەموو پـــاڵەوان
لە شـــاری مـــەهاباد لە بـــۆ نـــیشتمان
دەبـــینرا هـــەموویان کـــەوا جـــان فـــیدان
لە رۆژی دوازدە لەکـــــانون یـــەکـــا
لە نۆسەد و چل و پێنج هەزاریتەکا(۱۹۴۵)
هەموو کـوردی نـاوچە وەخـر بـوون ئـەوان
لە ئـەو سـاتە قـازی ئـەمەی کـرد بـەیان

---

۱ ـ سام نێوە بۆ بابی زاڵ و باپیری رۆستەم و فردەوسی لە بارەی رەشیدی و نەترسی ئەودا دەڵێ:

سپەکش چو قارن مبارز چو سام — سـپە تـیغها بـر کشـد از نـیام

و سعدی دەڵی:

عنان باز پیچان نفس از حرام — به مردی ز رستم گذشتند و سام

لە ئـــەم کــاتە بـەولا گــەلی کــورد هــەمان
هـــــەموو ســــەربەخۆن و لە تــاران جــودان
لە شــازدەی هــەر ئـەو مـانگ لە سـالّا دیـان
کـــــە کـــوردان بـــە خـــۆشی ژیـــان
لە ئـــەو کـــاتەدا بــوو لە هــەرجــێی ولّات
لە هــەر قــوژبنێکی بـە پــۆل خــەڵکە هـات
کـــە بـــەیداخـــی کــوردی ببینن جـوان
لە ســـەر چــاوی دانــێن بـە رۆح و گــیان
هــەر ئـەو مـانگ و سـاڵە، لەبیست و شـەشا
گـــوڵی جـــەژنی مـــیللی لەوێـــدا گــەشا
لە بــــــەر پــــــرسیار و، خـــەبەر وادرا
کــە ئـەورۆکــە جـەژنە لە بـۆن ئـەی برا
کـــــە قـــازی مـــحمّد لە ئـــەم رۆژەدا
لە جمهوری(کوردستان) ئێمە خەبەر زوو دەدا
کە جمهوری(کوردستان)ئێمەی بە دنیا گـەیان
لە نــێو بـاسی خـۆیدا بـە گــوفتەی رەوان
بـــە دویـــدا بـــوو ژنــراڵ قــازی بـزان
لە نــێو بـاسی خـۆیدا ئـەمەی کـرد بـەیان
بـــزانـــن کـــە قـــاضی مـــحمّد ئــەوا
لە بـــۆ مـــیللەتی کـــورد بـــووە پــێشەوا
لە ئـــەو کـــاتەدا بـوو سـەراسـەر لە شـار
وەکــوو گــوڵ گـەشاوە مـرۆڤی ئــاگـەدار
لە دەس کـــیژی کــورد و بــە شـادی بـران
گــوڵی گـەش بە خـەڵکی بـە پـێشکەش دران
لە نـــێو چـــەپڵەڕێزان دەســەی نـەوجەوان
ســـرود (ئـــەی‌رەقیب)بــوو دەبـیسرا لەوان
مـــەلا و شـــێخ و زانـــا گـــەلێ پـایەبەرز
مـەلایک سـفەت بـوون دەهـاتن لە ئـەرز
لە هـــەر ســـنف و ئـــەسناف لەوێ بـینرا
لە ئـەو جـەژنە دابـوون هـەموو وەک بـرا

تەواوی موکریان بە سەف رادەبرد
فداکاری خۆمان هەموو عەرزە کرد
هەموو شێرە مەرد و هەموو پاڵەوان
لە بۆ جەژنی میللی دەهاتن ئەوان
گەلێ وەک ئەرەستو بە باس و بەیان
ئەوەی مافی کوردە دەیان کرد عەیان
لەوێ کوردی دانا دەیاندا بەڵێن
هەتا رۆحی خۆیان لە پێناوی نێن
لە هەر لاوە چین عەشایر دەهات
لە گەڵ پێشەوادا کە بەیعەت بکات
قوتابی دەهاتن وەکوو مەوجی ئاو
«شەقامی وەفایی» دەگرتن تەواو
بە شادی و بە خۆشی لەوێدا دەمان
فیداکاری خۆیان هەتا دەن نیشان
بە رێز پێشەوا بوو بە باس و قسان
بە جۆشی دەهێنا دڵ و روحی وان
فرشتە دەهاتن لە هەرکەهکەشان
هەتاکوو ببیسن قسەی پێشەوان
مەراسم بە باشی بەرێوە برا
کە جەژنی موجەلەل لەوێ رێخرا
بە پیویستی رەسمی بە قودرەت بە هێز
دەبوو دابمەزرێ حکومەت بەرێز
لەوێ پێشەوا بوو بە نیروی زمان
کە هەیئەت رەئیسەی شناسان ئەوان
دیاری دەکردن یەکایەک هەمان
وەزیران زانا هەموکاردان[1]

---

١ - حەزرەتی سەرۆکی کۆماری کوردستان (قازی محەممەد)ی پێشەوا بەم جۆرەی خوارێ کابینەی کوردستانی راگەیاند:

⇐

## دەس کەوتنی چەک

رەزا شا چەکی کرد عەشایر هەموو
لە هەر ناوچەیێکی لە ئێران هەبوو

بەلام ئەو زەمانەی کەوا روس ئەهات
بە نیروی ئەوانە دەگیرا ولات

لە بۆ کورد هەلێ بوو کە چەک هەلگرێ
وەک ئەسکەندری بێ ولات داگرێ

گەلێ پاسگایان تەواو چەک دەکرد
هەزاران تفەنگ یان لە بۆ خۆ دەبرد

گەلێکیش لە سەرباز تفەنگیان رفان
بە پۆلێکی زۆر کەم دەیان دا ئەوان

گەلی کورد لە ئێران لە بۆ مافی خۆی
لە ویجدانی ویستی کە کۆمەک بێ بۆی

گەلی کورد خەباتی سیاسی دەکرد
نە دوژمن بە شمشێر بکا ورد و پرد

---

* ١- سەرۆک وەزیر حاجی بابەشێخی جەمیان
٢- وەزیری جەنگ محەممەد حوسەینی سەیفی قازی
٣- وەزیری پۆست و تەلگراف کەریم ئەحمەدی
٤- وەزیری فەرهەنگ مەناف کەریمی
٥- وەزیری کیشوەر محەممەد ئەمینی موعینی
٦- وەزیری راوێژکار - مشاور حاجی رەحمانی ئیلخانیزادە
٧- وەزیری رێگەوبان ئیمساعیل ئیلخانیزادە
٨- وەزیری ئابووری ئەحمەدی ئیلاهی
٩- وەزیری بازرگانی حاجی مستەفای داودی
١٠- وەزیری کشت و کاڵ مەحموودی وەلیزادە
١١- وەزیری کار و فەرمان خەلیل خوسرەوی
١٢- وەزیری تەبلیغات سدیق حەیدری
١٣- وەزیری بێهداری سەید محەممەد ئەیوبیان
١٤- رەئیسی عەدلیە مەلا حوسێن مەجدی

# خوێندن لە کوردستان لە زەمانی پەهلەوی‌دا

بەشی زۆری خەڵکی لە ئەوکات و سات
نـەبوو خـوێندەواری بەکـەڵکی وڵات

ئەوەیش نـەخشەیێ بـوو کـەوا پـەهلەوی
بە ئەو نەخشە ویستی نـەبێ کـورد قـەوی

بە ئەو نەخشە ویستی گـەلی کـوردی مـاد
لە بـــەر بـێ‌سەوادی لە بـیر کـا نـژاد

نـــەبێ بـــۆی بـــەشێکیش لە ئـابوریا
لەبـــرسا هـــەڵێن گش بـە بـێ هـوریا

هـەڵین گش لە جـێ خـۆ بـڵاوۆ بـبن
وەکوو تۆویی هـەرزن هـەموو گـوم ببن

لە نێو خاکـی خـۆیان کـە دڵـخوش نـەبن
هــەمو هـەڵ دەکـەنرێن لەریشـە و لەبـن

فەقیری دەیـان بـا لە هـەرجـێ و مـەکـان
لە بـــۆ زۆر وڵاتـــێ لە بـــێگانەکـــان

لەوێـــدا بـــمێنن زەمـــان و سـەرێ
هــەتا خـاکـی خـۆیان لە بیریان بـەرێ

بـــیانبا بـــە کـەشتی لە دەریـا کـرێن
هـــەتا لاشـەیی وان بـە مـاسی درێـن

لەچـــەن قـــاڕەدا کـورد بـڵاوۆ بـبن
نـەبن کـۆمەکی یـەک ببێ شـوێنی ون

لە چـەندین سـەدەیدا لەبـیری دەکـەن
لەکوێ بوون کەکێ هەن لە دەریایی مەن

لە تـاوانـدنی کـورد تـەواو ئـاو بـوون
لە نێو قەومی ئێران لەوی بـۆی دەچـوون

بە ئەو نەخشە ویستی کـەوا کـورد زمـان
نـــژادی نـــەمێنێ و نـــەبینرێن ئـەوان

بەڵام نەخشەیی ئەو بە حەق بوو بڵاو
بڵاو بوون لە دنیا بۆ خۆی داتوڵاو
بە یاری خودا بوو کەوا پێشەوا
دژی ئەو خەریتە بە باشی دوا
کەوا مەدرەسەی زۆر لە هەرجێی وڵات
دەبێ سازی کەن زوو بە هۆی زۆر خەبات
لەوانە بە کوردی قوتابی هەموو
بخوێنن بزانن هەمووی موو بە موو
لە ئیش و لە کارا دەبێ بەرکەون
لە ئابوریا تا تەواو سەرکەون
نەتیجە لە کار و لە خوێندن گرن
لەوێوە دەبینن کە دوژمن شڕن
دەزانی ئەی «ئاوێر» تەواوی نەزان
لە بەدبەختیایە هەموو عومری وان

# چەند رستە لە قسەکانی وەزیری هێز

رۆژی هەینی ٢٠ی ٤ی ١٣٢٥ پێشمەرگەکانی هێزی ناوەندی کوردستان بۆ عەمەلیاتی سەحرایی چووبوونە دەرەوەی شاری مەهاباد لە گەڕانەوەیاندا وەزیری هێز قسەی بۆ کردن ئەمە چەند رستە کە نووسیومە:

بزانن برایان ئەمەین سەربەخۆ
دەبێ گش بزانین هەمو خۆبەخۆ
فیداکاری هەریەک لە کوردی وڵات
بە واجب دەزانم لە رێگەی خەبات
فدایی کوڕی کورد چل و پێنج هەزار
لەدەس ئێمە دایە لەبۆ کارزار
کەسێکی خەیانەت بە کورد کا بڕێ
بە شمشێری تولە دەبێ سەر بڕێ

## تێبینی

لە لای پــێشەواوە کــە بــایخ درا
بە خوێندن بـە کـوردی کـەلاس دانـرا

لە ئامانجی ئەوبوو کـەوا کـورد زمـان
بە کوردی بخوێنن لە هەرجێ و زەمان

لە بـۆیێ کـتێب و گـەلێکیش گـۆڤار
بە کوردی دەنووسران ئەوەی بوو وتار

لە هــەر دایــرەیدا، قــوتابخانە کــان
بە کوردی دەبـوو بـێ قسـە و بـاسیان

بە رەسمی دەناسی زمانی قـەومی مـاد
بە شـانازی «ئـاوێر» ئـەمەی دێـتە یـاد

## مزگەوت

دەبینن کـە مـزگەوت لە دێـهات و شـار
لە نـێو کــوردەواری گــرینگە و دیـار

لە بۆ خواپـەرستی سـەفای روح و گـیان
لە بۆ نـوێژ و وەعـزە هـەیە جـێ ئـەمان

گــەلێ رۆژگــارە کــە مــزگەوتە جــێ
لە بۆ خوێندنی کورد لە هەر شوێن و رێ

دەزانین کـە نـووسەر لە کـۆڕی خـەبات
گــەلێ پــێ گــەیشتن لە مــزگی وڵات

گەلێ شـاعیری کـورد هـەژار تـا هـەزار
لە مزگەوتێ فێربوون کـە بـن رۆح سپار

دەبـوو پـێشەوایـی، بـەرێزن بـە سـوور
لە کــاری گـرینگدا لە مـزگەوتی سـوور

لە گــەڵ زۆر سـەرانـی عـەشایر بـە کـار
بە راوێژی حەل کـرد گـەلێ کـار و بـار

لە لای پــێشەوامــان ئـەمر واکـرا
بــە کـوردی بێ خـوتبە لە جـومعە بـرا

## هاتنی ئەرتەش بۆ مهاباد

لە سەرماوەزا بوو لە بیست و شەشی
مهاباد بوو گیرابە لەشکر کەشی
لە ئەو مانگەدا بوو لە رۆژی سییا
سەرانی حکومەت کە گیران تییا
لەوێ سەیفی قازی لەگەڵ پێشەوا
لەگەڵ سەدری قازی دەبینران کەوا
لە بۆسەر بە خۆیی گەلی کورد زمان
سەر و رۆحی خۆیان لە پێناوی نان
لە دەی خاکەلێوەی کە دەستورە هات
لەوی حوکمی ئیعدام بە ئیجرادەر هات[1]

## راگەیاندنی حکومەتی کوردستان لە لایان شێخ مەحموودی نەمر لە سلێمانی

لە جەنگی جیهانی هەوەڵ کورد زمان
لە بۆ مافی خۆیان لە هەر لا جمان
لە ئەو کاتەدا بوو کە شێخی نەمر
بە رێز بوو لە دنیا لە نێو کوردی خڕ
سلێمانی ئەو دەم بە حەملەی بوو مات
لە ئینگلیس و روسۆ کە لەشکر دەهات

---

١- پێشەوای بەرێز قازی محەممەد لە دوهەمی مانگی رێبەندان لە ساڵی (١٣٢٤ هش) بووە سەرۆك کۆماری کوردستان و لە رۆژی بیست و شەشی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٥ (ه.ش) ئەرتەش هاتە مەهاباد و شار و ناوچەی گرت و دوایی دەستور درا پێشەوا لە ساختومانی ستادی ئەرتەش زیندانی کراو لە ئاخری بە فرانباری ساڵی ١٣٢٥ (ه. ش.) موحاکەمەی مەرحومی پێشەوا قازی محەممەد و ئەبولقاسم سەدری قازی برای و محەممەد حوسەین خانی سەیفی قازی لە دادگای نیزامی دەس پێکرا و لە ئاخردا لە دەهەمی خاکەلێوە ساعەتی سێی پاش نیوەشەو بە هۆی ئەوە کە داوای حەقی کوردیان کردبوو ئیعدام کران.

کـــە عـــوسمانی ئـــەودەم شکـاو و هـەڵات
لە هـەر لاوە خـوێن بـوو بـە سیلاو ئـەهات

لە ئـــەوکـــاتە بـــینرا عـــێراق نـاتەوان
لە ژێـــر چـــنگی ئـینگلیز خـەڵک دامـران

بـەدەستوری«ویـلسن»لەتـەشرینیدوو(١٩١٨)
ســـلێمانی پـێتەخت لە بـۆ کـورد ئـەبوو

لە بـــۆ شـــێخ مـــەحموود نـەزەر وادرا
ئـەوە حـاکـمی کـورد مـەلیک نێو بـرا

بـــە ڕەئـــی عـەشایر و خـەڵکی لە شـار
بـوە رابـەری کـورد لە هـەر کـار و بـار

ئـە لەوکـاتەدا بـوو کـە ئینگلیز دەهـات
لە بـۆ یـارمەتی شـێخ لە ڕێگـەی خـەبات

لە ئـــابوریا بـــوو کـــە کـۆمەک کـرا
گـــەلێ پـــوڵ و پـارە بـە کـوردان درا

بـەڵام شـێخ بـوو دەیـوت دەبـم سـەرفەراز
کـە ئینگلیز لە نێو کـورد نـەبێ دەستی بـاز

کـە ئینگلیز بـوو زانـی دەچـێ گش بـە بـاد
ئـەوەی بـۆی مـەبەستە لە نـێو کـوردی مـاد

بە هـۆی وەی بـوو دڵگیر وە ویستی کـەمێ
لە مـــانگانەی شـــێخ کـــەمۆکـا دەمـێ

لە پـاشان بـە نـەخشە و خـەریتە دەهـات
هـــەتاکـــوو عـەشایر لە شـێخی بکـات

لە ئـەو سـەردەمەیدا «میجەرسون» ئـەهات
هـەتاکـو حکـومەت لە کـورد تێک بـدات

لە وێـــدا بـــوو شـێخی نـەمر ئـاگـەدار
کـــە ئـینگلیزە دوژمـن لە بـۆی ئـاشکار

ئـــەویش کـــەوتە خـۆیو لە کـاتی زووا
ســـەرانـــی عـــەشایر لە گـــەڵیان دووا

بـــە مـــەحموودی دزڵـــی پـەیامی دەدا
ســـپا بـــێنە فـەوری نـەبێ بـۆت هــەدا

ئـەئەو لەشکــری کــۆک هـەموو قـارەمان
لەگـــەڵ خـــانی دزڵـــی دەهــاتن ئـەوان

ســـلێمانی ئـــەودەم بـوو جـێی نـەبەرد
کوڕی کورد لە وێ بوون هەمووی شێرە مـەرد

لە ســـەربازی ئـــینگلیز لەکــارمەندی وان
دەگـــیران لە هـــەر کـــوێ کــە وان بـینران

لە ئـەوکــاتە ئـینگلیز لە هــەر لاوە هــات
وەکـــوو هــەنگەژاڵــەکــە پـورەی دەدات

لە هــەر لاوەگــورگ و لە هــەر لا چـەقەڵ
لە بـۆ شــەر لەگەڵ شێخ دەهـاتن بە بـەڵ

لەوێ لەشکـــــری شـــێخ کــــە دەوری درا
گــــەلێ لاشـــەی کـــورد لەوێ بـــینرا

لە شـــەڕ دا لەوێـــدا بــە تـیرێکی چـەوت
بریندار بـوو شێخ لە بن بـەرد بـووکـەوت

ئـە ئـەو بــەردە ئەمڕۆ بە بـەردە قـارەمان
لە نێو خەڵکە مـەشهور لە زۆر جێ و زەمـان

دەیــــان نــــارد لەوێ را لە بـــەغداکــەوا
بـــــرینی بـــە دوکـــتور بکــــاتن دەوا

لەوێ حـــوکمی کــوشتن لە بـۆ شـێخ درا
بـــەلام دوایــــی گــۆڕا بـە زیـندان کـرا

لەوێ نـــاردیان زووکــــە دورۆ خــــرێ
لە هـــــيندا بـــــمێنێ لەوێ دامــــرێ

بـەلام شێخ کـە سێ سـال لە هـیندا دەمـان
لەوێ راگـــــەڕانـــۆ لە بـــۆ نـــیشتمان

لە هــەر لاوە مــەوجی لە عــالەم دەهــات
بـە پێشوازی شێخی کـە رۆژ بـوو هـەلات

هــەزار بـوو وە نـۆسەد لەگـەڵ بـیست و دو
لە چـــاردە لە ئـــەیلولی شـێخی دەچـوو

لە ئەو کۆنگرەیداکـە خـۆی بـوو سـەرۆک
پـــەزیرایـــی کـردن لە مـیهمانی کـۆک

لە دوی چـــەند رۆژی لە تـــەشیرینی دوو
نەمر نـێوی خـۆی نـا مـەلیک، حـەققی بـوو

لە ئـــەو رۆژەدا بـــوو کـــەوا هـــەڵدرا
لە هـــــەرلاوە ئـــالاّ لە بـــان دیـــنرا

ســـلێمانی پـێتەخت لە بـۆ کـوردی مـاد
مــەلیک بــوو لەوێـدا لە بـۆ عـەدڵ و داد

لە ئـــەو کـــاتە شـێخی نـەمر کـەوتە رێ
کــە کـەرکوکی کـوردان لە بۆ خـۆی گـرێ

لە داگـــیر کـــەرانـــی بسـێنی بـە بـیر
ئـەگـەر پـێک نـەهاتن بـە نـێزە و بـەشیر

بـەلاّم چـەن عـەشایر کـە بـوون خـۆ فـرۆش
لەگەڵ دەولەتا بوون بـە حـرس و بـە جـۆش

بـە تـانگ و بـە تـوپ و لە جـەنگ ئـاوەران
دەهــاتن بــە هــەڵمەت لە بـۆ کـورد قـران

ئـە ئـەو ئـێلەگـوللەی بـە شـێخۆ دەنـان
هــــەتا مـــافی کـــوردان نـەسێنی لە وان

لە رێـــدا بـــوو شـێخی لە ئـابلۆقە مـان
وەکـــوو تـەرزەگـولله بـە سـەریا رژان

مەلیک چوون ئەوەی دی وتی کورد بە شیر
لە پشـــــتم دەدا تـــا بـــمێنی ئـــەسیر

لە رێـــی ســـەربەخۆیی مـــەلیک بـێ هـەدا
دەبـوو شـەڕ لەگـەڵ کـورد ئـیدامـەی بـدا

لە بەر وەی لەگەڵ کورد نـەکـا شەڕ بـە تـیر
لە جــەنگ و سـیاسەت وە لاچـوو بـە بـیر

له نـــۆی دەی هـــەزارا له ســـاڵێکی تـــار
لە نـۆسەد وە پـەنجاوە شـەش بـوو قـوتار

ئـەحەد ئـەمری پـێ کـرد ئـەتۆ بـە جـودا
وەر و تـــۆ لە زەوێـــۆ له بـۆ لای خـودا

له ئـەو کـاتە روحـی بـەرەو عـەرشە چـوو
لە نـــێو لامـەکـانا لە لای حـەق دەبـوو

بـە ئـەمری خـودا زوو لە تـەن بـوو جـودا
بـەرەو عـەرشە رۆیـی بـە حـەق بـوو هـودا

دەرۆیـــی هـەتاکـوو لە سـەف دادەمـان
لەگەڵ جەددی خۆی کەوت مـرۆڤی قـارەمان[1]

---

١ ـ شێخ مەحمودی بەرزەنجی لە ساڵی (١٨٨٤ ز) لە سولەیمانی هاتوەتە دنیاوە، و دوای بەینێ تارمایی جەنگی (١٩١٤ـ١٩١٨ز) بینرا و لە مەیدانی جەنگەکان دنیا لافاوی خوێن هەستاو لە لایێکەوە ئینگلیز پەلاماری بۆ سلێمانی هێنا و لە لایێکی دیکەوە روس. شێخ مەحمود کەوتە شەر لە (١٩١٧ ز) لەگەڵ ئینگلیز و لە سال (١٩١٨ز) لەگەڵ روس، بەڵام سیاسەتی رۆژ وای پیویست دەکرد حکومەتێکی کوردی هەبێ. «ویلسن» حاکمی تەواوی عراق لە تەشرینی دوهەمی (١٩١٨ز) کۆبونەوەیێکی گەورەی لە سلێمانی پێک هێنا و شێخ مەحمود بوە حوکمداری کوردستان و یارمەتی ماڵی شێخیان دەدا لە دوای بەینێ شێخ ویستی دەستی ئینگلیز لە کوردستاندا کورت کاتەوە و ئەوانیش تێگەیین. ساردی کەوتە بەینیان شێخ خەبەری بە مەحمودخانی دزلی دا و ئەویش بە لەشکرەوە هات ئەوی کارمەندی ئینگلیز لە سلێمانی بوو گرتنی و ئەوانیش بۆ تولە سەندنەوە لە شێخ سوپایان هێنابەلاّم چەند جار کە دەهاتن دەشکان تا ئاخر وەک گەلای دار لەشکریان هات و لە ١٩١٩/٦/٩ شێخ مەحمود بریندار بوو، گرتیان و دوریان خستەوە ناردیان بۆ هیندوستان و دوای سێساڵ دیلی لە (١٩٢٢ز) هاتەوە سلێمانی و لە ١٤ ئەیلولی ١٩٢٢ ز کۆنگرەیێک دەگیردرێ و شێخ دوبارە دەبێتە حاکمی کوردستان و بە مەلک نێو دەردەکا و دەوڵەت دادەمەزرێنێ و دوای بەینێ دوبارە لەگەڵ ئینگلیز نێوانیان ناخۆش دەبێ و ئەویش ویستی سولەیمانی بۆمباران کا و لەو کاتەدا سمایل ئاغای سمکۆ لەوێ بوو و ئینگلیز نەی دەوەیست ئەویش دڵ بریندار بێ جا لە بەر ئەوە بەیاننامەی بڵاو کردەوە کە سمکۆ بڕوا و ئەویش لە ٢٨ شوباتی ١٩٢٣ بە خۆی و سوارەکانیەوە رۆین و بە دوایدا سلێمانی بومباران کرا و دوای ئەویش چەند شەڕی دیکەی لەگەڵ ئینگلیز بوو لە ئاخردا نەخۆش کەوت و لە شەوی (١٩٥٦/١٠/٦) کۆچی دوایی کرد و ئاواتی ئازاد بونی کوردستانی بردە ژێر گڵ.

⇐

# سمایل ئاغای سمکۆ (١٣٠٩)

لە جـــەنگی جـــیهانی، هــەوەڵ بــینرا
نــیزامســـەڵتەنەی بــوو، لە تــەورێز کــرا

بە سەر پەل بە حاکم، لەوی حوکمی هات
بــە زەهـری دەروونـی، دەسـووتا وڵات

لە نێو گـێژەڵووکەی، دەروونـی بـوو مـار
لە بـۆ جـەعفەراغـا، دەسـوورِا لە غـار

لە بــۆ جـەعفەراغـا هـەڵۆی نێو تـەلان
لە ئێلی شکاکـان، سـەرۆک هـۆزی وان

بــرای چـووکە سـمکۆ، بـە رۆح و گـیان
لە گـەڵ کـاکیا بـوو، لە گـەڵ ئەو ژیـان

لە ئــەو کــاتە تــەورێز لە گـێژاوی شـەڕ
دەبـــوو جـــەعفەراغـا بـبێ بـاخەبەر

---

⇐ پەیمانی لۆزان بە ئاودا درا.لە دوای شەڕی جیهانی هەوەڵ لە ٣١ی ئۆکتۆبری ١٩١٨ و ئیمزای سێڤەر لە ١٠ی ئــووتی ١٩٢٠دا دەوڵـەتێکی تــازە هــاتەسەر کـار کـە میللی متفقین (سـوێندخۆرەکـان) هەڵیاندەسووراند هەر بۆیە نیشتەجێی وڵات لە هەر تیرە و تایفەیێک بەتوندی لەو وەزعە نارەزایی خۆیان دەربڕی کە وڵاتەکەیان بە دەس بێگانەوەیە و مستەفاکەماڵ کە مەئموری بازرەسی رۆژهەڵاتی عوسمانی بوو توانی فەرماندەی سپا و قشوون رەگەڵ خۆی خا،جا بۆیە تووشی شەڕ بوو و لەشکـری یـۆنانیان کـە تەماعی لە خاکی عوسمانی کردبوو وەدەرنا و لە هەر لایێکی دیکەوە بە سەر دوژمندا زاڵ بوو و کۆنفرانس و مەبەستێکی دیکەی سوڵح و ئاشتی لە لۆزان پێک هات کە لە ٢٤ی ژووئیەی ١٩٢٣ بە ئیمزاگەیی کە تەواوی وڵاتی موسڵماننشینی خاکی تورکیە کە تەواوی کوردستانی باشووریشی وەبـەرکەوت لە لایـان سوێندخۆرەکان لە ئۆکتۆبری ١٩٢٣ بە نێوی جمهووری تورکیە بە رەسمی ناسرا و مستەفاکەماڵ بوو بە رەئیس جمهوور بەڵام سوڵتان عەبدولحەمید یەک ساڵی دیکە خـەلافەتی کـرد. کـەماڵ حـاڵی کـرد کـە خەلافەت لەبەین چووە.

سەرچاوە: تاریخ مشاهیر کرد، تألیف بابامردوخ روحانی.
کتاب جنبش ملی کرد، کریس کوچرا، ترجمە ابراهیم یونسی.
جامعەشناسی مردم کرد، تالیف مارتی وان بروینسن، ترجمە ابراهیم یونسی.
شەرەفنامەی بدلیسی، ترجمە هەژار.

نیزامسەڵتەنە خۆی، بە خەتێکی جوان
لە بۆ جەعفەراغا دەنووسێ هەر ئان
لە مەیدانی تەوریز، لەکووچە و لە بان
شەیاتینی شەڕ دێن، نیە هیچ ئەمان
وەرە کۆمەکی من، سپا بێنە زوو
هەتا هێمنی کەین،گڕی شەڕ هەموو
ئەویش رۆیی سوارەی عەشایر کەلان
بە وێدا دەڕۆین، هەموو پاڵەوان
وەکوو مێگەلی شێر، بە حەملە دەچوون
هەتا راوی کەن فیل لە هەرکوێ کە بوون
وەکوو مەوجی دەریا، دەڕۆین بە گەف
لە خەنجێر و شمشیر، بریقەی بوو سەف
بە نێزەی ئەوان بوو، لە ئەستێرە مانگ
چکەی خوێن دەباری، هەوا ببوە قانگ
سەری نووکی خەنجەر، لە دندانی مار
لە نێو قەلبی دوژمن رژانی لە ژار
وەکوو مەوجی دەریا، دەڕۆین بە ریز
هەموو سواری ئەسپی،کەحێل بوون بە فیز
دەرۆین لەکووچە و لە مەیدانی شار
لە نێو کاخی دەوڵەت دەبوون جار و بار
نیزامسەڵتەنەی بوو، وەکوو هار و شێت
لە دووی جەعفەرئاغای دەناردن کە بێت
لە نێو ماڵی خۆیدا، لە چەن جێ کەمین
لە بۆ جەعفەرئاغا،کرا تا نەژین
لە وێدا بوو حەملەی، ئەجەل پێ کرا
بە خەنجەر بوو «ئاوێر» لە خوێن وەردرا

# ئاشوور

لە جـەنگی جـیهانی هـەوەڵ سـی هـەزار
لە تـورکییە ئـاشوور بـە ریـز هـاتە خـوار

لە سـەر دەشـتەبێڵ و هـەتا نـێو شکـاک
لە کـوشتار و تـاڵان، نـەیانبوو بـاک

بـە بـارووت ئەسووتا مەڕ و مـاڵ و گـوڵ
لە نـێو کـاسەیی سـەر، مـەغز هـاتە کوڵ

لە تـورکیە ئـاسوور مـوهاجر دەهـات
هـەتاکـوو نەکـوژرێن، لە خـاکـی وڵات

هـەتا میللەتی تـورک وەکـوو جاری پێش
لە بـۆ چـاڵی مـردن نـەیانکا بـەکێش

دەهات ئەسڵەحەی زۆر لە رووسۆ بـە یـەک
هـەتاکورد و تـورکی بکـەن گشتی چەک

لەوێ دەم بـوو ورمـێ، کـە تـاڵان کـرا
گـەلێ مـاڵ و مـنداڵ بـە یـەخسیر بـرا

سەرۆک (مارشیمۆن) بوو، لە فکـری عـەیان
کـە سـەڵماس و ورمـێ، بـبێ بـۆ ئـەوان

لەوێ دەوڵـەتێکی لە ئـاسووریان
درووس کـا ببێ کـورد لە ژێـر دەستی وان

بـەڵام تـێ گـەییبوو، بـەبێ یـارمەتی
لە بـۆی ساز ئەبێتن، لە چـەن جێ کـەتی[1]

لەوێـرا بـوو زانـی ئـە ئـاوایـە بـاش
کـە سمکۆ وەدەس خـات وتـی رازی فـاش

هەموو چەک بە دەستی بـە سـەف رادەمـان
هـەتاکـو بـبیسن وتـاری و بـەیان

---

١ ـ کەتی: لە کارکەوتن، وەرشکستە

وتـــی مـــن دەزانـــم کـــە ســـمکۆ بـــە بـــیر
لە بـــۆن پشـــتیوانـــە بـــە شـــوور و بـــە شـیر

لەوی رادەبـــــــینم بـــــــە لەز راپـــەڕێ
هـــــەموو ئـــەو ولاتـــەی لە بـــۆمان گـــرێ

ئـــەوە تـــورک و دەوڵـەت دەڵـێن ئـەلئەمان
لە مـــــەیدانـــی شـــەڕ یـــا دەلەرزن ئـــەوان

ئـــــــەوە واکـــــــلیلی تـــەواوی ولاّت
وەدەس ئـــێمە خـــا، زوو لە ڕێگـەی خـەبات

ئـــەگـــەر تـــەپڵی لێـــدا، هـــەوا تـــار ئـــەبێ
تـــەواو گـــورگ و ڕێـــوی لەوا تـــار ئـــەبێ

ئـــەوە پـــاک ئـــەکـــاتۆ لە ژەنگ و لە ژار
تـــەواو دەشت و ســـەحرا، بـە هـۆی کـارزار

ئـــەگـــەر ئـــەسپی ســـمکۆ سمی دا لە شاخ
شـــــەقارەی دەبـــــەستێ زەوی کـــاخ و زاخ

سکـــــەندەر لە شـــەڕدا ئـــەرەستوو بـــە بـیر
لە ژێــــر هـــــەورە بـــاڵی دەبـینێ نـــەچیر

بـــە ئـــەو هـــۆیە بـــاڵوێز، لە بـــەینی ئـــەوان
دەهـــات و دەڕۆیـــی، نـــەبوو بـــۆی وچـان

بـــەڵێ (مـــارشیمۆن) بـــوو بـە فکـری ولاّت
بە سمکۆ وەدەس خا و لە ژێر چۆکی خـات

لە پاشان کـە نـاوچەی، تـەواو کـەوتە دەس
بـە پـەنجەی لە ســمکۆ بـدا شێری مـەس

بـــە ئـەو جـوورە سـمکۆ لە دەریـاچە کـات
ئـیدی کـەس لە سمکۆ، نـەبێ نێوی بـات

بـــەلاّم کـــوردی وریـــا لە نـــەخشەی گـەیی
لە بـــۆێ بـــەگـــوللە دڵـــی کـــرد مـــەیی

هـــــەڵۆی فکـــری ســـمکۆ، لە ئـــەستێرە دا
بـــــە بـــاڵی بـــڵندی لەوێ و لێـــرە دا

دەســـووڕا کــه بـەڵکوو، له بـۆ کـوردی مـاد
درۆس کــا حکــومەت، له بـۆ عـەدڵ و داد

بەڵام دیـتی دەس دان، له گـەڵ (مـارشیمۆن)
له دەس‌دانـی تـورکه و گـەلی کـوردی خـۆن

بـــه تــەنیا دەمــێنێ، له جــەنگەی نــەبەرد
بــه بـازوویی ئـاسوور، دەبـێ تـەن بـه گـەرد

له نـــێو فکــری ســووڕا ســەدێکی قــەوی
جــــه ئــاشوور له ڕێــیا له کــورەی زەوی

بـــه تـــێبینی ســــمکۆ وەهــــا تـێگەیی
کــه ئـەو سەدده لابـا له سـەر رووی زەوی

هـەتا خـاکـی کـوردان، لەت و پـەت نـه کـا
بەنەیرەنگی ئینگلیس ئـەویش خـەت نـه کـا

بـه ئـەو هـۆیه هـەر یـه‌ک له دوو ڕەهـبەران
دەبــوو وا له خــانەی بــەیه‌ک گـەن ئـەوان

هــەتاکــوو لەوێــدا، بــه شــەرت و قـەرار
بــبن کــۆمەکـی یـه‌ک، له هـەر کـار و بـار

له بــەر وەی له دەوڵــەت هــەموو ڕاپــەڕن
بــه شــمشێری وەحــدەت، له بــەینی بـەرن

نــــەمێنێ لەوێــدا، ئــەبەد تــورک و تــات
هــــەمووی بــێته مــاڵی، مــەسیحی وڵات

له پـــێش گــفتوگۆدا کــه ســمکۆ بــەهۆش
بــه نــەخشەی دەزانــین دەبـوو دڵ‌پـەرۆش

تــــەواو تــــێگەییبوو، کــه شــمشێری وان
له بــــۆیێ بــــوو کــوردێ، نــەیێڵێ لەوان

له بــۆ خــانه بــوو هـات سـەرۆکـی ئـەوان
گەلێ چـەک بـه دەس بـوو، له گـەڵیا ئـەمان

له ئــەو کــاته سـمکۆ، له گـەڵ (مـارشیمۆن)
وتــــووێژ و بــاسی، فــریو یــه‌ک بــخۆن

لەوێ لەحزە رۆیی کە سمکۆیش دەچوون
بە ئاشتی و بە سازش لەیەک جوێ دەبوون

لە ئەوکات و ساتەی دەهات (مارشیمۆن)
لەکالیسکە دانیشت بە خۆشی بڕۆن

لە ناکاو لە پشتۆ،کە سمکۆ بە تیر
لە نیۆشانی وی‌دا، تخێڵ بوو فەقیر

بە دووی ئەو تەقەیدا، لەگوێسوان و بان
وەکوو رەعد و بەرقێ، لە رووی ئاسمان

بە تیر و موسەلسەل، لەگاردی دران
نزیکەی دووسەد بوون، لە ئەرزی خران

گەڕاوۆ لە چەهریق بە خەڵکی گەیان
بڕۆن تا نەکوژرێن بە تۆڵەی ئەوان

بە شمشێر و خەنجەر بە تۆپ و تفەنگ
لە بۆ تۆڵە ئاشوور دەهاتن‌بە دەنگ

لە ئاسوور و ئەرمەن، لە ناوچەی وڵات
شەپۆلێکی دەریا بۆ لەشکەر دەهات

تەواو خاکی کوردان لە شار و چیا
نە کورد و نە تورکی نەمابوو تیا

بە خەنجێری تۆڵەی گەلێ شەق کران
لەت و پەت گەلێکان لە ئاوی خران

بە سەرنێزە دەڕژا چکەی مەغز و خوێن
نەبوو کەس بزانێ کە خزمی لە کوێن

لە ورمێ و لە خۆیێ لە شاپووری پاک
لە سینگ‌دانی یەک بوو بە شمشێری چاک

بە کوردان و تورکان لە ئاسوور درا
بەڵام ئاوری وان، لە عالەم خرا

لە سەر چاو ئەبینرا، کە ئەستێرە زۆر
لە مژۆڵی دەڕژا، لە سەر ئەو بوو تۆر

خـەبەر لەو دەمـەیدا، بـە گـوڕڕە و هەرا
وەکـوو گـێژەڵووکە، لە نـاوچەی گـەڕا

وەکـوو مـەوجی دەریـا، لە ئـاسور سەوار
دەهـاتن لە چـەهریق بـوەگـیر و دار

شـەڕی تـەنبەتەن بـوو لە سـەڵماس خـرا
لەوێ دەم بـوو خـانێ، وەبـەر شـیر خـرا

بـە تـۆپ و مـوسەلسەل، لە چـەهریق درا
وەکوو خـاکـی سەحرا هەموو خەت کـرا

بـە شـمشێری ئـاشوور لە ورمـێ درا
سـەر و مـاڵ و سـەروەت بـە تـاڵان بـرا

لە سـایینقەڵا و و لە ورمـێ بـوو زۆر
قـوشوونێکی ئینگلیس، لەدەریـا،بـوو جـۆر

دەیـانویست کـە کـۆمەک بـە ئـاسوریان
بکـەن تـاکـوو زۆر بـێ ئـەوان زۆریـان

بـەڵام ئـەژدەهایی مـەرگ بـوو دەهـات
لە نـێو زاری خسـتن، نـەما رێـی نەجات

لە هـەر لاوە دەوری درا بـێ ئـەمان
بەکورد و بـە تـورک و بـە دەوڵـەت هـەمان

بـە شـیر و بـە تـیر و بـە تـۆپ لێ دران
لە نـێو ئـاورا بـوون، دەسـووتان ئـەوان

بـزێکی هـەڵاتن، لە نـێو قـۆرغ و دار
لە نـێو شـاخ و داخـا، کـەورگێکی تـار

دەمـان و دەڕۆیـن، لە شـاخ و تـەلان
کـە بـەڵکوو نـەکـوژرێن هـەتا ئـەیرەوان

لەوێ دەم بوو سمکۆ، بـە دۆست و بـە خـۆ
بـە هـێرش دەهـاتن وڵات کـاتە خـۆ

لە ئـەو فکـرەدا بـوو، لە نـاوچەی وڵات
حـەقی کـورد بسـێنێ، بـە زۆری خـەبات

بــە گــوزم و بــە هــێرش، لە گــوڵخانیدا
هــەمووی گــرتە دەســتی لە یــەک ئانیدا

هــەتا کــوو لە تــەورێز، قــوشوونی ئەوان
لە گــژ مــیللەتی کــورد، نــەیێن بــۆ ئــەمان

بەگوێرەی ئەوەی بــوو، کــە چەکدارەکــان
بـــە هــێرش دەڕۆیــن، لە بــۆ شــارەکـــان

بــە تــاکتیکی شــەڕ بــوو، لە ورمــێ گــەڕان
هــەموو کــاخی دەوڵــەت، لە ژێــر پــێ خــران

لە شـــاری دەســـووڕا، مــژی تــیر و تــار
نـــەماکـــەس لەوێـــدا، لە ســەرمایەدار

لە چـــەخماخە دانـــی ســـەری نــێزەیان
دەســووتاگــەلێ دێ ، لە نــاوچەی ئــەمان

ئــەوەی دوژمــنی بــوو کــە مــەغزی رژا
هـــەموو نـــەخشە راوێـــژ لەوێ داپـــژا

بـــە شـــمشیری دووســـەر لە نــاحەز درا
لە نـــێو گـــۆلی خـــوێنا، بـــە لادا خــرا

وەکــوو بــا و بــۆران، دەهــات و دەچــوو
لە چــەکــداری دوژمــن، حــەریفی نەبوو

لە هــەر لاوە دوژمــن بــە نــێزە و بــە شیر
لە دەوری دەســووڕان کــە بــیکەن ئــەسیر

بــەڵام کــوا پــڵینگێ، لە نــێو کــۆڕی مەڕ
دەبــینێ نـــەیێڵن، لە بــۆی بــاڵ و پــەڕ

کــە هــەرچەن (فــیلیپۆف)، لە رۆژی بەرات
کـــۆماندۆ و لەشکــر، لەگــەڵیا دەهـــات

وەکــوو مــەوجی دەریــا و و تــەرزەی بــەهار
ســـپا و لەشکــری وان، دەهـــاتن بــە غــار

هــەتا مــەغزی ســمکۆ دەرێــنن بــە شــیر
بــدەن خــوێنی جەرگی، بــە مــار و بــە مــیر

بـــەلاّم قـــەلبی ســمکۆ لە پــۆلاّیە ســاز
لە ئــەلّماسە بــازووی، لە چــنگدایــە بــاز
لە شـــمشیر و بـــڕنۆ لە تــۆپ و تــفەنگ
نەبوو وەهــم و بــاکــی لە مــەیدانــی جــەنگ
لە مــەلّبەندی ورمــێ یــەک ئــاسۆر نــەما
مــەگەر بــەش قــەل و دالّ، لە شــاخ و چــەما
تـــفەنگچی لەکـــورد و لە تــورکی ولاّت
لە بـــۆ راوی ئـــاسۆر بــە گــورمژ دەهــات
ئــەوەی شــێری مــەس بــوو لە بۆگیرودار
لە بن چــەکــمەیی کــورد دەیــانکوت هــەوار
بــە دووی دوژمــنا چــوو، بــە تــیر و کــەوان
وەکوو شــێری جــەنگەلّ، لە دووی ئــاهووان
لە لای گـــۆلی ورمــێ لە خــوێن وەردران
شــەفەق بــۆیێ ســوور بــوو لە دەور ئــاسمان
لە ســـووری ســـەرافــیل درا بــۆ ولاّت
مرۆڤی چەکبەدەس بوو وەکوو خیز ئەهات
بـــە بـــاروت ئـــەبرژا لەوێـــدا بــرین
کــە مــەیدانــی شــەڕ بــوو بــە ئــاورپژێن
بە سم ئەسپی سمکۆ، بە خوێن سووری کــالّ
دەخـــەملّی گـــولاّلە، لە دەشت و لە پــالّ
لە بـــازووی ســـمکۆ دەلەرزی چــیا
ئــــەوەی رۆحلەبـــەر بـــوو نـــەمابوو تــیا
هـــەلّۆ چــۆنی دەگــرێ، کــەوی لانســار
لە ژێــر چــڕۆکــی نــاحەز دەســوورِا مــرار
رکـــێفی دەدا زوو لە ئـــەسپی کـــەحێل
هـــەتا نــاحەزی خــا لە نــێو ئــاوی لێــلّ
لە دەشت و لە جەنگەلّ، لە نێو چۆم و دۆلّ
هــەرای کــردە دوژمــن مــەڕۆ ئەی دەهــۆلّ

هەڵۆم من لە دووی تۆ، ئەتۆی زاغی پیس
لە نێو چنگی مندا دەبی وشک و سیس

نەکەی فکری واکەی، هەڵێی دەردەچی
لە نێو خوێنی خۆتا دەسوورێی کەچی

بە شمشیر و نێزە ئەوەی بۆی دەهات
بە دەس خۆ سەری خۆ لەبەر پێ دەخات

لەکوێ دیوتە ئاوێر کە وا شیری نەڕ
ببێتە نەچیرێ لەبۆ ڕێویە لەڕ

# شەڕی دێی (ئەزدیکان)

قـوای دەوڵـەتی بـو، لە «خـۆ» بێ‌شمار
بە توپ و بـە تـانگ و مـوسەلسەل بـەکـار

دەهـــاتن هـــەتا دێ تـەواو بـێتەگـیر
لە نــێو ئـەزدکانا وەگـیر خـەن نـەچیر

لەگەڵ ئـەرفەعا بـووگـەلێ تـۆپ و تـانگ
لە خۆێ کەگـوللەی، دەکـەوتن لە مـانگ

دەهـــاتن ئـەوانــە لە بـــوو کـــورد قـران
بـەڵام رێ کـەمین بـوو، هـەموو تـێ خـران

لەکـوێ دیـوتە، رێـوی، لە مـەیدانـی شـەر
کــە بێ پـەنجەڵی دا، لەگـەڵ شـیری نـەر

نــەکـەی فکـری واکـەی، نـەچیرتە،لەوێ
مـــحالەکـــە سـیمرغ، لە داوت کـــەوێ

نـەکـەی فکـری واکـەی پـەراسـویی شـێر
لە نـیویا، غـەزو بـەز، دەبـێ مـەست و تـێر

کـــەژوکـــێو بـــوو ســـفرە تـــەواو راخــرا
لە بـــۆ داڵ و رێـــوی کـــەلاک دانــرا

ئـەسیر بـوو لە دوژمـن گـەڵی پـاڵەوان
مـوسەلسەل بـە دەس بـوو هـەمو رادران

ئـەوانـەی ئـەسیر بـوون، هـەمویان بـران
هـەتا کـو لە سـمکۆ، سـەلام کـەن ئـەوان

لە وێـدا وەخـڕبوون بـە فکـرا دەچـوون
لە بـارەی مـوسەلسەل لە بـاسا دەبـوون

بـە فـەرمانی سـمکۆ، مـوسەلسەل بـرا
بـە دەس ئـەفسەریکی، لەوان بـوو درا

هـەتا پـارچـەکـانی، نـیشانی درێ
ئـەوەی نـەقس و عـەیبە لە بـەینی بـەرێ

مـوسەلسەل بـوو ئـامادەیی کـارزار
لە بـۆ سـینگی سـمکۆ، کـە سـوڕانـی مـار

لە چـەخماخە تـونترکـە سـمکۆ پـەڕی
هـەڵوێ بـوو رۆهـات لە تـەپڵی سـەری

لە جێی خۆ بوو ئەفسەر، لە پڕ شێری مەست
لە سەر سینگی گرتی، بەهێز هەر دوو دەست

ئـەوانـەی ئـەسیر بـوون، لەوێ دەم دیـیان
بە هۆی وەهمی خۆیان هـەموو سـەر بـڕان

بەڵام شادە سمکۆ لە چاو سووری وان
کە دی ئەفسەرێکی وەها قارەمان

لە بێ باکی ئەفسەر، بوو سمکۆ کە هات
بە روویێکی خوشۆ، هەمووی کرد خەڵات

بە هەریەك ئەسیری کە لیرەی دەدان
لەوێ دەم بوو ئازاد هەموو رەدکران

## شەڕی سەیید تاها راوێژکاری سمکو لەگەڵ خاڵو قوربان

لە تاریخە سەرداری جەنگەڵ کە خۆی
لەگەڵ خاڵو قوربان رەفیق بوو لە، بۆی
لە نێو مێشە جەنگەڵ، زەمینی بەیار
لەگەڵ دەوڵەتابوو، لە شەڕ دا، تەیار
بەڵێ خاڵە قوربان لە مەیدانی شەڕ
بە هۆی تەجرەبەی بوو، بە تیمساحی نەڕ
چریکێکی زۆر بوو، لەگەڵیا دەهات
گەلێ ئەفسەریش بوون، دلێری وڵات
هەموو فیلی مەس بوون، هەمو پاڵەوان
بە رۆژ و بە شەو بوو، دەهاتن ئەوان
لە تاران و تەورێز، نەبوو بۆی وچان
هەتاکو مەهاباد هەموو کا قڕان
لە عالەم خەیالا هەڵو بوو دەهات
لە بۆ مانی کوردان نەما رێی نەجات
عوقابی خەیاڵی، بەڵام کەوتە گیر
لە چنگاڵی کوردا دەبوو زوو ئەسیر
لەوێ دەم بوو خاڵو، کە لەشکر یەبرد
لە «داشامەجید» و «خەزایی» دەکرد

خــەبەریان ئــەدایـــێ، لە «بــۆکـــانە» دێ
لەگـەڵ سـەید تـەها دان، تـفەنگچی لە رێ
لەوێ خاڵە قوربان، وەکوو شێری مـەست
لە سەر کەڵکی بەگزادە، سـەنگریە بەست
هـــەمو جـێی بـڵیندی دەگـرت بێ سەدا
هــەتا هــەرچــی جـوڵا، وەبەر تۆپی دا
بـەڵی خـاڵە قـوربان بـە شادی دەهـات
کــە تــاها بە فـەوری لە تـەبکەی بـخات
لە عـــالەم دەرونـــا، دەرۆیـی بـە بـاڵ
هـــەمو نـــاوچەیی گـرت بە فکـرو خـەیاڵ
جـــل و بـــەرگی تــرسی، فــڕێدا لە دوور
لەگەڵ سروە سووڕا لە سـەرکـێوی تـوور
بـــــەڵام کــوا لە دنـیا لە عـالەم خـەیاڵ
چ پـیاوی بـە وەهـم وگـومان بـوو بـەماڵ
لەوەی بـێ خـــەبەر بـووکـەوا شێروکەڵ
لە پێش سەید تەها هەن هەمو وەک چەقەڵ
بــەڵام سـەید تـەها بـوو (ژوفـیری) زەمـان
لە نــەخشەی شــەڕێدا، نـظیری (ویگـان)
بــە فـەرمانی ئـەوبوو کـە هـەر سـەر پـەلێ
لە «بۆکان» تـفەنگچی بـە نـەخشە و هـەلێ
بەرەو شاری سابلاغ وەکـوو بـەرقی هـەور
دەهـــاتن لە شــێرو پـڵینگ و لە بــەور
لە بـــن دارو بــــەردو، لە نــێو گـیاوگژ
حــەشاریان دەگــرتن هــەوا بـووبە، مـژ
هـەتاکـوو لە فرسەت لە نـێو شـاخ و دوڵ
لە دەشت و لە سەحرا لە نێو مـیرگ و مـوڵ
نــەچێری لە دوژمــن، لە نـێو چـنگ گـرن
سەرو جەرگی وانـیش لە بـەر یـەک بـەرن
لە پــێش تــاو هــەڵاتا، لە وەخــتی بـەیان
دەهــات خــاڵە قــوربان وە فــەرمانی دان

کە ساز و تەیار بێ، گەلی چەک بە دەس
تەها تێک شکینن، بەبێ دەنگ و هەس
تەها و چەک بە دەستی، لە بۆکانە دێن
کوت و پڕ سەری وان، لە بن بەردی نێن
بسوتێنن ئیوە بە تۆپ و تفەنگ
نەمێنێ «مهاباد»، لەوی دەنگە دەنگ
بەڵام هات لە هەر لا لە بۆی بەبرو شێر
هەموو پاڵەوان و رەشید و دلێر
لە پێش هەڵمەتابوو، کە هات یەکنزا
کە تەک گوللەیێ بوو، لە سینگی خزا
لەوێ خاڵە قوربان، لە ئەرزی درا
نزیکی «وسوکەند» لە نێو خوێن خرا
لە ئەو کاتە دا بو، شکا لەشکری
تفەنگچی تەها بوو، هەمووی دادری
بە فەرمانی تاها، عەشایر دەهات
هەتا رێگە بگرن، نەبێ رێ نەجات
لە وێدا بوو پەرگار، گەرا دەوری دان
بە شێر و تفەنگ و بە تیر و کەوان
لە ئەو کاتە گوررەی عەشایر دەهات
بەلێک دانی شمشیر، دەسوتا وڵات
بە سمکۆڵی ئەسپان، زەمین دادرا
سەری ئەسب و ئینسان لەوێ داخرا
بە شمشیری ئەلماس گەلێ پاڵەوان
سەری هاتە خوارێ، لە روح دابڕان
برێکیش دەرۆین، سەروپێ شکاو
بەرەومالی خۆیان و گێلان بە تاو

# کوژرانی خالۆ قوربان و سمکۆ هەریەک بە جۆرێ

لە وەختێ کە خالۆ بە گوللەی دەکەوت
لە نێو خوێنی جەرگی بە باشی دەخەوت
رەزاخان بە فەوری لەوێ تێ گەیی
کە سمکۆیە بەبرێ بە بازوو قەوی
وتی ئەسلەحەی باش، دەبێ زو برێ
سپای خاکی ئێران هەموو دەنگ درێ
لەگش شاری ئێران، تەواوی وڵات
بە تۆپ و تفەنگۆ، بە شمشیر ئەهات
بەڵی مەوجی لەشکر هەموو دەنگ درا
موسەلسەل بە دەستو لە جەبهەی کرا
بە شمشیر و خەنجەر لەگژ یەک دەچوون
لە بەر ناڵەی توپ گەلێ حۆڵ ئەبوون
وەکوو ئاورێکی نەبێ بۆی ئەمان
گەمارۆ، درابوو هەموو خاکمان
تەواوی وڵاتن لە دەشت و لە باخ
لە لاپاڵ و چومەڵ، لە جەنگەڵ لە شاخ
لە نێو کێو کەژدا لە نێو بەردو دار
دەسوراوە دوژمن وەکوو غول و مار
وەرن تا بزانن لە «ئاوێر»، لە خۆی [1]
بە لافاوی خوێنا، سەر و لاشە رۆی
لە وێدا بوو سمکۆ، لە شاخ و سنوور
لە توورکیە سۆرا لە بۆی بوو بەتوور
فەلەک تۆپ و تانکی بە ناحەزیەدا
لە بۆیێ بوو سمکۆ، نەبوو بۆی هەدا
لە گیر دوژمنی کەوت، هەڵۆی بەردەڵان
لە شاری شنۆدا بە حەق روحی دان

---

١ - خۆی: نێوی شارێکە لە ئازەربایجانی رۆژئاوالە باکووری ورمێ

# حکوومەتی ئەمیر بەدرخان پاشا

بـــناغەی حکـــوومەت لەکـوردی جـزیر
بـەدرخـان بـوو دایـنا بـە هـۆش و بە بیر

حکوومەت بوو تـەشکیل بـە عـەدڵ و بـە هـۆ
ولاتـــێکی ئــازاد تـــەواو ســـەربەخۆ

هـــەتاگـــۆلی ورمـــێ سـنووری کشـان
لە سـەنجار و مـووسڵیش هـەبوو حـوکمڕان

لەوێ دەم بـــوو سککـــەی بـە نـێو لێدرا
بـــە شـایی بـوو نـێوی لە خـوتبەی خـرا

ولاتـــێکی گـەورەی وەژێـر دەسـتی خست
لە نـــەستووری مـــلهوڕ درا مســـتی وست

نـــییە شک لەوەیـــدا یـــەکـەم قـارەمان
لە بـــۆ ســـەربەخۆیی گـەلی کـورد ژیـان

هـــەموو قـــەوم و عـــێلی بـەوی نـاسران
هـــەموو شـێری مـەست و هـەموو پـاڵەوان

لە خوو و خەسڵەتا باش لە دووی ئەو دەچوون
لەبـــۆیێ لە مـــێژوو لەکـــەیوانـێ بـوون

لە ســاڵی چـل‌وشەش[1] بـڕێ نـاوچەکـان
لە نـەستووری ناحەز هەمووی گرت بەلاَن

لە عـــوسمانی ویســـتی ئـورووپا بـە زۆر
نـــەیێڵێ لە بـــۆتان بـــەدرخـــانی مـــۆر

لە مـــەڵبەندی ورمـــێ بـــە شـیر و بـە رم
لە عـــوسمانی گـــرتن تـەواو هـێز و جـم

بـــەڵام عـــێزەدین بـوو لە خـزمانی خـان
خـەیانەت بـوو کـردی کـەکوردی شکـان

ســـەرۆکـی سـپا بـوو بـە خـۆی و سپا
لەگـەڵ دەولـەتی کـەوت وەکـوو چـوارپا

لەوێـــــدا بـــەدرخـــان شکست پـــێدرا
لە بـۆ (کـرت) بـوو فـەوری وە دوورۆ خـرا

---

١ - ١٨٤٦ زایینی

له دووی رۆژگـــــاریٚ له رۆح دابـــــڕا
له شـــاری دمشـــقا بـــه جـــەننەت بـــرا
هـــەتاکـــەی خـــەیانەت بـــه «ئـــاوێر» کـــریٚ[1]
بـــه خـــەنجەر بـــراکـــەی له پشـــتی دریٚ
له مـــێژوو دەبـــینم هـــەوەڵ راپـــەڕین
له قـــوستەنتەنییەی گـــەلی کـــورد دویـــن
له بـــۆ پـــێشکەوتن دەبـــیٚ یـــەک گـرین
له لێـــژنه و له کـــۆڕا بـــه راوێـــژ و تـــین
له بـــۆ تـــۆڵه ســـەندن گـــەلی کـــوردی ژێـــر
له داگـــیرکەری دەن دەبـــیٚ گش بـــه شـــیر
گـــەلیٚ قـــارەمانی گـــەلی کـــورد زمـــان
له بـــۆ ســـازمانی ســـیاسی دوان
بـــەدیهێنەرانـــی گـــەلێکن بـــەرێز
وەکـــوو شـــێخی شـــەمزین له نێو گـــەل بـــەهێز
له عـــێلی بـــەدرخـــان عـــەلی مـــەرد و رەنـــد
شـــەریف پـــادشا بـــوو وەکـــوو ئـــاوی مـــەند
بـــناغەی بـــه دەس وان لەویٚ دانـــرا
له مـــێژوو گـــەلیٚ نـــێو لەوان نـــووسرا[2]

---

۱ـ ئەمیر بەدرخان پاشا له ساڵی ۱۳۲۷ له عومری ۱۸ ساڵیدا بـووە ئـەمیری جزیرە و بـۆتان و عـەشایری هەموو کردە یەک و ئەسڵەحەی زۆری کری بەڵام ئاسووری بۆتانی کورد ئیتاعەتیان لیٚنەکرد و ئەویش تەمبێی کردن، هەر بۆیە چەند دەوڵەتی ئورووپا (ئینگلیس و فـەرانسـە) و عـوسمانی وەجـواب هـاتن و لەشکرێکی زۆری عوسمانی هێرشیان برد و به هۆی خەیانەتی خزمی خۆی شکا و دوای بەینیٚ مرد و له دمێشق دەفن کرا.

۲ـ هەوەڵ سازمانی سیاسی کورد له ساڵی ۱۹۰۸ له لایان سەرۆکانی ئەو زەمانەی کورد بناغەی دارێژراو له ساڵی ۱۸۸۷ مدحەت بەیگ بەدرخان هەوەڵ مەجەلەی کوردی به نێوی کوردستان له قاهیرە بلاّوکردەوە که به توندوتیژی له سیاسەتی عوسمانی له کوردستاندا رەخنەی دەگرت. هەر لەو زەمانەدا یانی له ۱۸۸۹ حزبێکی سیاسی تازە له تورکیە به نێوی (کمیتهٔ اتحاد و ترقی) پێک هات که سەرۆک و زۆربەی ئەندامی تورک بوون و چەند مرۆڤی سەرشناسی کورد وەکوو ئیسحاق سکووتی و عەبدوڵلاّ جەودەت و شێخ عەبدولقادر نەهری و عەبدوڵلاّ بەدرخان و حیکمەت بابان هاوبەشیان تێداکرد بەڵام له ساڵی ۱۹۰۸دا به هۆی ئەمین عەلی بەدرخان و شێخ عەبدولقادر شەمدینان و شەریف پاشا و ئەحمەد زلفین پاشا (جـمعیت

⇐

# شۆڕشی ئاراڕات (ئیحسان نوری)

بــە مــێژوو دەزانــین کــەوا ئــەرمەنین
لەگـەڵ کـوردەکـانن بـە دوستی ئـەمین
لەوێ نـــوری پـــاشا کـــەدی رۆژگـــار
بــە قــازانــجی وانــە بــوە شـێری غـار

⇐ تعالی و ترقی کردستان) و هەروەها جەمعیەتێکی دیکەیش (جمعیت نشرمعارف‌کرد) پێک هات و لە پاییزی ١٩٠٨ باشگای ئەمین عەلی بەدرخان مجلەی (تـعاون و تـرقی) بـلاوکـردەوە و پـێک‌هێنەرانـی ناسیۆنالیستی کورد بریتی بوون لە نەوە و نەبیرەی بەدرخانی و فەرمانڕەوایانی سۆران و بابان و جێ نشینان و کوڕی شێخ عوبەیدوللا ـ شێخ‌عەبدولقادری شەمدینان و دوو ژنراڵی کوردنژاد بـە نـێوی شـەریف‌پاشا و لوتفی‌پاشا و چەند نەفەری دی لە ئەشرافی دیاربەکر و لە ١٩٠٩ سەرۆکی‌لیژنە ی اتحاد و ترقی هەرچی وەعدەی بە کورد دابوو لە ژێر پێی نا و دەستی کرد بە سیاسەتی تورک‌کردنی کورد و تـەواوی بـاشگا و رۆژنامە و مجەللە و مەدرەسەی کوردی بەست و لە ساڵی ١٩١٠ خەلیل خەیاڵی و زەکی ئەفەندی کۆمەڵێ ساز دەکەن بەنێوی (هیویا) کە لە مووسڵ پێیان دەیانکوت هیوا ، لە پاشان لە ساڵی ١٩١٤ جەنگی جەهانی هەوەڵ بە سەرداهات و سوێندخۆرەکان سەرکەوتن و عوسمانی شکا و بەش‌بەش کـرا. بـەشێکی زۆر لە کوردستان کەوتە دەس سوێندخۆرەکان (ئینگلیز، ئیتالیا، فەرانسە) و سەرۆکانی کورد بۆ وەرگرتنی مافی میللەتەکەیان وەخۆکەوتن و ئەو دەوڵەتانەیش ئیجازەیان پێ‌دان لە کونفرانسی ئاشتی پاریس بەشداری کەن و وتار و خواستی خۆیان بڵێن و بەنا بە وەعدەی پرێزیدێنت ویلسن و ئیعلامییەی ئینگلیز و فەرانسەکاتی ئازادی تەواوی کورد گەیوە جا کۆمەڵی بەرزی کورد ،کۆمەڵی جێبەجێ‌کردنی کاروباری کـۆمەلاّیەتی ، کۆمەڵی سەربەخۆیی کورد هەموویان کۆ بوونەوە و شەریف‌پاشایان لەبەرچاو گرت کە بچێ لە فەرانسە لە کۆنگرەی ئاشتی قسە لە سەربەخۆیی کورد بکا و ئەویش لەوکاتەدا باش و زانایانە لەگەڵ تـەواوی ئـەو دەوڵەتانە و سوفەرا و کاربەدەستەکانیان باس و گفت وگـۆی کـرد و لە ٦ی فـێوریەی ١٩١٩ لە بـارەی حقووق و مافی کورد تەزکاریەیێکی بەرەئیسی کۆنگرەی ئاشتی دا و داوای کوردستانێکی خودموختاری بە سێ بەندی ٦٢ و مادەی ٦٣ و مادەی ٦٤ کرد و لە کۆنگرەی ویست ئەو مادانە تێکلاّو بە پەیمانی سێڤر بکەن کە لە ١٠ی ئاگوستی ١٩٢٠دا بڕیاری لە سەر درا و بە حکوومەتی عوسمانیش ئیمزاکرابوو و لەو رووەوە کۆنفرانسی سوڵح رایگەیاند کە کورد میللەتێکن زۆر و مافیان هەیە لە وڵاتی خـۆیان سـەربەست بژین و پێویستە لە باشووری ئەرمەنستان و باکووری کەوشەنەکانی تورکیە و سووریە و عێراق کە نیشتمانی کوردانە، خودموختار و سەربەخۆ بن بەلاّم بەو شەرتانە کـە لە خـەڵکی وڵات و نـاوچە پـرسیار کـرێ و زۆربەی دانیشتووانی ناوچەکە بڵێن لە تورکیا جیا دەبینەوە و کۆمەڵی گەلانیش پێیان وابێ کورد دەتـوانـێ خۆی ئیدارەکا و سەربەخۆ بێ.

لە شـاخ ئـارەڕاتـۆ لە بـاکـووری وان
هـەتا دێتە بتلیس لە ژێـر چـۆکـی نـان
ئـــەتاتورک زانـــی ئـــەوانــە بــەشیر
وەکوو شێر بە هەڵمەت، دەچن بوو نەچیر
لە هــەرکـوێ ببن وان لە داگـیرکـەران
لە ســەربازی تـورک و سپایی و سـەران
دەیـان کـەن ئـەسیر و دەیـانبەن بـە دیـل
دەبـن عـێلی تـورکان بـە دەسیان زەلیـل
ئـــەتاتورک زانـــی لە ســەر ئـاراڕات
کە ئاڵا، شەکەی دێ لە بـۆ ریـێ نـەجات
بـە فـەوری بـە ڕاویـژ لەگـەڵ پـەهلەوی
لەگەڵ یەک بوو سازان بە بازووی قەوی
لە هــەر لاوە وێگــرا بــە هــێرش بـرۆن
گڕی دەن، گەلی کورد، وەکوو داری کۆن
گڕی شەڕ بۆ رۆشـن لە مـەە مـانگی بـوو
ســپای دەوڵـەتی گش لە نـێو قـانگی بـوو
لە دەوڵەت ئەسیر بوو نـزیک دوو هـەزار
موسەلسەل بە دەس هـات گـەلێ بـێشمار
دوازدە فــڕۆکـەیش سـەرەو خـوار کـرا
گـەلی جـەندەکـی وان لە خـوێن وەردرا
سپا لەشکـری تـورک لە هـەر لاوە هـات
لە بۆ شەڕ لەگەڵ کورد لە شـاخ ئـارەڕات
بــە نـێۆ شـێو و دۆڵـا لە نـێو بـەردەڵان
بــە تــۆپ و مـوسەلسەل دەهـاتن ئـەوان
هەتاکوو لەکورد دەن لە حەوشەی جیهان
نـــەیێڵن بـــمێنێ نـــژادی ئـــەوان
دەبـــینرا فــڕۆکــەیش لە روی ئـاسمان
مـــناڵی دەســـوتان لە شـاخ و تـەلان

له ئەشکەوت و جەنگەڵ نەما جێی ژیان
هــەموو بــوو، بـه ئاور بـوه مـەشخەڵان
له هەر لاوە گـولله لە بـۆ، کـورد دەهـات
وەکوو تەرزە باری له هەرکـات و سـات
بـەڵام کـورد له سـەنگەر نـەبو دەرکـەوێ
وەکـــوو ســـەدی پــوڵا دەمـا تـا شـەوێ
له نـێو خـاکـی بـاپیر، وە ئـەجدادی خـۆ
شەری کرد گەلی کـورد بـبێ سـەر بـەخۆ
له رۆژی دوهـــــەم دا له ئـێران زەمــین
له بۆ کوشتنی کـورد سنوور بـوو کـەمین
لەوێ ئــەرمەنی دێ دەکـوژرێن هـەموو
نــەیان مــا هـومێدێ، بـه قـەد تـاڵه مـوو
به هۆی وەی بوو رۆین له شاخ ئاراڕات
نەیان کرد لەگەڵ کورد له بۆ خۆ خـەبات
له هەر لاوە هێرش له بوو کـورد دەهـات
له نــێو دایــرەی مــا، نـەما، رێ نـەجات
لەگەڵ وەی تەواوی گەلی تورک ئـەهات
بــه یــاجوج و مأجــوج دەگــیرا وڵات
به نیزە و بـه خـەنجەر لەت و پـەت کـرا
له پـــیر و له مـــنداڵ ســـەری فــڕدرا
کوڕی کورد بوو دەیدی کە خوشک و برا
له لای یــەک بـه نـێزە هـەمووی جندرا
بـــــه ئــــیحسان نـــوری خـــەبەر وادرا
له روس و قشـون دێ بـه چـەک رێـخرا
له بــاکـــوور ئــاراڕات ئـەوا دێـته سـەر
هــەتاکــوو نــەیێڵی لەکـوردێکی سـەر
بـــرای ئــاریا بـــوو له لای رۆژ هــەڵات
گەلێ کۆمەکی کرد بـه تـورک و بـەتات

ئــەمە بـاسی کـوردە لە ڕێگـەی خـەبات
لە ژێــــر گــوللە بــاران مــناڵێ دەهــات
دەپــــاڕاوە ئــەو بــۆ، ژن و بــابی پــیر
بــرابــمکوژە خــۆت نــەبم بــا ئــەسیر
زگــی ژن بـە خـەنجەر لەت و پـەت کـرا
مــــــناڵی بــــە نــــێزە لە وێ فــــڕ درا
کـــــە ئـیحسان نــوری شکــا شــۆڕشی
ئــە ئــەم کــاریکاتور بــە خـەتی کشـی
لە ســەر کـێلی قـەبرێ لە سـەر ئـاراڕات
بە تورکی بوو نووسراگـەلی کـورد وڵـات
بــە ئـازادی ژیـنتان بـە وەهـمە و خـەیاڵ
لە ئــەم قـەبرە دفـنە هـەموویشی بـە تـاڵ
بــە ئــازادی ژیـنی گـەلی کـورد تـەواو
لە ئــەم قـەبرە دایـە مـەکـە فکـری خـاو
دەنــووسرا دەبـینرا لە زۆر جـێی وڵـات
هــەموو کـوردە دفـنن لە سـەر ئـاڕەڕات
لە تــاریخی «کـەنداڵ» دەنـووسێ لە وان
بـە تـورکێکی کـێوی لە کـورد نـێو بـران
بـــــە قـــانونی پـــنجا کـــە ڕەئـیی درا
لە هــەر تـورکی کـێوی سـەری گـەر بـرا
کــــەسێ نـابێ بگــرێ ئــەوەی قـاتڵە
کە چون خوێنی کوردان هـەمووی بـاتڵە
لە بەر چـی بـوو «ئـاوێر» ئـەوان وا ژیـان
بە یەک بوون، دەهاتن لە بۆ کـورد قـران
لە نێو کوردی زۆرە (بە مـن چـی) دەڵـین
ئەوە بوو بە هۆ کورد لە نـێو خـوێن بـنێن

حمید
اسماعیل
عبدالله
عبدالقادر
سید فاروق
سید طه
سید عبیدالله
سید ابراهیم
سید محمدصالح
عبدالقادر
عزیز
هەڵگورد
سیدموسی
محمد
عبدالله
عبدالقادر
محمد صدیق
عبیدالله
سید مصلح
سیّد طـه
طه
سعدالدین
عثمان
فیصل فهیم
علاءالدین
احمد
صالح
ابراهیم
حاجی
محمّد
ابراهیم
عبدالله
حاجی
ابوبکی
عبدالعزیز
حضرت سید
عبدالقادر
گیلانی
مظهر
احمد صدیق
حاجی
عزالدین
صالح
عبدالله
احمد
سید انور
سید کاظم
سیدرحی‌الدین

# شۆڕشی شێخانی شەمزین (١٢٤٧ ـ ١٣٠٣ هق)

لە شێخانی شەمزین بە حەق سەید تەها
لە عیرفان وعیلما تەواو بوو دەها
کوڕی ئەو بە ئولولئەمر ناسرا
بە پیری تەریقەت عوبەید(اللە) نێو برا
نەوەی غەوسی بەغدا لە شەمزین ئەبوون
هەبوو مەردی رابەر لەڕێی حەق دەچوون
لە وەختێ کە شێخ دی ئەوا زوڵم و جەور
لە عوسمانی، قاجار، دەبارێ لە هەور
سەفیری دەناردن لە بۆ لای ئەوان
ئەوا زاڵەیی کورد چوە ئاسمان
هەتا کەی نەوەی ماد نەوەی کەیقوباد
بناڵێ لە دەستان نەبێ عەدڵ و داد
بە ئینگلیس و رووس و خەدیوی میسر
دەگوت کورد نەجات دەن لە دەس کوشت و بڕ
سەفیری دەناردن لە مەکەی شەریف
هەتا کۆمەکێ کا بە کوردان شەریف
هەتا یارمەتی دەن کە کورد سەربەخۆ
بژی وەک ولاتان لە هەر شار و کۆ
هەتاکەی بە تاڵی ژیان بەرنە سەر
لە ماڵی وەدەر نێن ببێ دەربەدەر؟
هەتاکەی بناڵن لە نێو شاخ و دۆڵ
لە نێو چادرا بن، لە نێو خاک و خۆڵ
بزانن مەچەکمان لە پۆلای قەوی
سەری ناحەزی خۆی دەدا لەو زەوی
ئەوا چاکی مەردی بە لادا دەکەین
لە بۆ مافی خۆمانە هەڵمەت دەبەین

لەگــــەڵ زۆر ســــەفیری ئــورووپا دوان
بە هەر یەک لەوانی دەگـوت کـورد زمـان
جـــوامـــێر و پســپۆر گــەلی ئــاگــەدار
نــەترس و بــە جــەرگن هــەموو هۆشیار
گــــەلی کــورد لە ریشــە و نــژاد ئــاریان
لە بـــۆ ســـەربوڵندی بــە پـیاویی ژیــان
لەگەڵ مـلهوڕی کـرد شـەڕی خـۆ بـە شیر
لە مـێژوو دەبـینی بــە نـیەخشە و بـە بیر
لەگــــەڵ نــــەینەوا و لەگــــەڵ بــــابلا
شــەڕی بــوو کــە دوژمـن لە شاخ دا تـلا
بــە نــێزە و بــە خــەنجەر گـەلی قـارەمان
فــــەلەستینی ســــەندۆ لە داگـــیرکەران
لە تـــیر و کـــەوانــی دەتـرسا مــەغوول
نەبەردانی کورد بوون هەموو شیر و غـوول
بـپرسە لە سـەردار «گـزنفون» کــە هـات
هــەتاکـۆمەکـێکی بــەکـوورش بکـات
گــــەڕاوە لەگــــەڵیا دە جــاران هــەزار
لە چەکداری ئەسپارت هەمووی شێری غار
لەوێدا لەگەڵ کورد کە بـوون روو بـە روو
وەکوو ئەژدەهاکـورد دەهـات و دەچـوو
بە هـۆی وەی لە تـاریخ دەنـووسێ جـواب
بــــخوێنۆکـتێبی بــە زۆر ئــاب و تــاب
لە کــوردان گــەلێکن زریـنگ، وردەکـار
هـــــەموو زۆرزان و ســــیاسەتمەدار
وەکوو شێری جـەنگەڵ لە مـەیدانـی شـەڕ
لەبـۆ دەسگــری هـەن وەکـوو داری بـەر
ئــەگــەر وایە بۆچی گـەلی کـورد زمـان
بــــە بـــێ ســەربەخۆیی دەبـینی ئــەوان
بە هـۆی وەی کـە راسـتە لە خـۆشباوەڕی
لە جــــەبهەی ســــیاسەت نـیيە یـاوەری

گـەلێ مـیری کـوردان لەوێ خـڕ دەبـوون
لە رووی نـەخشەوە وان لە بۆ شـەڕ دەچـوون
بـە دەنگـی تـەپڵ بـوو کـە شاخ و تـەلان
دەهـــاژاو و نـــاحەز لەوێ داپـــژان
لەوێ لەشکـری شێخ وەکـوو بـەرقە چوون
بـــە هـۆی وەی ولاتـن بـووە رۆژی روون
بـــە شـــمشیری پـۆلا بـە گـورزی گـران
چـــیا و جـــەنگەڵی وی هـەموو لێک دران
لە ئـــــەڵماس رەگـــی وان تـــەواو داڕژا
نـیيە هـیچ بـە پـێویست کـە قـەڵغان هـەژا
زرێـی بـەرگی وانـە ئـەگـەر شـەق بەرێ
زرێـــی بـــازووی وان کـــەقەد نـــاپەڕێ
سپای شێخی یەک یەک بەسەف هات و چوون
کـە هـەریەک لەوانـە بـە تـەن بـێستوون
لە هـــەر لا دەهـــاتن لە شـــاخ و تـەلان
لە دەشت و لە جـــەنگەڵ لە نـێو بـەردەڵان
لە قـــەندیل و کـــانی خـــوداوە دەهـــات
چـــیای رەش بـــە نـێزە بـریقەی دەهـــات
لە چەکداری گەل بـوو وەکـوو خـیز و خـۆڵ
دەهـــاتن لە شـــاخ و لە دەشت و لە دۆڵ
بـــە هـەشتا هـەزارێ لە چـەکـداری مـیر
بـــەرەو خـــاکـــی ئـێران دەهـاتن دلێـر
لە ژێـــر پـــێی ســـوارا دەلەرزی زەمـــین
زەمین گش هەواکەوت هەموو چین بە چین
بـــریقەی زرێ بـــوو لە بـــەر پـــاڵەوان
لە زێـــو داڕژا بـــوو کـــەل و کـێو تـەلان
ئـەگـەر شـێر و بـەبر و پـڵینگ بێنە پێش
بـــە بـاهۆی ئـەوانـە دەبـن ڕێش و مـێش
لە خـــانێ و شـــنۆیێ لە ســـابلاغ تـەواو
سـپای شـێخ بـوو رۆیـی هـەتاکـوو بناو

نــەبوو کــەس وزەی بێ لە مــەیدانــی جــەنگ
بــە ســورعەت دەڕۆیــی سپا وەک پڵەنگ

بــــە شـــێر و بــە خــەنجەر مــەغز داپــژان
لە نـــێو خــوێنی وەربــوون گــەلێ پــاڵەوان

بـــە چـــنگاڵی پـــۆلا بــڕست یــان بــڕین
لە هــەر لاوە بــۆ وان بــە چــەک راپــەڕین

لە بـــۆ کـــوشتنی کــورد گــەلێ خــۆفرۆش
لەگــەڵ زاڵــما بــوون بە حــرس و بە جــۆش

لە نــــێو خــــۆفرۆشان هـــەزاران نـــەفەر
بــە دیــلی دەگــیران دەبــوون دەربــەدەر

چکــەی خــوێن دەبــاری لە جــێی نێزە تیر
زەوی گـــۆمی خــوێن و لیــباسیش حــەریر

مـــەراغـــە لەگــوڕە و لە نــەعرەی ســوار
دەســـــوتا ئــەوەی بــوو لەوێ بــەرد و دار

بــــە لێـــــدانــــی رم بــوو لە نــێو جــەنگەڵا
لە نــــێو هــــەڵمی خـــوێنا دەبــاری بــەڵا

لەبـــەر زەهــری نــێزە بــە زەهــر ئــاو دراو
تکــەی زەهــرە بــاری لە هــەور و لە ســاو

عـــەشایر دەهـــاتن بـــە تــەقڵە و جــلیت
مـــەراغـــە کـــە گـــیرا لە تــاریخە دیت

بــــە شـــالاوی لەشکــر بــەکــێشانی شــیر
لە ئـــاژاوەچـــی بـــوون گــەلێکی ئــەسیر

لەوی راپـــــەڕیبوون بـــزووتن بـــەیان
کـــە تـــەورێزی بگــرن بــە رۆژی عــەیان

لەوێـــدا بـــوو لەشکـــر وەهـــا راپــەڕی
کــە تــەورێز ئــەلەرزی لە حــەملەی شــەڕی

لەوێ دەم خـــەبەر هــات ســپایی بــە ســام
لە شـــاخ و لە ســـەحرا لە جــەنگەڵ لە بــام

وەکـــوو بــەرگی دار و گــەڵای داری شــین
دەبــینرا زرێــپۆش دەهــات چــین بــە چــین

لە گش شـــاری ئـــێران تـــفەنگچی بـــرا
چـــەک و جـــبیەخانە لە جـــەبهەی کـــرا

لە هـــەر لاوە رێـیان لە کـوردان ئـەبەست
تـەواو دەوری دا، رم، لە گـەڵ شیر بـە دەست

هـەتاکـوو ئـەسیر کـەن لە مـاد لەشکـرێ
نـــەیێڵن کـــە دەرچـــێ لەوانـــە بـــڕێ

بـــەلاّم ئـەو خـەیاڵە خـەوێ بـوو دیـان
کـە قەت نـاکـەوێ شێر بـە حەملەی ئەوان

ئـەبوو مـوسلمی کـورد لە کـوێ گـیر درا؟
دە «شـــاوێر» تـــەماشا لە کـــوێ نـووسرا؟

بـــە شـمشیر و نـێزە بـە گـورز و کـەمەند
لە ئـــەلبورزی دایـــێ لە بـن هـەڵیەکـەند

لە عـــوسمانی ئـــێران لە دەشت و تـــەلان
وەکـــوو بـای شـەماڵ وەکـوو خـیزەلان

ســـپا و لەشکـــری وان لە هـەر لاوە هـات
هـەتا لەشکـری شـێخ نـەبێ رێـی نـەجات

ســـپایێکی وا بـــوو کـە ئـەلوەند و قـاف
بـە نـێزەی ئـەوانـە دەبـوو رێک و سـاف

ســـپایێکی ئـاور کـە هـەرکوێ دەچـوون
لە پـــۆلاّ و ئـــاسن هـەمووی ئـاوە بـوون

ســـپایێکی وا بـــوون لە هـــەر سەرزەمین
لە بـــەر شـــیری وانـــە بـە وێـڕا ئـەدین

نـیزیک بـوو بـە تـەورێز کـە هەر دوو سپا
لە یـــەک رادەمـــان و وەکـوو ئـەژدەها

هـەناسەی تـفەنگچی هـەوای کـردە هەور
دەســـووتا ولاّتـــێ بـە شـمشیری جـەور

کەمەند ئـەژدەها بـوو لە دەس کـورد لە پـێش
ســـەری پـــاڵەوانـــی دەهـێنا بـە کـێش

لە بـــارانـــی نـــێزە و لە تـەرزەی کـەمان
نـــەماکـــێوی پـــۆلاّ نـــەما پـــاڵەوان

بـڵێسەی بـوو ئـاور لە سـەر مـەوجی خـوێن
نــەما چــەک بــەدەست و نــەما بۆی شـوێن
وەکــوو بــەرقی هــەور و لە چــەخماخەدان
لە دووی بــێ ڕەزا بــوون گـەلی کـورد زمـان
بــە شــمشیری تــیژ و بـە گــورز و کــەوان
لە یــەک وەردەبــوون وان تــەواو بێ‌وچان
لەوێ دەم لە دەم شــــیر، زەهــــر داتکــــا
بــە ســەر قــەلبی داگــیر، کــەرانــدا چکــا
لە شــەڕدا بــوو خـوێن بوو لە خۆی وەردرا
تــەواو گــوڵی ورمــێ بە خـوێن سوور کـرا
بــە فــرمێسکی چــاو و بـە خــوێنی بـوێر
تــەواو گــوڵی ورمــێ بـبوو سـوور و سـوێر
لەوێ دەم بــــوو شــێخ دی نــییە دەوڵــەتێ
کــــە وا یــــارمەتی دا لە شــوێن و خــەتێ
بــــە فــــەرمانی ئــــەو بــوو سپا هــاتەوە
هــــەتا جــــارێ دیکــە، وە ڕێــی خــاتەوە
ســــپا و عــــەشایر تــــفەنگچی نــەهەنگ
بەرەو خــاکــی شـەمزین دەچـوون بێ‌درەنگ
بــــەڵام وا بــــوو دوورۆ خــرا، بــۆ حــیجاز
لە مــەککــەی بـوو جـێگیر بــە ڕاز و نــیاز
لەوێ بــــوو وەفــــاتی بــــە ڕۆح جــاودان
لە بــــۆ ســــەربەخۆیی گــەلی کــورد ژیــان
بـە هـۆی وەی دەبینین لە هـەر جێ و زەمـان
زمــــــانی ســــپاسە لە بــــۆ فکــــری وان
بــــەڕێزە پــــلەی وان کــــە وا بــیری کــرد
لە بۆ کـورد لەگـەڵ خـۆی بـۆ گـڵکۆی دەبـرد
بە هۆی وەی کـە مـافی گـەلی کـوردی ویست
بــــەڵام لەو زەمــــانە نــەبوو گــوێی بـیست
بە سـەد سـاڵ لەپـێش بـوو بـە بیر و بـە هـۆش
لە چــەکــداری کـوردان لەگـەڵ شـەڕفرۆش

بــە ســەرمەشقی ئــەو بــوو گــەڕاوە کــوڕی
لە تــەبعیدی مــەککــە ئــەویش زوو گــوڕی

ســەناتۆر بــوو وەخــتێ بــە ئـەو فکـرە هـات
هـــــەتا رۆژنـــــامە لەوێ چـــاپی کـــات

بـــەنێوی هـــــەتاوی [دە]کــورد رێکخــرا
وەکـــوو ســـــەفحەیی زێـــــڕ بـــلاّوۆ کــرا

ئــەوە شــێخی نــەهری نــەوەی ســەید تــەهان
لەگـــــەڵ شــێخ مــحەمەد کــوڕی قــارەمان

وەکـــوو رۆســتەمی کــورد دیــاکــۆی زەمــان
بـــە مـــەردی دەکــۆشان لە بــۆ نــیشتمان

دەبـــــینی کــە «ئــاوێر» بــە ئــاوی حــەیات
دەنـــووسێ بـــزانـــن گــەلی کــورد ولاّت

بـــەدەستی ئــەتاتورک ئــەوان گــیر خــران
لەبـــــــەر مــــافی خـــۆیان لە دارێ دران

بــزانـــن ئــە وانــە شــەهید بــوون بــەلان
لە تــــــاریخە مــــافی ژیـــانی ئـــــەوان

لە دیـــوانـــی شــێخی بــە رستەی عــەیان
دەبــــینرێ گـــولاّڵە لە بــــاغی مـــــەعان

گـــــەلێ رێـــزی دانـــا بـــە بــیر و بــەیان
لە بــۆ مــیللەتی کــورد لە ســەر رووی جــیهان

لە بـــەروەی بــزانــین کــە فکــری ئــەوان
بـــە پـــرشنگێ روونــاک دەکــا ئــاسمان

دەبـــێ مـــــەسنەوی ئـــەو پـــیا چــینەوە
هـــەتا گـــــەنجی مــانای وەدەس خــەینەوە

بـــە شـــــانازی «ئــــاوێر» بـــزانــە ئــەوان
لە مــــــێژوو بـــەڕێزن لە بـــۆ نـــیشتمان

# «سوڵتان سەلاحالدین»

لە وانـــەی بـەبیرن لە مـێژو و هـونەر
بــە وردی دەزانـــن وتـار و خـەبەر
لە بـۆ وانـە روونـە لە مـیسر و لە شام
کـە ئـەیوبیانی گـەلی کـورد بە سام
بـە شـایی ژیـان و بـە عـەدڵ و بە داد
لە وەیـدا عـومەر بـوون نـژادیش لە ماد
بـــە گـــرشە و شکـۆوە لە دنـیا ژیـان
بـــە پســپۆڕ و دوورنـاس بـرا نـێویان
لە هـــۆزی روادی لە شـاری «دویـن»
لە دایکـی بـوو «شـادی» لەوێـدا دوێـن
لە نـاوچەی «چـێچستا»لە ئـەرڕان ئـەوان
دەڕۆیـــن کـەمێکی لە بـەغدا دەمـان
لەوێ‌را، بـوو رۆیـن لە «تکـریت»ێ مـان
ســـەڵاح هـــاتە دنـیا لە وێـدا ژیـان
لەوێ‌ڕا بــوو «شـادی» دەرۆیـی لە شام
دەبوو نیشتە جێ ئەو لە روی هۆش و فام
لە گـەڵیابوو، دوو کـوڕ دوو شـێری ژیـان
یەکەم نـەجمەدین بـوو هـەڵوی تـیشەڵان
برای چووکە شێرکۆ، وەکوو بەورە هات
هـەتا دوژمـنی مـاد لە ئـەرزێ بـدات
کوڕی نەجمەدینە سەڵاح (الدین) قارەمان
ئـورووپایە شـاهید نـەبەز بـوون ئـەوان
لە کـوورەی زەمـین و لە تـولی زەمـان
بـە هـۆشی وەهـاکـوا لە کـوێ بـینران؟
لە شام شێرکۆ بـوو بـە سـەرداری هـەنگ
لە مـیسرابـوو «عـازد» لە گـیری فـەرەنگ

لە وێـرا بـوو شـێرکۆ کـە هـاواری هـات
لە دەس دوژمـنانی، دەدا، زوو، نـەجات
بـە هـێرش دەرۆیـی لە بـۆ خـاچیان
لە شـار و لە دێـهات لە تـاش و تـەلان
وەکوو مەوجی دەریا هەموی لێک دەدان
قـەڵای نـاحەزانـی، هـەمو تـێک دەدان

## وەزارەتی شێرکۆ

وەزێـریکی (عـازد) کـە (شـاور) بـوو زوو
بـە پـیلان و نـەیرەنگ لە ئـەو فکـرە بـوو
کـە شـێرکۆ، وە هـۆزی بـە حـیلەی تـەواو
لە بـانگێشتنێکا بـە قـەدر و بـە تـاو
بـەگـۆپاڵ و خـەنجەر بـە نـێزە و کـەوان
لە نـێو خـوێنی وەردا دڵ و جـەرگی وان
کـە داو و تـەڵەی ئـەو ئـەواکـەوتە روو
سەلاح(الدین) گرتی فەوری بە رێی کـرد زوو
خـەلیفەی زەمـان (عـازدی) کـارزان
بـە دەسـتووری ئـەو بـێ مـوجازاتـی وان
خـەلیفەیش ئـەوی نـارد هـەتا شـێرکۆ
سـەری لێ جـوداکـا بـە شـمشیری خـۆ
وتـی لێکـەوە زوو لە (شـاور) سـەری
بـنێرە لە بـۆ مـن نـەمێنێ شـەڕی
بـە دەسـتوری عـازد مـرۆڤی کـارزان
نـیشانەی وەزیـری بـە شـێرکۆ دران
کە دوو مانگ وەزیر بـوو لەگـوڵزاری ژیـن
لە پـڕ شـەختە لێـیدا خـرانـێو زەمـین
گـوڵی عـومری کـاتی کـەوا هـەڵوەری
سەلاح (الدین) بوو لە جێی وی لە بۆ داوەری
بـرازایـی وریـا، قـەوی وەک نـەهەنگ
لە جێی ئەو بوو جێ گر لە بۆ سولح و جەنگ

# وەزیرایەتی سەلاحالدین

لە مـــاوەی کـــەمێکا تـــەواوی وڵات
هـەمو کـەوتە دەستی بە بۆنەی خـەبات
لە شـامۆ بـوو بـابی بەرەو میسرە هـات
هـــەتا شـێرە رۆڵـەی، مـولاقاتی کـات
ئـەوا یـوسفی مـیسر بـەرەو پیری هـات
کـــە یـەعقوبی بـابی لە ئـامێزی خـات
کوڕ و بابی کوردیش بە یـەک شاد بـوون
گوڵی شادی باری، کـە بۆ مـاڵ ئـەچوون
بـە بـابی دەکـوت تـا بـە دڵ لێ بـرێ
وەزیـــری لە مـیسرا بـە عـۆدەی گـرێ
ئـەویش بـێتە فـەرمانبەری بۆ خـەبات
بـە فـەرمانی بابی هـەموو کـات و سات
بـەڵام بـابی هـوشیار کـە دی ئەو کـوڕە
بـە جـەوهەر هـونەرمەند، سـەراپادوڕە
دەبـــینرا شکـــۆهی لە ئـــایەی مـەجید
لە ســـورەی فـــەتح دا لە بأسٍ شـــدید
ئـــەئەو ئـایە دەربـارەی کـوردە هـات
تـەماشا کـە تـەفسیر لە زۆر جـێی وڵات
کـــڵاوی ســـەعادەت لە ســـەریا خـەڵات
لە سەر چەرخـی ئـەتڵەس بریقەی دەهـات
بـــەڵام بـابی هـوشیار بـەوی کوت ئەمن
دەزانـــم ئـــەتو هـەی مـرۆڤێ مـەزن
وەزارەت مـوبارەک بـە تـۆ سـەر بـڵەند
بـژی تـۆ لە دنـیا کـوڕی مـەردو ڕەنـد
لە قەرنی شەشەم دا لەوی شەست و حەوت
رەوانـی خـەلیفەی وە سـەرعەرشی کـەوت

# سەڵتەنەتی سوڵتان سەلاح‌الدین لە میسر دا

لە دوی فـــەوتی عــازدکـــە بـــوو فــاطمی
سەلاح (الدین) بوو لە جێ ئەو لە بوو حاکمی

لە حـــەول و تـــەقالا لە مـــەردایـــەتی
لە هـــۆش و فـــەراســـەت لە فـــەردایـــەتی

کـــەسی لنگـــەیی ئـــەو لە دنـیا نـــەبوو
بـــە پـیا چـوونی مـێژوو دەزانـــی چ بـــوو

ئـــەوەی خـاچ پـەرس بـوو لە هـەرلاوە خـڕ
لە تـــاڵانی خـــەڵکی دەبـــوون تـێڕ و پـڕ

لە بـەرووەی بـوو لە شکـر هـەموو دەنگ درا
لە هـــەر لاوە هـــێرش لە دوژمـــن کـــرا

لە بـــەرووەی بـــە پـــاکـی بـمێنی وڵات
ئـــەوانـــەی وەدەرنـــا بـــە شـیری خـــەبات

لە ســـەیدا و بـێروت کـــە ســـەرکەوتە سـەر
لەوێ گـــۆی لە مـــەیدان، بـــە شـەڕ بـردە دەر

یـــەمەن نـــاصریە لە گـــەڵ بـــەعلەبەك
لە دەس خـــاچیانی دەســـەندۆ بـــەچەك

لە ســـەر نـــێزە ســـوڕا، ســـەری پـــاڵەوان
لە نـــێو خـــوێنی گـــەش‌دا دەنـاڵێ رەوان

بـــە شـــمشیر و (مـــنطق) گـەلی قـەومی مـاد
وڵاتـــی هـــەمو شـــوشت لە زوڵـــم و فـــەساد

سەلاح بوو «الدین» بە ئەرکی دەزانی خـەبات
هـــەتا دوژمـــنی گـــەل لە ئـــەرزێ بـــدات

## سەڵتەنەتی سوڵتان سەلاحالدین لە شام دا

کــە شــا نــورەدینیش لە ســوریە مــرد
سەلاح(الدین) بوو لە میسرۆ مشاوریە برد
بەرەو سوریا چوو وەکوو شێری مەست
بە داوخوازی خەڵکی ئەوێی گرتە دەست
چوو ئەو لە بۆ میسر لە ئەم لا فەڕەنگ
لە شــامی رژان و، بــوە شــەڕ نـەهەنگ
بـە تـاڵان وکـوشتاری خـەڵکی خـەریک
لە دیــل و ئـەسیریان دەدا مست و پیک
گــەڕانــۆ لە بــۆ شــام سـەلاحی بە بیر
هــەتا تــێک شکــێنی ئــەوانە بە شیر

## شەڕی رەملە

صلاحالدیـن لەشکـری بـەرەو رەمـلە هـات
لە پڕخاچی دەریـا، وە نـێو خـۆی دەخـات
لە رەمــلە دەســی کــرد بـە شـەڕ قـارەمان
شــەڕیی نــابەرابــەر لە بــەرگەی زەمــان
بـــەڵام کــــێویی پـوڵا بــوایــێ لە بــەر
بـــە یــەک نـێزە پـایەی دەهــێنایە دەر
لەوێ رۆژ بە شەو بوو شەوێش بوو بـە رۆژ
لە بـەر تـۆز و خـوڵ و لە بـەر شیر و مـۆژ
زەمــین بــوو بـە هـەورێ لە روی ئـاسمان
لە جــێی تــەرزە بــاریبوو نــێزەی ئــەوان
بـــریقە و بــروسکەی لە چــەخماخە دان
لە نـــێو رەعــدی نــێزە و لە شـمشیری وان
دەبـــینرا دەبـــاریی ســـەریی پــاڵەوان
لە شەڕ وەحشـەتی بـوو سـەراسـەر جـیهان
وەک ئـــەستێرە دەڕژا لە هــەر لاوە تــیر
بـە سـەر ران و بـاڵ و بـە سـەر سـەر ئـەمیر

لە نـێو تـۆزی سـوارا گـەلێ ون دەبـوون
وەکوو داری جەنگەڵ هەمو تێک دەچوون

لە بـارانـی تـیر و دەم و دۆخـی شـیر
کـەمێ روون دەبـینرا هـەوا تـیرە قـیر

بـە لێـز لیـزمە بـاران لە نـێزەی دەهـات
لە هـەر لاو کـەنارێ عـەجەب کـارەسات

بـە هـۆی هـەڵقوڵینی بـرین خـوێنی داغ
لە لافـاوی خـوێنا خـزی پـیاوی سـاغ

لە بـەر هـەڵمی جـەندەک لە ئاهی رەوان
دەبـینرا تـەم و مـژ لە روی ئـاسمان

سـوار و ئـەسب بـوو، بـە سـەر نێزەوە
دەکـەوتن بـە ئـەرزا هـەموو پـێکەوە

شەری یەک بە سەد بوو لە بۆ کوردی ماد
بـە نـەنگی دەزانـی کـە دەرچـێ لە کـاد[1]

سـەرم گـەر بسـوڕێ بـە سـەرنێزەوە
ئەوەم چاکە نەک دیـل بە دەس دێـزەوە

وەکـوو داری جـەنگەڵ هـەمو لێک درا
سـتێرەی فـەلەک گش لەوێ بـینرا

دەبـینرا تـریشقە لە تـیر و کـەوان
لە نـێزە و مـەتاڵ و زرێـی پـاڵەوان

وەکـوو مـەوجی دەریـا خـرۆشی دەهـات
لە کـێو و لە سـەحرا نـەما، رێـی نـەجات

صلاح‌الدین بـە خـۆی و بـە گش لەشکـری
لە هـەر لاوە دوژمـن دەبـوو بـەرگری

لە بۆیێ بوو نەعرەی لە ئـەوکـات و سـات
بە نێزە و بـە خـەنجەر کـە رێـێ وەکـات

گـەڕاوە لە مـیسرا لە دەور و بـەری
کـە لەشکـر وەخـڕ کـا بـچێتۆ سـەری

---

١ - کاد: مەیدان، مەیدانی شەڕ

# دەسەڵات پەیداکردن بە سەر قودس دا

سەلاحی(الدین) هەڵۆ بوو لە روی ئاسمان
بەرەو قودسە رۆیی لە دووی ئارمان
وەکوو مەوجی دەریا قشونی دەهات
لە شام و لە میسر و لە خاکی وڵات
لە شامۆ بوو ئوردوو گەلی دەنگ دران
لە قودس و لە دەوری هەموو سەف کران
لە نێو شاری قودسا سەلیبی هەموو
وەکوو ئەژدەهاگش دەهات و دەچوو
سەلیبی لە شارا لە هەر ئان و سات
وەکوو کێوی ئاگرپژێن دەنگیە هات
هەموو مەردی جەنگی هەمو پاڵەوان
هەمو شێر و بەبر و پڵینگی تەلان
لە دو لاوە شەڕ بوو شەری بێ ئەمان
گەلێ گۆشت و ئاسن بە یەک دادران
لە شەڕ دابوو زۆرێ لە میری ئەوان
ئەسیر بوون و دەس بەس لە بەندی خران
پڵینگێکی کورد بوو بە گۆپاڵ و دار
صەلیبی لە شارا وەدەرنا کەنار
صەلیبی لە شار و لە دەورو بەری
هەمو روحی رۆیی لە بەر خەنجەری
لە مێژوو دەبینی کە دوژمن شکا
بە شمشیری ئێمە هەمووی هەڵتەکا
ئەوانە گەڕانۆ مەگەر «شیردڵ»
وەکوو شێری جەنگەڵ بە هێز و بە دڵ
ستارەی شوجاعەت لە تاجی سەری
بروسکەی دەبینرا لە جەبهەی شەڕی
لە شەڕ دا بوو «شیردڵ» کە ئەسبی بە شیر
بە ئەرزا ئەکەوتن ئەویش کەوتە گیر

صلاح دیتی پیادە لە شەڕ دایە شا
بە لەز ناردی ئەسپێ لە بۆی دڵنەوا

بە فەرمانی سوڵتان لە ئەوکات و ئان
بە گورز و بە گوپاڵ بە تیغ و سەنان

بە نەعرە دەهاتن هەمو شیر بە دەست
بە جەنجاڵ و سام و شکۆ شێری مەست

لە بۆیێ بوو «شیردڵ» بە دڵ سوڵحی کرد
زەبوون بوو لە شەڕدا، دەبوو ورد و پرد

تکا و لاڵەیی بوو کە کۆکی کرێ
هەتا ئاوری شەر گڕی دامرێ

ئەگەر ئاوری شەڕ بکەوتایە شار
لەوێدا دەسووتا فەقیر و هەژار

ئەوە بوو بە بەڵگە کە مەردی زەمان
لە گەڵ خاچی کۆکی بکا بێ گومان

لە دووی مۆر و ئیمزا تەبایی ئەوان
دەری قودس کراوە بە بێ کوشتەدان

بە فەرمانی سوڵتان بە بێ دەنگ، وست
تەواو شاری گرت و لە ئامێزی خست

# حکوومەتی ماد

«هیرودوت» دەنووسێ لە نێو ئاسیا
حکوومەت بوو ئاشوور هەڵۆ بوو تیا

گەلێ کات و ساڵانێ لە پێنسەد پتر
لەنێو ئاسیادا هەبوون باج گر

بەلاّم میللەتێکی لێیان ڕاپەڕین
گەلی ماد بوو وریا و پڵینگی بەتین

موعینیش لە ئەعلام بەیانی دەکات
هەوڵ قەومێ هەستا لە ڕێگەی نەجات

لە نێو عێلی مادا وەکوو شێری غار
بە یەک جێ هەڵستان لەگوند و لە شار
هەتاکوو نەبن وان ستەملێکراو
زیاتر لەوەی هەن نەبن حەق خوراو
هەتا ئارایی ببن سەربەخۆ
بە ئاشوور نەدەن باج نەبن رەنجەڕۆ
لە ساڵ حەوسەد و هەشت لە پێشی میلاد
درووس بوو حکوومەت بەدەس کوردی ماد
بە ئەو هۆیە ئاشوور تەواو تێکشکان
بەدەس دەوڵەتی ماد هەموو تێک تەپان
لە مادی ئیتاعەت دەکرد دەوڵەتان
وەکوو پارس و ئیلام و مازندەران
گەلی ئەرمەنستان لە ئاسیای سەغیر
هەتا چۆمی هالیس لە دەسیا بووگیر
لە ئاشووری وەربوون گەلی قارەمان
بە شیر و بە نێزە و بە تیر و کەوان
سەر و سینگ و بازو لە ئاشووریان
بە ئەرزا دەکەوتن لە بۆ داڵ ئەوان
لە تاریخە نووسراکە وا قەومی ماد
گەل و میللەتێکن لە ئاری نژاد
هەوەڵ قەڕنی حەوتوم لە بەر دەوڵەتی
دەلەرزی جیهانێ لەبەر هەیبەتی

## دیاکۆ یا دیوکس (٧٠٨ـ ٦٥٥ق.م.)

هەوەڵ پادشایان دیاکۆ بە نێو
کە ئەسکەندەرێ بوو لە دەشت و لە کێو
لە ئەم ئاو و خاکە کە کوردی تیان
بە شیری وەدەرنا، لە دژ، دوژمنان

دیاکۆ بوو کردی بە پێتەختی ماد
ئەئەو ئامەدانەی کە ریشەی بوو ماد

بناغەی حکوومەت بە دەس ئەو کرا
وەکوو کێوی ئەلوەند سەخت بینرا

لە نێو ئاسیادا نەبوو دەوڵەتێ
بە هێز بێ وەکوو ماد لە هیچ میللەتێ

بە تین بوون و تاودار نەبەز بوون لەکار
بەگوزم و تەوژم وگەلێ هاژدار

## فەروەرتیش یا فراورتیس (٦٥٥ - ٦٣٣ ق.م)

دیاکۆکە مردن کوڕی بوو بە شا
فەروەرتیش کە دوژمن بە ئەرزیا کشا

فەروەرتیش پارسی تەواو گرتە دەس
دوو تیرەی برابوون هەموو شێری مەس

دەسی زۆر دەڕۆیی وەکوو بەبرە هات
لەوێرا بە فیز بوو لە هەر کاروسات

تەماعی دەکردن کە ئاشوور گرێ
تەواو ماڵی وانیش لە بۆ خۆی بەرێ

بە هۆی وەی بە هەڵمەت دەچوو «بانیپاڵ»
لە خوێن وەربدات و لەشی دا بە داڵ

بەلاّم خۆی بە نێزەی سپای «بانیپاڵ»
لە شەڕدا بوو کوژرا کرا رۆژی تاڵ

## کیاکسار (هووەخشەتەر) ٦٣٣ - ٥٨٥ ق.م

لە جێی بابی دانیشت «کیاکساری» ماد
دەچوو عومری رۆستەم لە شەڕیا بە باد

لە نێو ئاریادا، یەکەم شای وڵات
بە نەخشەی دەڕۆیی لە رێگەی خەبات

لە چەکداری ئەو بوون وەکوو شێری مەست
لە ئاشووری گرتن تەواو هێز و هەست
سپا و لەشکری وان بە تیر و کەوان
بە گۆپاڵ و شمشیر دەهاتن رەوان
دەهاتن هەتاکوو لە ئاشووری دەن
سەری دوژمنی خۆ لە نێو خاکی خەن
نیزیک نەینەوا بوو کە وا بینرا
کە پێتەختی ئاشوور گەمارۆی درا
لە ئەوکات و ساتا خەبەر بوو لە رێن
لە دەربەندی قەفقاز «سەکاکان» دێن
دەزانین لە سیبری لە ساردی ولات
گەلی ئاریایی بە چین خێڵی هات
لەوان هۆزی دیکەیش سەکایی بوو هات
گەلێ ئاتروپاتی لە شەڕیان هەڵات
«کیاکسار» گەڕاوە هەتاکوو بە شیر
سەکاکان بکاتن لە شەڕدا ئەسیر
لە لای گۆلی ورمێ لە باکووری را
دوو دەریایی لەشکر لەوێ لێک‌درا
دەس و پێ و زگ بوو لەگەڵ سەر لەوێ
شکاو و دڕاو و بڕا تا هەوێ[1]
هووەخشەترە ویستی بە رم شەڕ بکا
بە رمیی سەکاکان بەلام تێکشا
بە بڕیاری زۆر و بە مەرجی گران
نەجات بوو کیاکسار لە شەڕگەی ئەوان
بە کوشتار و تالان دەڕۆین گەڕان
لە چەن مەملەکەتدا نەما جێی ئەمان
ئەوان میللەتێ بوون سەراسەر ولات
لە خورتی و شەڕی وان گەلێ زاڵە هات

١ - تاریخ ایران در عهد باستان، دکتر محمدجواد مشکور ـ دهخدا تاریخ ایران ترجمه کیخسرو کشاورزی

هەتا بیست و هەشت ساڵ لە نێو مـادی مـان
سـەقز بـوو بـە پێتەخت لەوێـدا دەمـان[1]
سـەکـاکـان بـە پیلان هـەموو تێکشکان
لە مـــێژوو دەبـینرێ لە خـوێن وەردران
هــووەخشەترە جـەژنێ لە بـۆ دیـوەخان
بـە ریـز بـانگی کـردن سـەرانـی ئـەوان
لەوێ مـەستی کـردن هـەمووی دا لە شیر
سـپایان شکـان و گـەلێکیش ئـەسیر
هووەخشەترە هـات و لە ئـەو ئـان و سـات
هـەتا نـەینەوا زوو لە ژێـر چـۆکـی خـات
بـــە سـەرداری ئـاشوور خـەبەر وا درا
سـپای مـادە وەک خـێز نـزیک نـەینەوا
لە وەخـتێ کـە پـێتەخت بـە نێو نـەینەوا
لە ئـــاشووری گـرتن لە ئـەرز و حـەوا
لە بـۆشایی ئـاشوور نـەما رێـی نـەجات
لە بۆیێ بوو بـۆ خـۆی بـە فـەوری دەهـات
هـەتا خـانەوادەی لەگـەڵ خـۆی گـرێ
لە نـێو کـاخی خـۆیدا لە ئـاور خـرێ

# ئاژیدهاک یا ایختوویکو (٥٨٥-٥٥٠ق.م)

هووەخشەترە؛ تیا چوو کوڕی ئـەژدەهاک
بـە شـابوو کـە شـایی لە مـادی بـوو پـاک
لە دووی بـابی شـایی لە بۆ ئـەژدە هـاک
دەمـاوە بـە ئـیرسی لە ئـەم ئـاو و خـاک
خـەوی دی لە کـیژی وەهـا ئـاوە هـات
کـە پـێتەختی مـادی و بـن لیـتە خـات

---

١ - ایران در عهد باستان، ص ١٥٦

ئــە ئــەو کــیژەیەی دا بــە پیاوێ شــەهیر
لە مـــەردانــی پــارس مــرۆڤێ بــە بــیر
کــە (مــاندانــا) هــاتۆ لە بــۆ ماڵی باب
لە گــەڵیابوو کـورش بـە زۆر ئـاب و تـاب
بــە فــەرمانی شـابوو لە بـەر ئـەو خـەوەی
کـە هـارپاک ئـەجەل بێ نـەیلێ نـەوەی
بـــەڵام هــارپاک بــوو بــە «راهــێنی»دا
نـــەوەی شـــای نــەهێنی بــە داوێــنیدا
کــە شــا دیــتی فــەرمان بـەرێوە نـەچوو
ئــەویش هــەر نــەهێنی بە بیر تـۆڵە بـوو
لەوێ لێ بـــرا، زوو بــە دڵ ئــەژدەهاک
بــە خــەنجەر لەتــی کـاکوڕی هـارپاک
لە ئەو گـۆشتە سـازیی دەکـرد زۆر کـەباب
لە مــیهمانی دەیــدا بە دەرخـواردی بـاب
بـــە جـوری کــەبابی لە بــۆ ســاز کــرا
نـــەزانـــێ کــە گــۆشتی کــوڕی دانــرا
بــەڵام تــێ گـەیی بـوو، کـەچی پـێ خـورا
نـەزان خــۆی نـیشان دا، لە کـوشتن کـوڕا
لە (انزان) بوو کـورش، بـە فکـری دەهـات
کە پێ تەختی باپیر، وە دەس خـۆی بـخات
لە سەر خـۆ و، کـەم کـەم، خـڕی کـردەوە
لە چەک داری وەک شێر، لە بـەبری رەوە
کــە کـۆرش لە وێـرا، بـە لەشکـر دەهـات
بـەرەو هـەگـمەتانا، لە هـەر کـات و سـات
سپای ئـەژدەهاکـیش لە ئـەو لاوە چـوون
لە بــۆ شــەڕ لە مــەیدان، نـزیکۆ دەبـوون
لە وەخـــتی نــەبەردا، وەزیــر هــارپاک
بــوە ســەرپەلی گش، ســپای ئـەژدەهاک
کە هارپاک لە شای مـاد، دڵـی پـڕ لە کـین
لە گەڵ کورشی کەوت سپای چین بـە چـین

لە مەیدانی جەنگاکە لەشکر برا
بە دوو دەستی پێش کەش بە کورش کرا

ئەبەم جورە دەرفەت بە دەستی خرا
لە ئەو ماوە تولەی کورِی سەندرا

لە پینسەد، وە پەنجا لە پێشی میلاد
بە دەس کورشی کەوت، نەما حوکمی ماد

موعینە دەنوسێ، بە فکری رەوان
ئەمە زۆر موهیممە کە دەیکەم بەیان :

لە نێو ئاریا دا هەوەڵ دەوڵەتێ
هەبوو مادی گچکە، شکۆ میللەتێ

شکۆی وانە رۆیی، هەتا ئاسمان
لە تاریخە «ئاوێر»، دەبینی ئەوان

لە ئاسیایی غەربا خەنیمی نەبوون
بە هێرش لە هەر لا؛ وەکوو بەبرە ئەچوون

هەبوو دەوڵەتی ماد ئەبەم جورە بوو
بە هۆی ئەو بوو سامی، سەرەوخوار ئەچوو

بە هۆی ئەو تەمەدون لە نێو ئاریا
گوڵی کرد و پشکووت لە هەر شاریا

لە بۆ مادی گەورە سنوور دانرا
لە مێژوو بە وردی هەمووی نووسرا

پەرِی خاکی ئەو بوو لە بۆ خۆرنشین
هەبوو چۆمی هالیس، لە تاریخە دین

لە لای رۆژ هەڵاتی لە جەیحون دیبان
لە رەی تاکو مادی، بچوک بوو ژیان

هەتا ئەرمەنستان، لە باکوور چوە
لە باشوورە روونە خلیج فارس بوە

موکریانی ئەمرۆ بە مادی بچوک
لە نێو مێژوو دیم و لە پەرتوکی کوک[1]

---

١ - کوک: بە قیمت، بایی‌دار

# روستەم

دەمـــاوەندە بـازوی، تـەنەی ئـاراپات
لە شـــانامە روســـتەم ئـەوانـێو ئـەبات
بەڵێ روستەمی کورد لە هەرکوێ ژیـان
بـــە بـــازوی پـــۆڵا لە دێـــوی دەدان
وەکوو شێری جـەنگەڵ لە نێو دوژمـنان
دەســـوراو دەبـینرا یـەکـەم قـارەمان
رەسەن روستەمی زاڵ لە جـەمشیدی جـەم
لە پـەڕ «دێـهخودا» دادەبـینی بـە چـەم
لە شـــانامەدایـەکـە پـەر پـەر هــەڵێ
لە وێـــدا دەبـــینی کـە روستەم دەڵـێ
«قــــبادگـــزین راز البـــرز کـــوە
مـــــن آوردەام در مـــیان گـــروە»
کــــەیانی بــــە شــــایی لە دنــیا ژیــان
بـــــە زانـــا و ئـــاوز بـــرا نــێویان
قــــباد بـابی گـەورە لە بـۆ نـەسلی وان
لە هـۆزی فـەرەیدون ئـەمیش نـێو بران
ئــەوێستایە نـووسی رەگـەزکـەیقوباد
مــــەنوچێهرە بـاپیر لە بـۆ قـەومی مـاد
لە بـۆیێ بـوو روستەم بـە فـەرمانی زاڵ
بـــە دوی کـەیقوبادا دەرۆیـی بـە بـاڵ
ئـەوە چـوو لە ئـەلبورز بـە زەرداکشـا
قــوبادی دەهـــێنا هـــەتا بـێ بـە شـا
کــــەیومەرسە بـاپیر لە بـۆ قـەومی مـاد
«هـــرودوت»ە نـووسی نـەچێ بـا لە یـاد
کــەیومەرس و جــەمشید لە پـێشدادیـان
گـەلی مـاد و روستەم لە نەسلی ئەوان

بـەڵێ روسـتەمی کـورد سکـاکـانی رفـاند
لە سەیحون و جەیحون هەمووی تێ پەراند
نــە ئــەفراســیاب و نــە ئــەسفەندیار
لە حــەڵقەی کــەمەندی نــەبوون رەسـتگار
تــەماشا کــە «ئـاوێر» لە تـاریخی مـاد
گــەلێ روســتەمی بــوو نــەماون لە یــاد

## روستەم

«رەشید یاسەمی» لە تاریخی کورد دا نوسیویە: روستەم لە تایفەی کورد بوە و شانامەیش بەوی دەڵێ روستەمی کورد ـ روستەمی سکزی (سیستانی) روستەمی زابلی، بەڵام تاریخی چەند هەزار ساڵ لەمەو پێش لە بن گەرد و غوبار وەدەرکەوتوە دەزانین سکاکان لە کاتێک دا هێرشیان هێنا لە زەمانی هووەخشەترە پادشای بە جەرگ و مەشهوری ماد سەقزیان گرت و کردیانە پێتەختی خۆیان و نێویان نا «اسکیت» و لە دواییدا بوە «ساکز» کە ئەویش گۆڕاو بوو بە سەقز و روستەمی سەکزی کە دەکوترێ مەنسوب بە «سیستان» نیە بەڵکو مەنسوب بە «ساکز»ە کە پێتەختی سەکاکان بوە و گۆڕاوە بوەتە سەقز و زابلی پێ‌دەڵێن کە گۆڕاوەی زابە، زابیش ناوچەیێکی پان و بەرینە کە وەک «دهخدا» دەڵێ: هەم جەنگاوەران و هەم زانایانی گەورەی لێ هەڵکەوتوە. و روستەم لە زەمانی زاب داکە یەکێک لە پادشایانی پێشدادی بوە ژیاوە و یاقوت دەڵێ: چۆمەکانی زاب لە پەڕی ئازەربایجان و کوردستانی عێراق بە نێوی زابی پێشدادییە. چونکە زۆری لە سەر ئەو چۆمانە کار کردوە و کاناڵی بۆ لێداون و زاڵ و روستەم وەک تاریخ دەڵی هەر لەو ناوچە لەگەڵ ئەواندا بوون و روستەم بەو ناوچە و چۆمانە نیسبەت دراوە لەگەڵ کەمێک گۆڕان زاب بوەتە زابلی. بەڵگەی دیکە بۆ ئەوە کە شەڕی ئێران روستەم و کەیانیان و ماد لەگەڵ دوژمنانی خۆیان لە ناوچەی کوردستان بوە نە سیستان لاپەڕەی مێژوو نیشان دەدا جارێک لەگەڵ دەوڵەتی ئاشوور و جاریکیش لەگەڵ تورانیان و ئەفراسیاب هەر لە کوردستان وڵاتی مادی چکولە بوە یەکێک لەو کتێبانە «ایران در عهد باستان» تألیفی «دکتر محمد جواد مشکور» مامۆستای دانیشگایە لە لاپەڕەی ٩٣ دا دەڵی: در ادبیات پهلوی مولد کیخسرو گنگ دژ آمده وی بتکدەی بەدینان را کە بر کنار دریاچه چی‌چست بود ویران کرد و آذرگشنسب آتش پادشاهان را بر کوه اسنوند کە نزدیک آن بود بنهاد و گنگ دژ را کە در آغاز بر سر دیوان بود کیخسرو آن را بر زمین نشاند و

افراسیاب و گرسیوز را بر کنار دریاچەی چیچست (ارومیه) بکشت.«دهخدا»[1] دەڵێ: روستەم گەورەترین پالەوانی ئێران نژادی بە جمشید دەگا روستەم لە روی زنجیرەی نەسەبەوە دەگاتەوە پێشدادیان و کەیومرس هەوەڵ پادشای پێشدادی لە روی نوسراوەی «هرودوت» بابی تاریخ باپیرە گەورەی مادەکانە و مادیش باپیرەی کوردی ئەمڕۆیە بەم پێیە کورد بوونی روستەم جێی گومان نیە.

## ئەبوو موسلم

ئـەبو مـوسلمی کـورد نـەبیرەی کـەیان
بە شیدوش و گـودەرز دەگـا، نـەسلی وان
گـەلێ پـیاوی جـەنگی گـەلێ پـاڵەوان
لەگـــەڵیا دەهـــاتن هـــەموو قـارەمان
لە عـــــەبباسیانی دەکـــرد پشـــتیوان
بە هۆی ئەو بوو دوژمن هەموو تێک شکان
نـــژادی ئـــومییەی بـــە رم لیک دەدان
خـــەلافەت گـــەیی زوو بـــە عـەباسییان
«ئـــەبو دلامـــە» بـــە شـێعر و بـەیان
ئەبوو مـوسلمی کـوشت بـە زەهـری زمـان
لە پـــەرتووکی مـــێژوو ئـەوا نـووسرا
تـــەماشاکـــە شـــێعری ئـەمانەن بـرا
«ابـــا مـــجرمٍ مـــا غـــیَّر اللهُ نـــعمة
عَـــلی عـــبدِهِ حـــتی یـــغیره العـــبدُ
افـــی دولة المـــنصور حـاولت غـدرة
الا انّ اهـــل الغـــدرِ آبـــاؤک الکـــرد

[1] ـ دهخدا نوشته زاب نام یکی از پادشاهان عجم و آن پسر نودک پسر منوچهر است و نهرهای موسوم به زاب منسوب بدوست (قاموس). بعد از چند سطر باز نوشته نام پادشاه ایران که بعد از قتل نوذر به دست افراسیاب بن پشن و غلبه بر ایران به سعی زال زرو بزرگان کیان بر مسند جهانداری بر نشاند و با افراسیاب مصالحه کرد و گویند در عراق عرب شهری به نام خود ساخته و ویران شده.

ابـــا مـــجرم خـوّفتنی القــتل فــانتحی
عـــلیک بـــما خــوفتنی الاســد الورد»

جەزای چاکـە مـەنسور خـەلیفەی دوهـەم
ئەبوو موسلمی کوشت خەلک بۆی به غـەم

**ابومسلم:** دهخدا در جلد یک نوشته: «مأمون خلیفه عباسی بهترین معرف دهاء و نبوغ این مرد است آنجاکه گفت: أجل ملوک الارض ثـلاثه وهم الذین قامو بنقل الدول: الاسکندر و اردشیر و ابومسلم الخراسانی به نقل از حهمزه بن حسن در کتاب اصفهان شرح مولد و نشان و نژاد او داده است. که مهترزاده بود و نسبش به شیدوش پسر گودرز پسر کشواد پسر قارن پسر کاوه اهنگر میرساند و حمزه صفت و اخلاق و سیرت بومسلم کند مانند به شیدوش برادر گیو که بومسلم همچنان سیاه پوشیدنی اختیار کرد که شیدوش کرد برفتن (و) کشتن سیاوش و بدان جامه پیش کیکاوس اندر رفت و هیچ نماز نکرد گفت نه سلام و نه سجده ترا و ازان پس هرگز نخندیدی مگر در جنگ و ابو مسلم را همان عادت بود.» و درباره ابو مسلم مطالبی از ابن خلکان نقل میکند بعداًگوید پدر ابومسلم در آذربایجان بمرد و مولد ابومسلم به سال ۱۰۰ (ه. ق) در روستای فایق بقریه‌ایست که ان را «ماوانه» گویند و مردم اصفهان ادعاکنند از اهل جی اصفهان است و به نظر می‌رسد نظر اول درست باشد در «ماوانه» که روستایی‌ست در کردستان آذربایجان بیست کیلومتری جنوب غربی ارومیه به همین نام «ماوانه» برخی نژاد او را فارس و جمعی عرب اما ابن خلکان وی راکرد معرفی نمود. و اشعار «ابودلامه» کرد بودن او را تأیید میکند و قتل ابو مسلم روز پنجشنبه ۲۵ شعبان سال ۱۳۷ (ه. ق) بود و مقتل وی شهر رومیة المدائن بود شهرکی نزدیک انبار بر ساحل غربی دجله و آن یکی از شهرهای مداین کسرا است. و میان آن و بغداد هفت فرسنگ است و انگاه که وی را بکشتند در گلیمی بپیچیدند و در این وقت جعفر بن حنظله درآمد و منصور به دوگفت در امر ابو مسلم چه اندیشی گفت اگر موی از سر اوگرفته باشی او را بکش و بکش و بکش منصور گفت خداوند ترا توفیق دهد این است ابو مسلم در گلیم چون چشم جعفر به جسد ابومسلم افتاد گفت ای امیرمؤمنان امروز را روز اول خلافت خود بشمار. (مشاهیر کرد، تاریخ کرد رشید یاسمی، دهخدا).

## شدادیان گنجه که قطران تبریزی آنها را از نژاد ساسانیان بشمار می‌آورد

شهریاران گمنام در صفحه ۲۲۶ دربارەی پادشاهی آنان مطالبی نوشته که به اختصار در اینجا درج میگردد «در قرن‌های نخستین اسلام ایلی از کردان به نام «روادی» (بدون تشدید) در ارمنستان در نزدیکیهای دوین نشیمن داشتند و به گفته ابن اثیر بهترین تیرەی کردان بودند و به

نوشته ابن خلکان کردان روادی در بیرون شهر دوین تختگاه کهنه ارمنستان نشیمن داشتند و در سال ۳۴۰ (هق) محمد بن شداد قیام کرد و در (آران) حکمرانی خود را بر نواحی ارمنستان و آذربایجان و بخشی از گرجستان پی‌ریزی کرد و حکومت این خاندان تا اواخر قرن ششم ادامه پیدا کرده و محمد سه پسر داشته ابو الحسن لشکری، مرزبان و فضلون و هر سه به ترتیب حکمرانی کرده‌اند و بعد از فضلون پسرش ابوالفتح موسی شدادی به فرمانروایی رسید و در ۴۲۵ (ه. ق) وفات یافت و پس از موسی پسرش ابوالحسن علی لشکری دوم فرمانروایی یافت و یکی از ممدوحان بزرگ قطران تبریزی است و در مورد یکی از جنگهای ابوالحسن لشکری دوم که گرجستان و ارمنیان را در عید قربان سخت شکست داده نوشته:

لشکری را کشت کُورا مرگ نتوانست کشت
قلعه‌ای را کند کآنرا چرخ نتوانست کند

ای جهانت پیشکار ای روزگارت زیر دست
ای سپهرت رهنما ای روزگارت یارمند

گوسفند و گاو کشتن فرض هست این عید را
کاندر این آمد حساب ایزد بیچون و چند

ایزد از هر عید هست امروز راضی‌تر ز تو
زآنکه کافر کشته‌ای بر جای گاو گوسفند

و درباره فرزندان لشکری: منوچهر، انوشیروان، گودرز و اردشیر و بیان دودمان و نژاد این خاندان که از ساسانیان بوده‌اند یاد می‌کند.

ای روان بر شهریاران جهان فرمان ترا
هر چه باید خسروان را داده یزدان آن ترا

همچو ارمن گشت خواهد نعمت سنگی ترا
همچو آران گشت خواهد ملکت شروان ترا

ملکت ایران نیاکان ترا بود از نخست
گشت خواهد چون نیاکان ملکت ایران ترا

ارنیای تو منوچهرست و نوشروان شها
باز فرزندان منوچهرست و نوشیروان ترا

هم نشاط دل بیفزاید به کردار این ترا
هم بقای جان بیفزاید به گفتار آن ترا

باز گودرز آنکه جفت ناز دارد دل ترا
اردشیر آنکو عدیل کام دارد جان ترا

ملک فرزندان بدادی و بباید داد هم
ملک فرزندان و فرزندان فرزندان ترا

در قصیده دیگر گوید:

این جهان بودست دایم ملکت ساسانیان
خواست سالارش خدا در ملکت ساسان کند
نیست کس در گوهر ساسانیان چون لشکری
تا پس آن همچون نیاکان شاهی ایران کند
همچو افریدون نگیرد ملک عالم سربه سر
وانگهی تدبیر خیل و ملک فرزندان کند
روم و گرجستان به فرمان منوچهر آورد
هند و ترکستان به زیر دست نوشیروان کند
او به تخت ملک ایران برنشیند در ستخر
کهترین فرزند خود را مهتر آران کند»

دوین شهری بوده در شرق آرارات و جنوب ایروان. سرزمین آران: آران در شمال ایران و غرب دریاچه خزر قرار داشت شهرهای بزرگ آنجا باکو، نخجوان، گنجه، شماخی و دربند است. شدادیان روادی کرد بنیاد حکومت خود را در اران به وجود آورده و از ٣٤٠ تا ٥٧٠ (ه ق.) فرمانروایی کردند.

## ئاماژەیێک بە نژادی ساسانیان و شوان کارە

کەیانیان: کەی لە کەیوان گیراوەتەوە یانی بلێندقەدر و وشەی کەی زاڵ بە قوبادیدا بەهمەن کە یەکێک لە پادشایانی کەیانی بوو کوڕی ئەسفندیار کوڕی گشتاسب کە ئایینی زەردەشتی ڕەواج دا؛ کوڕێکی بوو بە نێوی ساسان و کچێکیش بە نێوی هوما و چونکە بەهمەن پادشایی دا بە کچەکەی، ساسان پێی عەیب بوو لای بابی بێ ڕۆیی چەند مەڕێکی وەدەس هێنا و شوانی کرد تاکوو مرد وەکو روونە نەوە و نەدیدەی نێویان ساسان بووە و بە شوانی و گاوانی ژیانیان بردوەتە سەر و لە زەمانی ئەشکانیان باسێکیان لە نژادی خۆیان نەکرد. «پیرنیا» نوسیویە: ئەشک کە یەک نەفەر سکایی بوو بناخەدانەری پادشایی پارتی بوو زنجیرەی ئەو پادشایانە بە ئەشکانی مەشهوور بوون و لە دوای لە بەین بردنی سەردارانی ئەسکەندر (سلوکیان) تا زەمانی ساسانیان ٤٦١ ساڵ پادشاییان کرد و ئاخر پادشای ئەوان (اردوان) بوو کە بە دەستی ئەردەشیری بابەکان کوژرا. بەڵام فردوسی دەڵێ: لە نژادی کەیانیان بوە و زۆر لە مێژوونوسان پشتگیریان لێ کردوە.

نخست اشک بود از نژاد قباد | دگر گُرد شاپور خسرو نژاد

(دهخدا) دەڵی: ئەردەشیری بابەکان کوتی: من لە نژادی ساسانی کوڕی بەهمەنم و ساسان الاصغر شورەتی ساسانی بابی بابەکە و ئەویش لە نژادی ساسانی ئەکبەری کوڕی بەهمەنی کوڕی ئەسفەندیارە و ساسانی کورد لە قەبی ساسانی کوڕی بەهمەنە باپیرە گەورەی ساسانیان و پادشایی ئەمان لە کاتی کوژرانی (اردوان)، ئاخر پادشای ئەشکانی بە دەستی ئەردشیری بابەکان دەس پێکراوە تا کوژرانی یزدگرد سێهەم بە هۆی هاتنی لەشکری عەرەب بۆ ئێران و چوار سەد ساڵ حکومەتیان کرد. فردوسی لەبارەی بەهمەن (اردشیر دراز دست) لە بنەماڵەی کەیانیدا دەڵێ:

پسر بود او را یکی شیرگیر | که ساسانش خواندی ورا اردشیر
یکی دختر بود نامش همای | هنرمند و با دانش و پاک رای
پدر در پذیرفتش از نیکوی | بدان دین که خوانی ورا پهلوی
همای دل افروز تابنده ماه | چنان بد که آبستن آمد ز شاه

و شا بە هومای دەڵێ :

ولیعهد من او بود در جهان | هر آن کس که زو زاید اندر نهان
چو ساسان شنید این سخن خیره شد | ز گفتار بهمن دلش تیره شد
به سه روز و شب بسان پلنگ | از ایران بمرزی دگر شد زنگ
به هندوستان در بزاری بمرد | ز ساسان یکی کودکی ماند خرد
برین هم نشان تا چهارم پسر | همی ساسانش کردی پدر
شبانان بدندی و گر ساربان | همه ساله با درد و رنج گران

## ساسانیان و شوانکارە

لە نێو بەلعەمیدا و ئیبن و ئەسیر
دەبینی کە باسە لە (ئەردەوان)ی ژیر
کە ئەشکانیانیش بەوی بوو تەواو
نەبوو پادشایێ لەجێی ئەو بە ناو

ئــەئەو پــادشایەگــوتی (ئــەردشیر)
ئـەتۆی کــوردی چــادرنشینی لە دیـر[١]
ئـەتۆ تـاجی شـاییت لە سـەر نـا چلۆن؟
بــلێ بــەڵگەکــانی تــەواوی لە بــۆن
ئــەتۆ لەو پــلاس و گــلیمت پــتر
کە پێی خۆت وەدەرنا دەبـی ورد و شڕ
ئەتۆ ئەی کـوڕی کـورد، لە چـادر ئـەوان
بـە خێو بـوو بلێ کێ، ئیجازەی دەدان
دەبـینم کـە خـوێنە لە لاشـەت چکـەی
لە بۆ روح و گیانت، ئەجەل بانگ ئەکەی
ئـەتۆ تــاجی شــایی لە سـەرنێی غـەیان
دەبـینی سـزای خـۆ بە چـاوت عـەیان
بـەڵێ ئـەردەشیریش وەهـا جـوابی دان
بــە شـمشیری پـۆڵا لەگـۆڕی دەنــان

## شوان کارە

لە ســێسەد زیــاتر بــە ســال و بــە کــات
شــوان کــارە شـا بـوون لە خـاکــی وڵــات
هــەتا پــازدە شــایێ لەوان نــێو بــرا
لە تــاریخی ئــێران تــەواو نــووسرا
کە چوارسەد، چل‌وهەشت،لە هێ و قاف چوو(هق.)
گـەلی کـورد، دەبـینرا وەکـوو شـێر بـە خـوو
لەکــوردانــی فــارس: شــوان کـارە بـوون
بــە شــایی بــە قـودرەت بـە رێـوە دەچـوون

---

١ـ لە تاریخی تەبەری و الکامل ابن ئەثیر دا تەرجومە نامەیێکی ئەردوانی پێنجەم پادشای ئەشکانی بوَو کە ئەردشیری بە بناخەدانەری سەڵتەنەتی ساسانی نووسیوە بەم رستە و بەیانە «انک قد عدوت طورک و اجتلبت حتفک أیها الکردی المربی فی خیام الاکراد من أذن لک فی تارج الذی لبسته» جلد سوم مشاهیر کرد.

لە بــەرچـــی بـــوو مـــەشهور بـــە شـــوانکـارە مـان
هـــــــەموو شـــێرەمەرد و هـــــەموو پــــاڵەوان
لە بــەر وەی بــوو بــەهمەن بــە کــیژێکی خـۆی[1]
وتــــی ئــەی (هــوما) شــا لە جـێی مــن ئــەتۆی
لەوێ دەم بوو ساسان کە دی بابی خۆی
لەوی زوڵمە کات و نیە روحـمی بـۆی
بــە نــەنگی دەزانـــی لە کـــن بـابی بێ
لە بەر وەی بوو رۆیـی نـەبوو تـابی بـێ
بووە شوانی خەڵکی لە هەرجێ کە بوون
نەبیرە و کـورێشی لە ئـەو رێـیە چـوون
لە وان تاکورێ پـێنج هـەموو نـێو بـران
بە سـاسان هـەموویان بـە شـوانـی ژیـان
شــوانکـــارە شـابوون لە مـێژوو خـران
لە بەر شـوانـی سـاسان شـوان نـێو بـران
دەبـــا بــەلگەیێ دی ئـەمن کـەم بـەیان
شـــوانکـــارە بـــۆ چـی ئـەوا نـێو نـران
عەرەب هات لەکورد و لە فارس شکان
لە ئـــاوارەیـــی دا بـــە شــــوانـــی ژیــان
لە بـەر وەی ئـەوانـە کـە ببوونە شـوان
بە شـوانکـارە نـووسرا هـەموو نـێویان

«دێهخودا» نوسیویە: **شوانکارە** - زنجیرە و بەرە باب و رەچەڵەکی ئەوان معین‌الدین نطنزی لە تاریخی پادشایانی شوانکارە بەرامبەری زنجیرە بنەچەکەی ژمارە چوارن کتێبی مجمع‌الانسابی شەبانکارە دەڵێ: نەبیرەی ئەردەشیری بابەکن و لە نژادی کوردن و هاتونەتە نێو فارسەوە. و ئەوانە چەند نەفەر لە پادشایانی ئێرانن کە لە سـاڵی ۴۴۸ (هـ. ق.) تـا سـاڵی ۷۵٦ (هـ ق.) لە وڵـاتی ئەجدادی خۆیان بە پشتا و پشت حکومەتیان کردوە تا ئاخرین پادشای ئەوان مەلک ئەردەشیر بە دەستی ئالی موزەفەر شکستی خواردوە لە بەین چوون. فارس نامەی ناسری دەڵێ: لە نژاد و قەبیلەی کوردن کە لە پارس نیشتەجێ بوون. (دهخدا) دەڵی: ئەم بیرورایە زۆربەی مێژوونوسان پشتگیری‌یان لێ کردوە و «ابن‌البلخی» لە بارەی شوانکارەی کوردی فارسەوە نـوسیویە: ئـەو

---

١ - مەبەست لە بەهمەن ئەردەشیر درازدەستە کوڕی ئەسفندیار کوڕی گشتاسب کە دینی زەردەشتی قـەبول کرد و رەواجی دا لە پادشایانی کەیانی بوە

هۆزە لە زەمانی قەدیم دا ناو و نیشانێکیان نەبوە و کاریان شوانی و دارکێشی و کرێکاری بوە، بەڵام لە ئاخریدا شۆرەت و توانایان پەیدا کردوە، و پێنج خێڵ بوون هەر خێڵێ سەد هەزار. گەورەیی و شکۆی لەشکری فارس بەو کوردانەوە بوو کە ئەسلەحە و ئەسبی زۆر چاکیان لە دەس دابوو بەڵام لە شەڕ لەگەڵ ئیسلام چەکداری ئێران بە فارس و کوردەوە یەکجار زۆریان لێ کوژران ئاوارە مان و چارەیان نەما، بوون بە شوان بەڵام دوای بەینێک لە زەمانی ئەمیر فضلویە کوڕی علی کوڕی حسن لە سال ٤٤٨ (هـق.) بە عەزەمەت و گەورەیی گەیین و حکومەت کەوتە دەستیان و تا ساڵی ٧٥٦ (هـق) فەرمانڕەوا بوون. (دهخدا) بە نەقڵ لە مەجمەعول ئەنسابی شەبانکارەوە دەڵێ: تایفەی شوانکارە لە نژادی ئەردەشیرن و هۆی ئەوەکە پێیان دەڵێن شوانکارە دوو شتە: یەکێک ئەوەکە لە لەشکری ئیسلام شکستیان خوارد و بەینێک بوون بە شوان و ئەوی دیکە ئەوەیەکە لە کتێبی فارسنامە دا نوسراوە دەڵێن: لە کاتێکی بەهمەن «اردشیر دراز دست» کچی خۆی هومای کردە جێنشینی و ساسانی کوڕی لە داخان ڕۆیی چوو لە وڵاتان بوو بە شوان و هەروا زنجیرەی ئەولاد و نژادی شوانیان کرد.

ملک‌الشعراء بهار لە لاپەرەی ٤٠ بەرگی هەوەڵی سەبکشناسی دا دەڵێ: ساسانیان خۆیان بە میراتگری بەهمەن «اردشیر دراز دەست» کوڕی ئەسفندیار و جێنشینی کەیانیان زانیوە. فارسنامە نوسیویە: هۆزێ لە عەشایری شوانکارە «رم البازنجان» بووەکە بریەتین لە «بازرنگی» فەرمانڕەوایانی شوانکارەی ناوچەی «بیضاء» و «دارابگر» و ئەو دەور و بەرەیان لە دەس‌دا بوە هەر بەم پێیە بڕێک لە مێژوو نوس بڕوایان وایە ئەردەشیری بابەکان هەوەڵ حەڵقەی زنجیرە پادشایانی ساسانی کوردە و هەروەها نوسیویە: تیرەی شوانکارە لە هەوەڵی سەدەی پێنجەمدا (ک.م) لە وڵاتی فارس حکومەتێکی سەربەخۆیان بوە و نزیک ١٥٠ ساڵ دەوامی بووە.

(دهخدا) بە نەقڵ لە فارس‌نامەوە نوسیویە: ناوچەی شوانکارە زەمین و دەشتی باکوری بوشێهرە درێژایی لە شاەفیروزی تا مکابری حەوت فەرسەنگە و پانایی ئەو لە دەکەنەوە تا بیدر، چوار فەرسەنگە تاریخ‌الدول ج ٢ لە لاپەرەی ١٣١ نوسیویە:

**امیر فضلویە زمانی شبانکارە:** ئەمیر فضلویە کوڕی علی کوڕی حسن کوڕی ایوبی رامانی یەکێ لە فەرمانڕەوایانی نیۆداری شوانکارەی فارس بوو کە لە زەمانی ساحلی کوڕی عباد (٣٢٦ - ٣٨٥) وەزیری بەناوبانگی بویەکان بە پلە و پایەی فەرماندەی سپاگەیی و لە دوای کوشتنی صاحب شەبەیخونی هەڵمەتی بردە سەر شیراز و لە ساڵی ١٤٤٨(ک.م) ابو منصور حاکمی شیراز و دایکی فەراسویەی یەخسیر کرد و حکومەتی فارس کەوتە دەس فەرمانڕەوایانی شوانکارە تا خواجە نظام الملک وەزیری آلب ارسلان بە لەشکرێکی زۆرەوە دەوریدا و گرتی و لە ساڵی ٤٦٤ (ک.م.) کوژراوە دوای ئەوە عەشایری شوانکارە لە فارس و کرمان تووشی فیتنە و سەرلێ شێواوی بوون و هەر لەم جێیە دا (دهخدا) دەڵێ: پادشایانی شوان

کارە ١٥ کەس بوون بەم جۆرە ١ـ فضلویە لە ٤٤٨ تا ٤٥٩ک.م.
٢ـ نظام‌الدین یحیی کوڕی حسن لە ٤٥٩.
٣ـ نظام‌الدین محمودی کوڕی نظام‌الدین یحیی لە...
٤ـ قطب‌الدین مبارز... تا ٦٢٤ک.م.
٥ـ ملک مظفرالدین مبارز بن ملک مظفرالدین لە ٦٢٤ تا ٦٥٨ک.م.
٦ـ قطب‌الدین مبارز بن ملک مظفرالدین لە ٦٥٨ تا ٦٥٩ک.م.
٧ـ نظام‌الدین حسن کوڕی محمد مظفر الدین لە ٦٥٩ تا ٦٦٢ک.م.
٨ـ نصرةالدین ابراهیم برای نظام الدین حسن لە ٦٦٢ تا ٦٦٤ک.م.
٩ـ جلال‌الدین طیب شا ٦٦٤ تا ٦٨١ک.م.
١٠ـ بهاءالدین ابراهیم برای طیب شا لە ٦٨١ تا ٦٨٨ک.م.
١١ـ نظام الدین حسن کوڕی طیب شاە لە ٦٨٨ تا ٧٢٥ک.م.
١٢ـ نصرةالدین ابراهیم کوڕی اسماعیل لە ٧٢٥ تا...
١٣ـ ملک رکن الدین حسن لە...
١٤ـ تاج الدنی جمشید کوڕی اسماعیل لە ٧٣٥ تا نزیک ٧٤٢.
١٥ـ ملک اردشیر لە ٧٤٢ تا ٧٥٦ک.م.

# پیشدادیان

## کەیوومەرس

هـــەوەڵ پـــادشایێ لە پـێشدادیـــان
کـەیوومەرسە مێژوو دەکـا بـاسی وان
هـێرۆدۆت ئـەنووسێ کـە بـاپیری مـاد
کەیوومەرسە شا بوو لە بۆ عەدڵ و داد[١]
دەســـوورِا لە شـــاخ و لە نێو بـەردەڵان
لە پـێست بــوو لیـباسی، ئـەئاوا ژیـان
لە شـــانامە بـــاسی کـــەیوومەرسە هـات
کە «تێبین» لەوێـدا، بـە تـین بـاسەکـات

## هووشەنگ(١)

نەوەی ئەو بوو هووشەنگ لە پێشدادیان
بــووە شـــا بـــە بـــاشی لە دنـــیا ژیـــان
بــە هــووشەنگی گــوترا لە پێشدادیـان
ئــەتۆی دادگــەر شــا، مـرۆڤی قـارەمان
لە دەی بـــەهمەنا بـــوو، ئـــەئەو پـــادشا
کـە بـەردی دەخسـتن، لە بـۆ ئـەژدەها
ئە ئـەو بـەردە کـەوتن لە بـەردێکی دی
لەویـــدا بـــوو پـرشنگ لە ئـاور پـەڕی
لەوێ ئـــاوری گــرت گــەلێ گـیا و گـژ[٢]
کەشف بوو بە هووشەنگ ئـاور لەگـژ
لە لای شـــاوە جـــەژنێ لەوێ رۆژ کـرا
لە مـــێژوو بـــە جـــەژنی سـەدەی نـاسرا
لە ئـەو رۆژە تـاکـوو ئـەئەمڕۆ جـیهان
لە ئـــەرز و لە بـەحر و هـەوا و ئـاسمان

---

١ - سەرچاوە: رامانی ٤٦ - لاپەڕەی ٤١
٢ - سەرچاوە: دهخدا ٣ اخبار الطوال

لە ئاور: بە دەستی دەخا سوود و کەڵک
لە هــەر دەرفــەتێکا بـیانبێ خــەڵک

## تەهموورس(٢)

کوڕی ئەم بوو تەهموورسی پاڵەوان
کـتێبی گـەلێ بـاش لە نـێو دژیـەنان
هــەتاکــو بــمێنێ لە بــەینی نـەبەن
کە قازانجی زۆر بێ لە بۆ ئەهلی فەن

## جەمشید(٣)

لە دووی مردنی ئەو بوو جەمشید بە شا
لە مـێژوو دەنـووسرا لە سـەفحەی تـەلاْ
لە سەر تەختێ دانیشت کە جـەمشید شـا
بە نەورۆزە[1] مەشهوور، جەژن بۆی کرا
بە ئـەو ئـاوەدان بـوو سـەراسـەر وڵات
لەوێ فێر بوو خـانوو دروس کـا بـرات

## زەحاک(٤)

لە سەر خـاکـی سـامی، لە غـەربی وڵات
زەحاکی ئەجەل بوو، لە بۆ جەم بوو هات
کــە جــەمشیدی لابــرد، بــە شـا نـاسرا
تــــەواوی وڵاتــــن، لە ئــــاور خــــرا
بە زەبر و بە زەنگ بوو لە مەیدانـی شـەڕ
سپاێکی جەبهەی دەکـرد دەس بـە سـەر
لە مــەغزی سـەرانـی گـەلی کـورد زمـان
غــەزا بــۆ زەحــاکــی لەوی چــاکـران

---

١ ـ سەرچاوە: دهخدا ـ تاریخ ایران از زمان باستان، ترجمه کیخسرو کشاورز ـ دکتر مشکور

# کاوه

بـــەڵام کـــاوەیی کـــورد لەوێ راپـــەڕی
بـــە نـــەعرە و بـــە سامۆ لە نـاحەز خـوڕی
بە هۆی وە کـە دوو کـوڕ لەوێ سـەر بڕان
لە مـــەغزی ســـەری وان بـــە مـاران دران
لە پـاشان کـوڕی دی کـە دەسـبەن کـرا
لە بـــۆ ســـەربڕینێ، لە دیـــوێ خـــرا
لەوێ دەم بــوو کـاوە بـەرەو کـاخی چـوو
هــەتا جــەور و زۆری، بـڵێ روو بـەڕوو
کە دی، (داسه)*، بازووی لە پۆڵای سەخت
لەتوپـەت دە کـاتن، لەوێ تـاج و تـەخت
لەبەروەی بوو دەیگـوت بـڕۆن زووبـەزوو
کـوڕی کـاوە بـەردەن، کـە زیـندانـی بـوو
جگـــەرگۆشەیی خـــۆی لە ئـامێز ئـەخست
بـەرەو خـەڵکە رۆیـی، تـە کـان‌دانـی مست
لە کـــاتێکی کـــاوە کـە دی زوڵـم و جـەور
بـــەری ئـــاسمانی دە گـــرت بــبوە هـــەور
بـــە خـــەڵکی دە گـوت زوو وەرن راپـەڕن
فەرەیدوونی(٥) کوردیش، لە گەڵ خۆ بەرن
بـــەسە، مـــەغزی ئـــێمە، بـــە مـــاران درێ
لە مـــارا چ نـــــەفعە، بـــە ئـــێمەش بـــڕێ
پـــڵینگانی کـــورد بـــوون، لە گـــەڵ کـاوەدا
بـــە هـــەڵمەت دەڕۆیـــین، لە ئـــەو نـاوەدا
ســــەری کـــــەوڵی ئـــاسنگەری دا لە دار
بـــــە دەســـــیۆ دە گـــرتن، لە بـــۆ کـــارزار
بـــەیاخی بـــە دەس گـرت، لە دوورڕۆ هـەرا
بـە گـوڕە و بـە نـەعرەی، زەمـین وەرگـەڕا
بـــەڵێ کـــاوەیی کـــورد، درەفشـی لە دەس
لە پێش شۆڕشۆ بوو، وە کوو شـێری مـەس

## فەرەیدوون(٦)

فەرەیدوون کە کاوەی دەدی دەینەڕان
سپایێ بە دویۆ هەمووی پاڵەوان

فەرەیدوون بەیاخی، بە دەس کاوە دی
لە زاڵبوونی خۆیدا، نەمابۆی بەدی[1]

بەیاخی بە نێوی درەفش کاویان
فەرەیدوونی زانا، ئەوا نێوی نان

درەفشی هەموو کرد، جەواهێر نیشان
بە ئەڵماس و دوڕ و بە یاقووتی کان

لە هەر عەسر و قەرنێ کە شایێ دەهات
درەفشی بە زێڕی، دەکردن خەڵات

لەوێ دەم بەڕێزە، لە لای شا وگەدا
نیشانەی نەترسی، نیشانن دەدا

درەفشم دەڵێ شەڕ، لەگەڵ جەور و زۆر
لە دەسکەوتی زۆرتر دەبینی لە خۆر

لە شانامەدایە فەرەیدوون بە خوێن
لە پێشدادیانە نژادی لەوێن(٧)

لە بۆ تۆڵەسەندن لە زەحاک ئەهات
کە جەمشیدی بابی بە دەس ئەو بوو مات

دژی داسەکێو بوو لە پۆلاٚ ئەوا(٨)
بە نێزەی فەرەیدوون خرایە حەوا

زەحاک لەو شەڕەیدا بە دیلی برا
بە دەس کاوە، خوێنمژ لە زندان خرا

لەوێدا بوو زنجیر لە ئەستۆی خرا
هەتاکێو دەماوەن بە ئەرزا برا

---

١ ـ بەدی: «گومان» و «وەشکەە»، سەرچاوە: ایران در عهد باستان دکتر مشکور.

لەوێـــدا لە تـــاشی ســـەخت پـێچرا
ســتەم بـوو لە دنـیا، کـە جـاڕوو درا
لە پێس شێری نەڕ بوو تەناف چاکرا
دەس و پێی زەحاک بوو بەوەی بەسترا
فەرەیدوون بوو گورزی لەنێو دەست و مست
لە ئـەلوەندی دابێ لە بەحری دەخست
بـەلاّم ویستی داسـە، بـە دیلی گرێ
نـــەبادا بـــە گـورزێ لە چـاڵێ نـرێ
زەحاک بوو قەلاّکەی، لە نێو گیر و دار
لە نـێو کـێوی ئاور دەسووتا دوو مـار
وەکوو شێری زامدار لە نێو جەنگەلاّن
بە هەڵمەت دەڕۆیین، کە قڕ کەن ئەوان
نەجاتی نەبوو کەس لە چنگاڵی مەرگ
لە سەحرا و شاخ و لە نێو باغ و بەرگ
بە هۆی وەی زەحاک بوو ئەسیر بەندکرا
لە گـــوڵزاری شـــادی تـــەپڵ لێدرا
بە نێو جەژنی کوردی لە ئێران زەمین
ئـەوا نـێو بـرا و هـەموو بوون ئەمین
لە نـــەورۆزنامەی حـەکـیمی خـەیام
فەرەیدوونی کورد بوو پڵینگی بە سام
بـە بـازووی پـۆلاّ زەحـاکـی دەبرد
لە نێو کۆت و زنجیر ئەسیری دەکرد(٩)

# مەنووچێهر و ئارەش

کـــوڕانـــی فـــەرەیدوون، کـــەبوون ســـێ بـرا
تـــەواو خـــاکـــی ئـێران بـە ئـیرج درا

هـــەموو ڕۆمـــی دابـــوو بـــە ســـەلمی کـوڕی
لەگـــەڵ دوژمـــنی خـــۆی دەکـــرد مـــلهوڕی

بـــەشێ مـــابوو تـــووران بـــە تـــووران درا
نـــییە ئـــیشتباێ لە بـــۆم ئـــەی بـــرا

بـــە خـــەنجێری ســـەلم و بە شمشیری توور
بـــە نـــامەردی ئـیرج لەخـــوێندا بـــوو سوور

بـــە یـــاری فـــەرەیدوون مـــەنووچێهرە هـات
سزای ئـیرەجی ســـەند لەوێ کـات و سـات

مـــەنووچێهر و لەشکـــر لە ئـــێران زەمـــین
دەڕۆیـــین هـــەموویان پـڵینگی بـە کـین

هـــەتا شـــاهی تـــووران «پەشەنگ» بێتە شەڕ
لە مـــێشکی بـــە ڕم دەن هـــەمووی بێتە دەر

کـــوڕی ئـــەو بـــوو ئـــەفراسیابی نـەبەز
لەگـــەڵ شـــایی ئـێران تـەبای کـرد بـە لەز

ئـــە بـــەم جـــۆرە ســـازش لە بـــەینی ئـەوان
کـــرا گـــەر یـــەکـێ بـێ، لەکـــورد پاڵەوان

بـــەرەو لووتکـــەکـێوی دەمـــاوەندی زەرد
وەکـــوو بـــەرقی بـــڕوا لە ســـەر تـاش و بەرد

لە ســـەر قـولله وێستێ نەکـا وەختی فـەوت
بـــە لەز تـــیر بـــخاتن لە هـــەر کـــوێیە کەوت

ئـــەئەو جـــێگە بـــێ مـــەرز ســنووری ئـەوان
بـــــەوێدا نـــــەیێن و نـــــەڕۆن هـــــیچیان

لەوێـــدا بـــوو «ئـــارەش» کـــەمانگیری کـــورد
بـــە شـــاخا دەڕۆیـی بە چـەکمەی بـوو ورد

کـــــەمانی دەگـــــرتن لە نـــێو دەست و مست
لەوێـــــڕا بـــوو تـــیری لە جـــەیحوونێ خست

